ئەوەبوو بێت کەس هەستی پێ نەکات و نەیناسێتەوە، هاوکات بیریشمە دوو کەسی تری ئێرانیش هەر لە کەلارو لە ماڵی ئێمەی ئەو دەمانەدابوون و هەر ئێرانی بوون بە ناوەکانی غولامەلی و عەینەلییەوە بانگ دەکران ، دیارە ناوی ئەمانەش هەر ناوی خواستراو بوون و تەنانەت هەردووکیشیان کە پیربوون ، هەر لە کەلاری ئەودەمانە دا کۆچی دواییان کردو هەر لەلایەن خەڵکی کەلارەوە لە گۆڕستانی کەلار نێژران ، کەچی دوایی بە هەویەکانی گیرفانیاندا دەرکەوت ، کە ئەوانە ناوی ڕاستیان نەبووە) . هەروەها شێخ محەمەدی شێخ سلێمانی شاکەلی ( ١٩٣٢- ٩/ ١ / ٢٠١٧) . لە بارەی خەسرەوی ڕوزبەوە دەیگێڕایەوە بەوەی : حمە سەعید بەگی جاف بە تەواوی لەوە گەیشتبوو، کە خەسرەوی ڕوزبە کێیە و چ کارە بووە لە وڵاتی ئێراندا ، بۆیە ماوەیەک ناردیە ماڵی ئێمە لە گوندی شاکەل، هەم وەک خۆشاردنەوە و هەندێک جاریش بەناوی ئیشکردنەوە ، بۆ ئەوەی نەگیرێ و توش نەبێت بۆ نموونە: لەو دەمانەی لە گوندی شاکەلدا بوو بیرێکی ئاوی بۆ ئێمە هەڵکەند و تەنانەت تەبیعەتێکیشی هەبوو ، هەندێک خواردن حەزی لێ نەبوایە نەی دەخوارد بۆ نموونە حەزی لە قەیسی نەبوو ، جگە لەوەش بەزمان و قسەکردن و هەڵسوکەوتیا دیاربوو ، کەسێکی ئاسایی نیەو ئەمەشم لە کاتێکدا بۆدەرکەوت ڕۆژێک هەرچی هەویەو ئەوراقی گیرفانی هەبوو بە سودفە لێی کەوتبوون ، کەسەیرم کرد لێی نووسرابوو خەسرەوی ڕوزبە . لەلایەکی تریشەوەو بەپێی بەڵگەنامەیەکی بڵاونەکراوەی ئێرانی پەهلەوی بەتایبەتی ( شهربانی کل کشور )ەوە هەرلەم دەمانەدا کە خەسرەوی روزبە پەنای هێناوەتە بەر ناوچەی گەرمیان و کەلار پێنج ئەندامی تری سەر بەحیزبی تودەش کە بەهەمان شێوە لە سنووری ئێرانەوە پەڕیونەتەوە عێراق و ناوچە کورنشینەکانی شاری خانەقینەوەو لەلایەن کار بەدەستان و فەرمانڕەوایانی حکومەتی عێراقەوە گیراون و لە ڕێگای سنووریی شاری قەسری شیرینەوە ڕادەستی پۆلیس و دامودەزگا ئەمنیەکانی ئێرانی پەهلەوی کراونەتەوە ، کە بەسەریەکەوە بریتی بوون لە پێنج ئەندامانی دیاری حیزبی تودەی وەک: (( عەباسی سولەیمانی ، عەبدولسەمەدی موڕادی ، عەبدولئەمیری فیعلی و عەلی فەرەجی و لە ویشەوە ڕادەستی لەشکری ( ١٢) ی شاری کرماشان کراونەتەوە )) . هەر دوابەدوای ئەوانەش پۆلیسی سەر سنووری کرماشان ژمارەیەکی تری ئەندامانی حیزبی تودەی، کە لە بەڵگەنامەیەکی بڵاو نەکراوەی تری نهێنی ئێرانی دا هاتووە وپاسەوانی سنوور( مرزبانی )ی هەردوو شاری قەسری شیرین و ئیلام ڕادەستی دەزگا ئەمنیەکانی شاری کرماشانیان کردوونەتەوە و لە ویشەوە بەهەمان شێوە دراونەتە دەستی لەشکری ( ١٢) ی شاری کرماشانەوە ، بەڵام بەڵگەنامەکە زۆر بە ڕوونی باس لەوەش دەکات ، کەئەمانە لەکاتی گرتنیاندا شوناسنامەکانیان لەناوبردووە . بەڵام نووسەری ناسراوخەسرەو جافی کوڕی محەمەد سەعید بەگی جاف ( ١٩٤٥) لە بارەی ئەو دەمانەی ژیان و سەربردەی خەسرەوی ڕوزبەی گەورە بەرپرسی

حیزبی تودەی ئێرانیەوە و شێوازی ژیانی لە کەلاری ئەوسەروبەندەدا بەرچاو ڕوونیەکی زیاترمان ئەداتە دەستەوە ، بەوەی ئەوکوڕی گەورەی محەمەد سەعید بەگی جافەو هاوکات خەسرەوی ڕوزبەش لە ماوەی خۆحەشاردان و ژیانی پەناهەندەیدا، لە گەرمیان و لە کەلارلە ڕێگای ڕێکخستنەکانی ئەوکاتەی حیزبی شیوعی عێراقیەوە لە ناوچەی گەرمیان ، سپێردراوەتە ماڵی ئەوان و تەنها باوکی ئەویش بە پێی شەهادەتی هەموو بەگزادەکانی جاف بەنهێنی و سەربردەی خەسرەوی ڕوزبەی زانیووە ، تەنانەت خۆشی لەم بارەیەوە دەنووسێت : ( پەیوەندی و هاوکاری نێوان حیزبی شیوعی عێراقی و حیزبی شیوعی ئێرانی ( تودە) لە زۆر بواردا بەردەوام بوو، چ لە ڕووی پارازتن و شاردنەوەو داڵدەدانی ئەندامە ئاشکرا بوەکان یان لە ڕووی چۆنیەتی سیستەمی ململانێ و هەروەها بە شێوەیەکی گشتی تەقەلای هوشیار کردنەوەو زانستی مارکسیەت و هەروەها تێکڕای ڕۆشنبیری ، ئەڵبەتە بۆ سەلماندنی ئەو جۆرە هاوکاریانە بەڵگەو دیکۆمینت زۆر بە دەستەوەیە ، یەکێک لەوانە داستانی ئەندامی لیژنەی مەرکەزی حیزبی ( تودە)ی ئێرانی خەسرەوی ڕوزبە یە. خوالێخۆشبووی باوکم ( حەمە سەعید بەگی جاف) کەسایەتیەکی ڕۆشنبیری ئەو قۆناغەی بووە و لە ناو ڕۆشنبیرانی کورد و عارەب و عەجەمدا بەو شێوەیە ناسراو بووە و پەیوەستە چەندین کەسی تێکۆشەری دژ بە دەسەڵات و حکومەتی پاشایەتی لە ماڵەکەیدا شاراونەتەوە و داڵدەدراون ) .

چا هەروەک خەسرەو جاف جەختی لەسەردەکاتەوە ، باوکی ئەو تا ئەوکاتە وەک ئەندام لە ڕیزەکانی حیزبی شیوعی عێراقیدا نەبووەو کاری نەکردووە ، بەڵکو ئەو کەسایەتیی و ڕووناکبیرێکی سەر بە ڕێکخراوە بەرهەڵستکارەکان بووە و هاوکات لایەنگیری هەموو بیرو بۆ چوونێکی ئازادیخواز بووە ، کە دژی ستەم و زۆرداری و بیری عەسکەرتاری جەنگابێت و خەباتی کردبێت ، هاوکات بە حوکمی ئەوەی ئەو لە خانەوادەیەکی ناسراو و دەستڕۆیشتووی ئەوکاتەی کۆمەڵگای کوردەوارییی بووە لە باشووری کوردستان و بەتایبەتی لە ناوچەی گەرمیاندا ، هەروەها لەلایەن دەسەڵات و حوکمی پاشایەتیی ئەوکاتەشەوە ئەوان مامەڵەی تایبەتیان لەگەڵدا کراوەو نفوزێکی جەماوەریی گەورەیان لە عێراق و تەواوی ناوچەکەدا هەبووە ، بۆیە هەرکەسێک و بە هەر شێوازێک بوو بێت و پەنای بۆ هێنابێتن ، ئەوان وەک نەریتێکی کوردەوارییانەو خانەوادەو دەسەڵاتیان پەنای زۆرێک لە کەسایەتیی و لە خەڵکانی لەو بابەتەیان داوە ، هەرچەندە بیروڕایەکی چەپگەرای کەسایەتیەکیی وەک ( خەسرەوی ڕوزبە)ی ئەوکاتەو تەنانەت حیزبێکی سیاسی وەک شیوعی عێراقی و تودەی ئێرانی ئەو ڕۆژگارە بە ئاسانی لەگەڵ بیرکردنەوەی بنەماڵەو خانەوادەیەکی ئەوتۆدا نەهاتۆتەوە ، بەڵام وەکتر کەسایەتیەکیی وەک موکەڕەم تاڵەبانی و شێخ عەتای برای کە دوو ئەندامی دیاری حیزبی شیوعی عێراقی ئەو دەمانە بوون و هاوکات لەودەمانەشدا بەتایبەتی موکەڕەم تاڵەبانی وەکو خۆی ئەڵێت :

ئەو لە زینداندا و شێخ عەتای برای  لە ژێر چاودێریدا بووە ، بەڵام محەمەد سەعید جافیان لە نزیکەوە ناسیووە و هاوکات بە ڕووی تواناو هەڵوێستی بنەماڵەکەشیاندا پەرمیونەتەوە بۆ ڕاسپاردەیەکی لەو بابەتە ، لەلایەکی دیکەشەوە ئەوان خۆیان وەکو دکتۆر موکەڕەمیش بەڕوونی و ڕاشکاوانە جەختی لە سەردەکاتەوە  نەیانتوانیوە ئەو ئەرکە لە ئەستۆ بگرن و پەنایەک بۆ خەسرەوی ڕوزبە بدۆزنەوە ، کە بە تەواوی دەستەبەری ژیان و ڕۆحی  بکات و بیپارێزێت  . بە جۆرێک پلانی کارەکەشیان بە شێوازێک دارشتۆتەوە کە کەم کەس بە ئاسانی بتوانێت هەستی پێ بکات و ببێتە مایەی ئاشکرابوونی . چونکە وەک خەسرەو جاف ئەڵێت و تەنانەت موکەڕەم تاڵەبانیش پشتگیری تەواوی  ڕاکەی دەکات : ( خەسرەوی ڕوزبە لە ماڵی ئەواندا وەک کرێکارێک قورکاری کردووەو بە ناوی خواستراوی:( عەلی تورکە )ەوە و نزیکەی دووساڵ ...  بەو شێوەیە بەردەوام بووە ) و هاوکات:( هاوینان لە ژێر سێبەری دارتووەکەی ناو حەوشەیدا،  دوای قورکاری نیوەڕوان چای دەکرد و هەنوزێکی دەکرد. بەندە منداڵ بووم ، ساڵ وابزانم ( ١٩٥٢) یان (  ١٩٥٣) بوو ، دروست لەیادم نییە .. لە بیرمە دەڕۆیشتمە ژووری زەخیرەوەو بە دزیەوە گیرفانەکانم  پڕدەکرد لە شەکر و چاو دەمبرد بۆ عەلی تورکە )، هەروەها خەسرەو جاف لە بەشێکی تری دەستنووسەکەیدا باس لەوە دەکات ، لەو دەمانەیدا کە خەسرەو ڕوزبەی گەورە بەرپرسی حیزبی تودەی ئێرانی لە کەلار داو لەماڵی ئەواندا بووە . هاوکات ئەوەش لای زۆرێک لە ڕووناکبیرانی کوردی باشووری کوردستان  و بەتایبەتی تەوەری گەرمیان ڕوونە کە حەمە سەعید بەگی باوکی ئەو وەک : نووسەرو وەرگێڕو ڕووناکبیرێکی ناسراوی کورد تا ئەودەمانەی ئێمە باسی لێوە دەکەین دەیان نووسینی جۆر بە جۆری لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکانی ئەودەمانەیدا بڵاوکردبووەوە هەر لە: گۆڤاری گەلاوێژ ( ١٩٣٩ – ١٩٤٩، گۆڤاری دەنگی گێتی تازە ( ١٩٤٣– ١٩٤٧) ، گۆڤاری هەتاو ( ١٩٥٤– ١٩٦٠) دواتریش گۆڤاری  هیوا کە: ( یانەی سەرکەوتنی کوردان ) لەشاری بەغدا بڵاوی دەکردەوە، شان بەشانی هەموو ئەوانەش خاوەنی نامەخانەو کتێبخانەیەکی گەورەو دەوڵەمەند بووە لەم ناوچەیەدا ، لەلایەکی دیکەشەوە ڕەنگە دامو دەزگا ئەمنییەکانی حکومەتی عێراق لەسەردەمی پاشایەتیدا بە خۆشیان سۆسەیەکی ئەوتۆیان کردبێت کە کەسایەتیەکی ئەوتۆ لە کەلار دایە ، تەنانەت دکتۆر موکەڕەمیش ئەڵێت :( لەو ماوەیەدا هەرچەندە من لە سجندا بووم بەڵام ئاگادار بووین کە حمە سەعید بەگ کەوتبووە ژێر چاودێری پۆلیسەوە و کاتێک ماڵە کەشیان پشکنی بوو و حمە سەعید بەگ لە ماڵەوە نەبوو بوو عەلی تورکە هەموو کتێبە چەپ و ماکسیەکانی لە ماوەی چەند دەقیقەیەکدا شارد بووەوە ) . هەروەها چاودێری کردنی وردو دەستگیرکردنی خەسرەوی ڕوزبەش بۆ ئەوان هەروا ئاسان نەبووە، بۆیە مەسەلەی پشکنینی کتێبی چەپگەرایان کردۆتە بیانوو و پاساوێک بۆ بەدوادا چوونی بارودۆخێکی لەو بابەتە . هەروەک وەک لەم بارەیەشەوە

دەنووسێت : ( وەک زۆر کەس ئەوەی زانیوە حەمە سەعید بەگی جاف لە چلەکان و پەنجاکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوودا خاوەنی گەورەترین کتاوخانەی شەخسی بوە لە لیوای کەرکوک و هەروەها سلێمانیش ، داستانی ئەو کتاوخانە کە چەند جار تالانکراوەو کۆڵ بەکۆڵ بووە بۆ خۆی داستانێکی ترە .. هەواڵ گەیشتە ماڵی ئێمە سبەینێ دام و دەزگای تەحقیقاتی جینائی سەر بە: بەهجەت عەتیە (١٩٠٠ – ١٩٥٩ ) ی ئەمنی بەغدا دێن بۆ پشکنینی کیتاوخانەکەی باوکم ، گرفت لەوەی دابوو باوکم لە ماڵ نەبوو کەسێکی وا چاوساق و خۆندەواریش لە کەلاردا نەبوو ئاگاداری کتاوی چەپ گەراو دژ بە دەوڵەت بێت، دایکم ئاشفتەو پەرێشان نەیدەزانی چی بکاو ڕوو لە کوێ بکات ، شەو دای دابوو لە بیرمە ( عەلی تورکە) هاتە دیوانەوە دایکم تورکی بە چاکی دەزانی ڕویکردە دایکم و وتی : نیگەران مەبە من ئەو کتاوانە دەناسم و وەدەریان دێنم دایکم هیچ گرنگی بەقسەکەی ( عەلی تورکە) نەداو وەڵامیشی نەدایەوە ، عەلی تورکەش سوور بوو لەسەرقسەی خۆی و بەدایکمی وت : خانم زەرەرت چییە من ئەو کتاوانە دەناسم ، دایکم بە دوو دڵیەوە هەڵساو یەکێک لە پیاوەکان لۆکسی هەڵگرد و ڕۆیشتنە ناو کیتاوخانەکەی باوکمەوە، لەبیرمە ئەوەندە منال بووم کابرای لۆکس هەڵگر لۆکسەکەی نەختێک بەرز ڕاگردبوو بەندە سەرم نەیدەدا لە بنی لۆکسەکە ، لەماوەی چەند چرکەیەکدا عەلی تورکە کۆمەڵێک کیتاوی لە کیتاوخانەوە دەرهێناو ڕوو بە دایکم : ئیتر هیچ مەترسیەک لەکاردا نییەو هەرکێ دێ بۆ پشکنین با بێت . دایکم هەروا سەرسامانە دەینواڕیە عەلی تورکەیدا کە چەند بە ئاسانی ئەوکارەی ئەنجامدا ڕوویکردە عەلی تورکەو وتی: تۆ کێی ئەو کیتاوانە لە کوێ دەناسی . وتی : خانم من برایەکم هەیە لە ئێران خۆندەواری ئەو جۆرە کیتاوانەیە و منیش زۆر لەو کیتاوانەم بەدەستیەوە دیوە. دایکیشم وتی: عەلی تورکە کار مەدە دەستمانەوە سبەینێ ئەو زرتە زەلامانە دێن ، وتی خانم خۆ من ڕام نەکردووە، ئەگەر سبەینێ یەک دانە کیتاویشیان دۆزیەوە چی لە من دەکەن بیکەن . هەرواش بوو، بە سبەینێی دا دوو سەیارەی سێ موسەلەحەی پۆلیس هاتنە ماڵمان و کیتاوخانەیان پشکنی و یەک دانە کیتاوی یاساغیان نەدۆزیەوە ) .

تەنانەت مێژوو نووسی ئێرانی مەسعودی بەهنودی باس لەوەدەکات بەوەی: ( خەسرەوی ڕوزبە کە بە یەکێک لە باوەڕ پێکراوترین ئەندامی حیزبی تودە دادەنرێت لە ٢٨ی مورداد بەدواوە ژیانێکی مەخفیانەی بەسەر دەبرد هاوکات لە هەوڵی ئەوەشدا بوو کە حیزبی توودە لە لە ناوچوون و هەڵوەشانەوەی تەواو سەرلە نوێ ببوژێنێتەوە ، هەروەها ئەو یەکێک بوو لە وانەشی کەمتر لە هەموو ڕێبەرانی حیزبی توودەی ئێرانی لە هۆڵی ڕۆح و گیانی خۆیدا بوو، لەو پێناوەشدا شەرەف مەندانە ڕوو بە ڕووی مەرگ بووەوە) . ئەوە بوو لەم هەلومەرجە بەدواوە ئیدی خەسرەو ڕوزبە لەوە زیاتر لە ژیانی ئیختیفاو دالدەدانی لە گەرمیان و کەلاردا نا مێنێتەوەو دووبارە دەگەڕێتەوە ولاتی ئێران و لە لایەن دامو دەزگا ئەمنیەکانی ئێران و ساواکی

ئێرانیەوە چاودێری دەکرێ و دەستگیردەکرێت. بەزۆری وەکو وتمان نە خەڵکی کەلاری ئەودەمانەو نە بەشێکی زۆری بەگزادەکانیش نهێنی خەسرەوی ڕوزبەیان نەدەزانی لە محەمەد سەعید بەگی جاف زیاتر هەروەک خەسرەو جاف ڕاشکاوانە لەم بارەیەوە دەنووسێت : ( دوای یەک دوو مانگ کە عەلی تورکە گەڕایەوە ئێران و دەستگیر کرا، دەرکەوت عەلی تورکەی کرێکاری قوڕکاری کەری ماڵی ئێمە ( خەسرەو ڕوزبە)ی گەورە بەرپرسی حیزبی تودەی ئێران بوەو لە لایەن حیزبی شیوعی عێراقەوە نێردراوەتە ماڵی ئێمە و مەرحومی باوکم ئەوەی دەزانی و ئەو حاڵەتەی پارازتبوو ) . بەڵام بەشێکی زۆر لە ئەفسەرانی سەر بە حیزبی تودەی ئێرانی لە کودەتای جەنەراڵ فەزڵلا زاهیدی بەدواوەو بە شێکیان لە وڵات بەرەو ئەورووپاو وڵاتانی دەوروبەر هەڵاتن و بەشێکی تریشیان لەماوەی سێ ساڵدا بەتایبەتی لەوکاتەوە کە ئەفسەری دوورخراوەی ( ستوان خارجی ) وەک ئەبو حەسەنی عەباسی ئەندامی دەستەی جێبە جێکاری سازمانی ئەفسەرانی تودەو نزیکترین کەس و باوەڕپێکراو ترین کەسی خەسرەوی ڕوزبە لە ( ١٢ی ئابی ١٩٥٥)دا، لەشەقامی ( جمال حق )ی شاری تاران و بە ژمارەیەکی یەکجار زۆری بەڵگەنامەو کتێب و شتومەکی نهێنی جۆر بەجۆرەوە دەگیرێ ، دوای ئەشکەنجەدانێکی زۆر و فشارێکی زۆر کە هیچ نهێنیەکی نەدرکان و هاوکات خەسرەوی ڕوزبەش برادەرانی دڵنیا دەکردەوەو پێی دەگوتن : ئەبولحەسەنی عەباسی پۆلایە و وەک کێو بەرگری دەکات ( ابولحسن عباسی فولاد است و چون کوه مقاومت خواهد کرد) . هەر ئەمەش وای لە محەمەد ڕەزاشای پەهلەوی کرد کە بەخۆی بێتەوە سەر خەت و وتبووی یان ئەبێت ئیعتراف بکات یان ئەبێت بمرێت : (( یاحرف بزند یا بمیرد)) ، بە هەموو ئەمانەشدا دوایی زۆرێک لە سەرەداوەکان کەوتنە دەست و زۆربەی زۆریشیان گیران و هەر هەمووشیان لەچوار قۆناغی جیاوازدا تیرباران و لە سێدارەدران . بەجۆرێک خەسرەوی ڕوزبە دوا ئەفسەریان بوو کە بە چەند ساڵێک دوای گەڕانەوەی بۆ وڵاتی ئێران و لە( ٦ی تەمووزی ١٩٥٨)دا ، لە لایەن دەزگائەمنی یەکانی ئێران و لە پرۆسەیەکی سەربازی و لە کۆڵانێکی داخراودا ، دوای بریندارکردنی دەستگیر دەکرێت و پاش تیمارکردنی لە خەستەخانە دەبرێتە زیندانی ( قزل قەڵا ) . بەپێی لێکدانەوەی مێژوو نووسی ناسراوی ئێرانی ئەروەندی ئەبراهیمیان بەتایبەتی لە هەردوو کتێبی : ( اعترافات شکنجە شدگان ) و ( ایران بین پورتین )دا دەنووسێت: خەسرەوی ڕوزبە لە ڕەوش و بارودۆخێدا کە تا ئێستاش بەتەواوی ئاشکرا نیە، پاش دەستگیرکردنی و دوای ئەوەی کە خرایە ژێر لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوەی دەزگا ئەمنیەکانی دەوڵەتەوە هەر لەزیندانی ( قزل قەڵا) و لە( ١١ی ئایاری ١٩٥٩)دا، لەگەڵ ( ٢٥) کەسایەتیی تری ئەو حیزبەدا، پێکەوە گوللە باران کراون و لێرەش بەدواوە واتە لە تیربارانکردنی خەسرەوی ڕوزبە بەدواوە ئەتوانرێت بوترێت ، حیزبی تودەی ئێرانی کۆتایی بە چالاکیەکانی هات . بەڵام یەکێک بوو لەوانەی لەکاتی بەرگری لە خۆ

کردنیدا بەرانبەر بەدادگا ڕەخنەیەکی زۆری لە فەرمانڕەوایەتی پەهلەوی دەگرت و داکۆکیشی لە مافی ڕەوای گەلانی ئێرانی دەکرد بەتایبەتی گەلێکی وەک کورد بۆ نموونە، بەپێی گێڕانەوەی موکەڕەم تاڵەبانی وتوویەتی: ( ئەگەر حکومەتێکی دیموکراتی هەبوایە لە ئێراندا، ئەوا گەلێکی وەک کورد بە مافی ڕەوای خۆی دەگەیشت) . یان لەڕەخنەیەکی تریدا لە محەمەد ڕەزاشای ئێران ئەوەیە کە ئەڵێت : ( من تاوانبار ئەکرێم بە ئیلحاد، بەڵام من ئەڵێم مەسەلەی ئیلحاد هەقی بەوەوە نیە تۆ تودەیی بیت یان نا . بۆ نموونە چەندین کەس هەیە لەڕیزەکانی تودەشدا نین و باوەڕیشیان بە خوا نیە، ئەوەتا کەسێکی وەک محەمەد ڕەزا شا خۆی بە ئاریامیهر دەزانێ و خۆی بە داکۆکی کاری ئیسلام و ڕێبازی شیعەگەری دەزانێت و هەموو ساڵێک برێک یارمەتی و پارە بۆ شوێنە پیرۆزەکان تەرخان دەکات و دەینێرێت و منیش ئینکاری ئەمەیان ناکەم بەڵام فەرموون بابزانین شا سەرچاوەی ئەمەی لە کوێوەیە . هەمووی بریتیە لە ڕسوماتی قومارخانە، مەلاهی ، مەباغی و رایسس و دەیانێرێت بۆ بەڕێوەبردنی شوێنە پیرۆزەکان .
هەرچەندە دەزگا ئەمنیەکانی ئێران لێرەش بەدواوە ، واتە لە بەرپابوونی شۆڕشی ( ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨) بەدواوە لە عێراق تا ڕادەیەکی زۆر کۆتایی بە چالاکیەکانی حیزبی تودە ئەهێنن لە ئێراندا کەچی لەگەڵ ئەوەشداو لەڕێگای هەواڵی کۆنسوڵگەریی و باڵوێخانەکانییەوە بە تایبەتی لە عێراق ، زۆر بەوردی چاودێری چالاکیەکانی ئەندام و کەسایەتیە باڵاکانیان کردووەو هەر هەواڵێکیشیان دەست کەوتبێت بەوردی دەسەڵات و دەزگا ئەمنیەکانی خۆیان لێ ئاگادار کردۆتەوە . هاوکات دوو بەڵگە نامەی تری ئێرانی باس لەوە دەکەن کە چۆن دووکەسایەتیی ناسراوی وەک : نورەدین کیا نوری ( ١٩١٦- ٢٠٠٠) و ڕەزا روستا( ١٩١٢ – ١٩٧٢)ی گەورە بەرپرسانی حیزبی تودە بە شێوازێکی نهێنی هاتۆنەتە وڵاتی عێراقەوەو یەکەمیان بۆ مەسەلەی بەشداریکردن لە خۆپیشاندانەکان و . هەروەها دووەمیشیان چۆن توانیویەتی بەجلی ئەفسەری عێراقییەوەو لە ڕێگای فڕۆکە خانەی نێودەوڵەتی عێراقەوە سەفەری وڵاتی نەرویج بکات .

## ئەنجامگیری

لەدەرئەنجامی ئەم کورتە لێکۆلینەوەی ، کە سەبارەت بە کوردو هێزە بەرهەڵستکارەکانی ئێران و ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی پەهلەوی دا خستمانەتە ڕوو، بەتەواوی ئەوەمان بۆ دەردەخات ، کە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردستان لە هەموو بەشەکانیداو بەتایبەتی لەساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانی بەدواوە ، بەردەوام لە تێکۆشانی سیاسی و خەباتی چەکداری بووە . هەرلە بزوتنەوەکانی: بنەماڵەی شکاک و بە تایبەتی ئیسماعیل ئاغای شکاک

وەتە سمکۆ ( ١٨٧٥- ١٩٣٠) ، سەردار ڕەشیدی ئەردەلانی ، مەحموود خانی دزلّی ، مەحموود خانی کانی سانان ، جەعفەرسوڵتانی هەورامی و تەواوی هەموو ئەو بزوتنەوەو ڕاپەڕینانەی ، کە لەچوارچێوەی بابەتەکەدا ، تارادەیەک ئاماژەمان بۆکردوون، بەجۆرێک بە شێکی زۆر لەم شۆڕش و ڕاپەڕینانە دوای شکست هێنان و تەنگ پێ هەڵچنین و بێ ئومێد بوونیان ، پەنایان هێناوەتە بەر وڵاتی عێراق و بەتایبەتی ناوچەکانی باشووری کوردستان و تائەوکاتەی توانیویانە بۆ ماوەیەک دووبارە خۆیان سازبدەنەوەو بۆ جارێکی دی خەباتی سیاسی و چەکداری خۆیان دەست پێ بکەنەوە، هەموو ئەمانەشی کە دەیلێین : سەبارەت بە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی باشووری کوردستانیش دەتوانرێت بخرێتە هەمان پێوەرەوەو بەهەمان شێوە باسی لێوە بکرێت ، بۆ نموونە کەسایەتیەکی وەک شێخ مەحموودی حەفید لە بەشی باشووری کوردستاندا  زۆر جار واهەڵکەوتووە، دوای شکستهێنانی لە شۆڕش و ڕاپەڕینە چەکداریەکانی دا پە نابەرێتە بەر ڕۆژهەڵاتی کوردستان و ناوچە سنوورییەکانی ئەوبەشەی کوردستان . هەروەها بۆ شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی دواتریش لەوانە: مەلا مستەفای بارزانی ..تاد دەکرێت بەهەمان شێوە لێکدانەوەی پێویستی بۆ بکرێت . هەرچەندە لە کۆی هەموو ئەو پەیماننامە و پەیماننامە سنوورریانەی ، کە لە نێوان عێراق و وڵاتی ئێراندا مۆرکراون و، تەنانەت بەوانەشەوە کە لە ڕۆژگاری فەرمانڕوایەتی دەوڵەتی عوسمانی و بنەماڵە فەرمانڕەواکانی ئێرانی وەک : سەفەوی ، ئەفشاری ، زەندی و قاجاریدا مۆرکرابوون ، چ لە دوورو چ لە نزیکەوە بەشێکی یەکجار زۆر لە بنەماسەرەکیەکانیان ، پەیوەندی یەکانگیریان بە گەلی کوردو بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو ڕادەستکردنەوەی ڕێبەرانی ئەو بزووتنەوە نەیاریانەوەوە هەبووە کە لە ناوچە کوردنشینەکانی هەردوولاوە سەریان هەڵداوە، وەک دەبینی لە ڕۆژگارو سەروبەندی ئەم ڕاپەڕین و شۆڕشانەوە ، کە ئێمە لەچوارچێوەی  ئەم توێژینەوەیەدا  باسمان لێوەکردوون ، ڕێککەتنامەیەکی چوار قۆڵی وەک سەعد ئابادی ساڵی( ١٩٣٧) ، کە لە نێوان هەریەک لە : عێراق ، ئێران ، تورکیاو ئەڤغانستاندا مۆرکرا زۆر بەڕوونی لەچەند بەندێکی سەرەکیدا باس لە هاوکاری و دەسگرۆیی یەکدی دەکەن بۆ سەرکوتکردن و لە نابردنی هێزو ڕاپەڕینە نەیارەکانی یەکتر لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا . هەرچەندە لەم قۆناغەدا، هەریەک لە وڵاتی ئێران و عێراقی پاشایەتی  بەهۆی هەڵگیرسان و بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهانیەوە لەئەیلولی ( ١٩٣٩) داو هاوکات بە هۆی داگیرکردنی زۆرێک لە ناوچەکانی عێراق و ئێرانەوە لەلایەن سوپای هاوپەیمانانەوە ولاوازی دەسەڵاتی سینترالّیەتی ( مەرکەزی ) هەردوولاوە، بەتەواوی بۆیان نەکراوە بنەمانی ئەو ڕێککەوتنامانە مۆربکەن ، جگە لە پێشبڕکێ و دژایەتیان بۆ یەکتر لەبواری تری سیاسی و سەربازی بە تایبەتی کێشەی سنووری دا ، کە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت هەربەردەوامە، هەروەها لەلایەکی تریشەوە ئەو هەستە نەتەوایەتیەشی ، کەلە

نێوەندی کۆمەڵگای کوردییەوە هاتبووەکایەوە، بەتەواویی ڕێگە خۆشکەر بووە بۆ ئەوەی کوردو تەنانەت سەرۆکی خێڵ و بنەماڵە کوردیەکانیش لە ناوچەکوردنشینەکاندا داڵدەی کوردی پارچەکانی یەکدی بدەن و جێگای شیاو بۆ یەکتر بکەوە . تائەوکاتەی دەروازەی تازەو نوێتریان لەبەردەمدا دەکرێتەوە بۆ درێژەدان بەخەبات ، یەکێک لەوانەش بنەماڵەی قەدەم خێرو جیهان خانمە کە چۆن دوای شکست هێنانی ڕاپەڕین و شۆڕشکردنیان پەنایان هێناوەتە نێو هۆزێکی وەک : زڕگۆش و جافەوە لە ناوچەی قزرەبات و خانەقینی ئەوکاتانەدا ، یان هۆزێکی وەک گەڵباخی و وەڵەدبەگییەکانی جافی جوانرۆ کە چۆن هەر لە نێو خێڵ و هۆزەکانی گەرمیاندا بەیاشی پەنادراون و بۆ ماوەیەکی زۆر جێگاوشوێنی نیشتە جێبوونیان بۆ دەستەبەردەکرێت و دەپارێزرێن لە هەرجۆرە دەست درێژیەک ، بەڕادەیەک تێکەڵ بوون و مانەوەیان بە شێوازێک ڕەنگ ئەداتەوە کە بەشێک لەوانە بیر لە گەڕانەوەی دووبارە نەکەنەوەو لەگەڵ دانیشتوان وخەڵکەکەیدا بە تەواوی تێکەڵ ببن و ببنە هاوولاتی ئەم ناوچانە. جگە لە هەموو ئەوانەش کەسایەتیەکی وەک خەسرەوی ڕوزبەی بەرەگەز ئازەری و ئەندامی لیژنەی مەرکەزی حیزبی ( تودە)ی ئێران ، کە لەو دەمانەدا یەکێک بووە لەوانەی فەرمانڕەوایانی عێراقی پاشایەتی و ئێرانی پەهلەوی زۆر بەوردیەوە سۆسەیان کردووەو بەدوایەوە بوون ، کەچی ئەویش هەر لە ناوچەی گەرمیان و کەلاری ئەودەمانەدا داڵدەدراوەو بۆ ماوەی چەند ساڵێکی تەواو بە دەردی میرزا غولام حوسێنی شیرازی واتە مێجەر سۆن (١٨٨١- ١٩٢٣) کە چۆن پەنای بردبووە بەربنەماڵەی جافی هەڵەبجە، ئەمیش بەهەمان شێوازێکی خۆگۆڕانە (متنكر) لەماڵی بەگزادەکانی جافی کەلارو وەک دەگێڕنەوە لەگوندی شاکەلی ئەوکاتەدا خۆی پەنادەداو دواتریش لە نیوەی دووەمی پەنجاکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوودا، کە تائێستاش وەک مەسەلەیەکی زۆر تەمومژاوی ماوەتەوە، هەرچۆنێک بێت ئەگەڕێتەوە ولاتی ئێران و ڕاستەوخۆ لەلایەن دەزگای (ساواک)ی ئێرانیەوە دەستگیر دەکرێت و دوای ئەشکەنجەیەکی زۆرو دادگایکردنی لەساڵی ( ١٩٥٩)دا لەگەڵ چەند کەسایەتیەکی تردا، گوللە باران دەکرێت.

- تێبینی: ئەم نووسینە لە کتێبی : (گەرمیان و ناوچەی خانەقین لەسایەی ولاتانی گەورەو فەرمانڕەوایانی عێراقدا ١٩١٤- ١٩٧٥) ، کە لە نووسینی : پ . ی : ئەحمەد باوەڕە وەرگیراوە.ل ٣٧-٨٠.

# سەرچاوەو پەراوێزەکان :

١- باقر عاقلی، شرح حال رجال سیاسی و نقامی معاصر ایران، ج٢، نشر کفتار،( تهران: ١٣٨٠)،ص ١١٦٧ - ١١٧٩.

- جون لیمبرت ، ایران حرب مع التاریخ ، ترجمه: حسین عبد الزهره مجید ، مرکز الدراسات الایرانیه، جامعه البصره ،( البصره : ١٩٩٢)، ص ١١٣ .

- فرح صابر، رچاشاه بهلوی التگورات السیاسیه فی ایران ١٩١٨- ١٩٣٩، مرکز کوردستان للدرسات الاستراتیجیه ، ( السلیمانیه : ٢٠١٣)، ص ٣٣٦ .

- احمد نقیب زاده ، دولت رچا شاه و نقام ایلی ، تاپیر ساختار دولت قدرت گرای رچاشاه بر قبایل و عشایر ، چاپ اول ، ( تهران : ١٣٧٩) ، ص ١٥٥- ١٦٥، فرح صابر، المصدر السابق ، ص ٣٣٤ – ٣٣٥.

- جون لیمبرت، ایران حرب مع التاریخ ، ص ١١٥ .

- جەعفەر سوڵتانی هەورامی: ساڵی ( ١٨٩٦) لەدایک بووەو بۆخۆی کوڕی حەمە سەعیدسانی یەکەمی هەورامانە لەناو سانەکانی ( لهۆن )دا کەسێکی هەڵکەوتوو بووەو ڕێزێکی زۆری لە خەڵکی ڕۆشنبیرگرتووە. لەهەمان کاتدا هاوچەرخی گەلێک ڕووداوی گەورەی جیهانی و ناوچەکە بووەو لەزۆر بەشیاندا ڕۆڵێکی دیارو بەرچاوی هەبووە ، ماوەیەکیش لەتاو دەسەڵاتدارانی ئێران و بە تایبەتی ڕزاشای پەهلەوی پەنای هێناوەتە بەر ئینگلیزەکان لە وڵاتی عێراق لەدەوروبەری ڕومادی بەپەناهەندەیی ژیاوە و لەساڵی( ١٩٤١)دا کۆچی دوایی کردووە لەهەڵەبجەنێژراوە. ابراهیم حامد الخالدی ، تاریخ وقائع الشهر فی العراق وما جاوره فی مجله لغه العرب البغدادیه، یولیو ١٩١١ - اکتوبر ١٩٣١،( بیروت: ٢٠١٤)، ص ٦٥٧، هادی ڕەشید بەهمەنی، پەیامی هەورامان، چ٢، (سلێمانی : ٢٠٠٣)،ل ١٥٣- ١٦٥.

- حەمەرەشید خانی بانە: کوڕی قادرخانی کوڕی عەبدوڵلا بەگی کوڕی بارام بەگی بانەیە ساڵی( ١٨٩٨) لە گوندی شیوە گوێزانی ناوچەی پێنجوێن لەدایک بووە، قۆناغی منداڵی هەرلەم ناوچەیەدا بەسەربردووە، دوای مردنی ( ئەحمەدی) براگەورەوکۆچکردنی باوکی لەساڵی ( ١٩٢٥) دا بەرپرسیاری دەکەوێتە ئەستۆیەوە. جگە لەوەش چەند جارێک بە ڕووی دەسەڵاتدارانی ئێرانی دا ڕاپەڕیووە وماوەیەک شاری بانە ودەوروبەری خستۆتە ژێردەسەڵاتی خۆیەوە ، چەند ساڵێکش بەئاوارەیی و دەستبەسەری لەعێراقدا ژیاوەو بەشداری لەکۆماری کوردستاندا کردووەو پلەی ( ژنەراڵ )ی سەربازی پێ سپێردراوە لە( ٤ی کانونی یەکەمی ١٩٧٤)دا کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە : کەیوان ئازاد ئەنوەر، حەمەرەشید خانی بانە، وەزارەتی ڕۆشنبیری ( سلێمانی: ٢٠٠١)، ل ٣٩ - ٢٥٢.

- مەحمود خانی دزڵی: لە ساڵی ( ١٨٧٠) دا لەئاوایی دزڵی ناوچەی هەورامانی تەخت لەدایک بووە لەپاش مردنی باوکیەوە کاروباری ناوچەکەی دەکەوێتە دەستەوەو لەئەنجامی تێکۆشان وخەباتی دا

بۆگەلێک شوێنی جیاوازی وەک : هندستان , سنە، قەسری قاجار، هنێدی، رومادی، سلێمانی، کەرکوک و بەغدا دەست بەسەرو دوورخراوەتەوەو پەیوەندیەکی گەورەی لەگەڵ شێخ مەحمودی حەفید و سمکۆی ئاغای شکاک و سەردار رەشید ئەردەڵانی و حەمە رەشید خانی بانەدا هەبووە لە بەهاری ساڵی ١٩٤٦ دا لەکاتی وتوێژدا لەگەڵ ئەفسەرێکی ئێرانی دا لە (کەلی ملە خورد) کە دەکەوێتە سنووری وڵاتی ئێران وعێراقەوە دەرمان خوارد دەکرێ و دوای چەند رۆژێک کۆچی دوایی دەکات. بڕوانە : ابراهیم حامد الخالدی ، تاریخ وقائع الشهر فی العراق وما جاوره ، ص ٦٥٧ ، عومەرمارف بەرزنجی ، مەحمود خانی دزڵی شۆڕش گێڕی ڕۆژهەڵاتی کوردستان ،( سلێمانی : ٢٠٠٠)، ل ٣١ – ٣٦.

– محمد علی سلگانی ، جوغرافیای تاریخی وتاریخ مفصل کرمانشاهان ، ایلات و گوایف کرمانشاهان ، اوچاع اقلیمی ، سیاسی ، اجتماعی و اقتصادی ، جلد دوم وسوم ، چاپ دوم ( تهران : ١٣٨١) ، ص ٢٩٤ .

– دار الکتب والوپائق ، الوحده الوپائقیه ، تعریب کتاب : قائممقام قچاو حلبجه ، السری المرقم س/ ٣١٠ والمؤرخ فی ( ٢١ / ١٢ / ١٩٣١) والموجه الی متصرفیه لواو السلیمانیه ، الموچوع : مجیو گیارات الحکومه الایرانیه الی گویله و موقف الحدود، رقم الوپیقه ٤٢، ص ٥٤.

– محمد توفیق وردی ، الاکراد الفیلیون فی التاریخ ، مگبعه اللواو، ( بغداد : بلا)، ص ٣٣.

– محەمەد سەعید جاف، ئاوارە، ب١، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی،( بەغدا: ١٩٩٧)،ل ١٠١– ١٠٢.

– محمد توفیق وردی، الاکراد الفیلیون فی التاریخ ، ص ٣٣ – ٣٤.

– محمد توفیق وردی ، الاکراد ص ٣٣– ٣٤ ، سۆزان ڕەزا ، شێرەکیژی کورد قەدەم خێر، سیروان ( گۆڤار) ، ژمارە ( ١٥) ، پاییزی ٢٠١٢، ل ٣٦ .

– حسن کریم الجاف، موسوعه تاریخ ایران السیاسی ، من سقوگ الدوله القاجاریه وڤهور رچا شاه الی سقوگ النڤام البهلوی فی عهد محمد رچاشاه وقیام الجمهوریه الاسلامیه الایرانیه ، المجلد الرابع ، الدار العربیه للموسوعات ، ( بیروت : ٢٠٠٨) ، ص ١٢٨، محەمەد سەعید جاف، ئاوارە، ب١، ل ١٩٠ – ١٩٢.

– هۆزی زرگۆش : لە بەشی باشووری کوردستاندا، بەزۆری دەکەونە ناحیەی ( قزرەبات) و دێهاتەکانی زنجیرەچیای حەمرینەوە لەگەڵ دێهاتەکانی ناحیەی (مەندەلی)، جگە لەوە بەشێکی تریان دەکەونە سنووری شارەکانی بەدرەو کوتەوە لەناوەڕستی عێراق و لەڕووی بیروڕای ئاینییەوە بەزۆری موسڵمانی شیعەمەزهەبن و ڕێژەیەکی سونەشیان تێدایە. وێڕای ئەو بەشەیان، کە دەکەونە نێو شاری بەغداوەو زیاتر خۆیان بە هۆزێکی سەربەخۆ دەزانن ، بەڵام بەشێک لەسەرچاوەکان بەڕەسەن وەک تیرەیەکی سەرەکی هۆزی گەورەی کەڵهوڕ باسیان لێوە کردوون . بڕوانە : ولی فولادی منصوری کلهری ، تاریخ سیاسی اجتماعی بزرگ ایل کلهر ، ج٤ ، چ١ ،( کرمانشاه : ١٣٩٣)، ص٢٥٣٣، دیدەنی لەگەڵ دکتۆر حەسەن محەمەد حەسەن، خانەقین ، ( ١٩ / ٣ / ٢٠١٥).

– محەمەد سەعید جاف ، ئاوارە ، ب١ ، ل ١٩٦ .

- حسن كريم الجاف ، المصدر السابق ، المجلد الرابع ، ص ١٢٩ .
- محەمەد سەعید جاف ، ئاوارە، ب١، ل ٢٠٠ .
- علی اکبر وقایع نکارکردستانی، عشائرو ایلات وگوایف کرد،به کوشش محمد روف توکلی،( تهران: ١٣٨٧)،ل ٦٣.
- علی اکبر وقایع نگار کردستانی، مصدر پیشین، ص ٦٤، خالید ئەحمەدی ، بەسەر هاتی فەرمانڕەوایی گەڵواخیەکان ، پێدا چوونەوەوڕێک و پێک کردنی: حەسەن گۆران ، چ١، ( سنه : ٢٧٠٤)،ل ٢٤، ( بەزۆری ئەو دێهات و گوندانەی لە بەشی ڕۆژهەلاتی کوردستاندابەشوێنی نیشته جێ بوونی هۆزی گەڵباخی دادەنرێن ئەمانەن : فەراوا ، خنجێرەی ژوروو ، خنجێرەی خواروو ، ئاڵۆلاخ ، کۆسەو مەر، عەلیاوای دۆڵە ڕەش ، تازاوای دۆڵەڕەش ، تازاوای قازی عەلی ، گێزملی ژوروو ، گێزملی خواروو ، زەرتک ، بەردەسپی، ئافراسیاو ، هاڵەگرەی خواروو ، هاڵەگرەی ژوروو ، ئەحمەد ئاوا ، قوجەر ، کەپەک ، هەزار کانیان ، ناڵەشکێنە، قوزو ولاخ، میشاو ، یەنگی یەخ ، کانی سەی مراد ، مەرەگەر ، قەلاگە ، نەرگەسەڵە ، تەوەکڵان ، دەرەگاوان ، دەوریێشان ، دۆزەغەرە ، کۆڵ ، قەلا ولیانە ، دەرە هەر، دێ بنیاد ، شانشین ، سۆفی بلە ، گۆڕیچە، تەیناڵ ، ئاڵیە مادەن ، دەرەوەزان، دەرەوەزانی هۆبەتوو ، حەسەن قەرە، تەنگباخ ، هەوارە گەرمە، چاولکان وەزیر ، مەیدۆڵ ، گۆڵچیەر ، تەیتاخ ، کێلەکەوو ، کوتک ، یاپەڵ ، شەریفاوا ، نسارە، باخچەڵە، قالوچە ، قەرەگەرە ، باشلاخ ، زەفەراوا ، کەسنەزان ، کانی چەرموو ، قەلا ڕیانە، کەڵەکان ، ئەحمەوە کەڕ، دەرەسپ ، گاوەشەلە ، زەڕینە ، تەورێزر خاتوون، زەڕینەی هەوەتوو ، پاپاڵە ، شاڵی شل ، ئەمیناوا ، قەلا ڕووتەڵە ، گورجی ، شاقەلا ، دەواخ ، بەردە ڕەشە ، ئیبرام ئاوا ، هەرسێ دەرەویانە). بڕوانە: خالید ئەحمەدی ، س . پ ، ل ١٣- ٣٥ .
- خالید ئەحمەدی ، س . پ ، ل ١٣- ٣٥، عبدالحمید حیرت سجادی ، ایلات و عسشایر کردستان ،ل ١٢٢- ١٣٦ ، نڤیسین : دەستنڤیس ، ئێل و ئویجاخێن کوردا ل کوردستانا ئێرانێ ، تویژاندن و وەرگێڕن ژ فارسی ، مەسعود خالد گولی ، ( هەولێر: ٢٠١٠)، ل ٧٧- ٧٨.
- سەید جەعفەر میر نیا، خێڵ و تایەفەکانی عەشایەری کوردی ئێران، ل ٧٤.
- استفانی کرونین، رچا شاه و شکل کیری ایران نوین، ترجمه: مرتچی پاقب فر،ص ٢( تهران: ١٣٩٣)،ل ٣٢٧.
- خالید ئەحمەدی ، س . پ ، ل ١٣٤ — ١٦٥ .
- فرح صابر، رچاشاه بهلوی التگورات السیاسیه فی ایران ١٩١٨- ١٩٣٩، ص ٣٣٦ .
- دکتر علی اصغر زرکر ، تاریخ روابگ سیاسی ایران وانکلیس در دوره رچا شاه، ترجمه : کاوه بیات ، انتشارات معین، ( تهران : ١٣٧٢)، ص ٤٥٤ – ٤٥٥.
- عبدالحمید حیرت سجادی، ایلات و عسشایر کردستان، ص١٤٠.
- احمد نقیب زاده ، دولت رچا شاه و نڤام ایلی، تاپیر ساختار، ص ١٨٩، خالید ئەحمەدی ، س .پ ، ل

.١٦٢
- نەوزادی موهەندیس، هۆزی گەڵباخی لەسەرچاوە مێژووییەکاندا،( سلێمانی: ٢٠١٢)، ل ٦٧، دیدەنی لەگەڵ حەبیبە ئەمین محەمەد، تەمەن ( ٨٥) ساڵ، خەڵکی گوندی ئۆمەربل، کەلار ٢٩/ ٣/ ٢٠١٥.
- دارابەگی داودە: کوڕی محەمەد عەلی کوڕی حەقی بەگی داودەیە، ساڵی (١٨٩١) لەدایک بووە، بەزۆری شوێنی نیشتە جێ بوونی هۆزەکەی دەکەوێتە ناوچەی داقوقی سەربەشاری کەرکوکەوەو لەساڵی ( ١٩٢٤)دا نوێنەری شاری کەرکووک بووە لەئەنجومەنی دامەزراندنی عێراقداو دواتریش لە خولەکانی: ( ١٩٣٥، ١٩٣٩، ١٩٤٢، ١٩٤٣، ١٩٤٧ ، ١٩٤٨)دا بۆ چەند جارێکی دی وەک ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق دەستنیشانکراوەو لەساڵی ١٩٥٦ دا کۆچی دوایی کردووە. جمال بابان ، اعلام الكرد، ج ١،( اربیل : ٢٠١٢) ، ص ٢٠٤ .
- دیدەنی لەگەڵ حاجی محەمەد ئەمینی ئۆمەربلی، تەمەن (٩٠) ساڵ ، کەلار( ٢٩ / ٣ / ٢٠١٥).
- دیدەنی لەگەڵ حاجی سەعید محەمەدی ( ئۆمەربل)ی گەرمیان و تەمەن ( ٩٠) ساڵ ، کەلار( ١٢/ ٣ / ٢٠١٥)

- حاجی قادری مەحموودی شاتری : لەساڵی ( ١٨٩٨) دا، لەناوچەی گەرمیان هاتۆتە دونیاوە، کەسایەتیەکی کۆمەڵایەتی شارەزاو هاوکات قسەڕۆیشتووی نێو تیرەی ( شاتری) سەر بە هۆزی جاف بووە، سەرەتاکانی خوێندنی لەحوجرەو ناوەندە ئایینیەکانەوە دەست پێکردووە، وەک دەگوترێت : جگە لە زمانی کوردی ، عەرەبی و تورکی و تارادەیەک ، زمانی فارسیشی زانیووە، وەک دەشگێڕنەوە لە( شەڕی شوعێبە)ی ساڵی ( ١٩١٥) بەشداری کردووە، دژی داگیرکای ئینگلیز و لەساڵی ( ١٩٦٣)دا ، کاتێک سوپای عێراق هێرشی کردۆتە سەرگوندەکەیان ( ژاڵەی حاجی قادر) ، لەگەڵ خزم و کەس و کارەکەیدا ، بەرگریان لێکردووەو تەنانەت برازایەکی بەناوی ( یەحیا)ەوە شەهید بووە، تائەوکاتەی لە( ٢٥ / ١١/ ١٩٧٨) دا، کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: مستەفا نەریمان ، بیرەوەریەکانی ژیانم ، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی ، ( بەغدا : ١٩٩٤) ، ل ١٢٠، دیدەنی لە گەڵ کاک مستەفای حاجی قادری مەحموودی شاتری (١٩٤٨) ، گەرمیان ، (١ی شوبانی ٢٠٢٠).
- دیدەنی لە گەڵ کاک مستەفای حاجی قادری مەحموودی شاتری (١٩٤٨) ، گەرمیان ، (١ی شوبانی ٢٠٢٠).
- دیدەنی لەگەڵ حەبیبە ئەمین محەمەد، تەمەن ( ٨٥) ساڵ، خەڵکی( ئۆمەربل)، کەلار ٢٩ / ٣ / ٢٠١٥.
- محمد علی سلگانی ، جوغرافیای تاریخی وتاریخ مفصل کرمانشاهان، ایلات و گوایف کرمانشاهان، اوچاع اقلیمی ، سیاسی، اجتماعی و اقتصادی، جلد دوم وسوم ،( تهران: ١٣٨١)، ص ٢٢٩- ٢٣٣.
- محمد علی سلگانی ، مصدرپیشین، جلد دوم وسوم ، ص ٢٢٩.
- ابراهیم خلیل احمد و خلیل علی مراد، ایران و ترکیا دراسه فی تاریخ الحدیپ والمعاصر، وزاره التعلیم العالی و البحپ العلمی ، جامعه الموصل،( الموصل : ١٩٩٢)، ص ١٣٧ .

– شوان گەرمیانی ، شیعرێکی ناتەواو مۆمێکی نیوە تەمەن ، ئاغا شڕەی ئێناخی کێ بوو ، مامۆستای کورد ( گۆڤار)، ژمارە ( ١٤)، سوید ، بەهاری ١٩٩٢،ل ١٧– ١٨ .
– محەمەد سەعید جاف، ئاوارە ، ب١، ل ١٧٩ .
– محمد علی سلگانی، مصدر پیشین ، جلد دوم و سوم ، ص ٢٤٩ .
– هادی رەشید بەهمەنی ، پەیامی هەورامان ، چ٢، ل ١٦٤ .
– ئەحمەد باوەڕ ، دۆزی کورد لەپەیوەندییەکانی نێوان عێراق و ئێراندا ١٩٣٧– ١٩٤٧،( سلێمانی: ٢٠١٠)،ل ٨٦.
– حسن کریم الجاف ، المصدر السابق ، المجلد الرابع ، ص ١٣٢ .
– محمد علی سلگانی، مصدر بیشین، جلد دوم و سوم، ص ٢٤٩ ؛ محەمەد سەعید جاف ، ئاوارە،ب١ ،ل ١٨٠ .
– محەمەد سەعید جاف ، ئاوارە، ب١، ل ١٨٠.
– بۆ تۆمارکردنی ئەو زانیارییانە بە زۆری سوود لە تۆمارو قەید ( سجل)ی یەکەمی قوتابخانەی سەرەتایی کەلاری کۆن وەرگیراوە ، کە لەساڵی خوێندنی ( ١٩٣١ – ١٩٣٢)دا کراوەتەوە .
– محەمەد سەعید جاف ، ئاوارە، ب١، ل ١٨٠، حسن کریم الجاف ، المصدر السابق، المجلد الرابع ، ص ١٣٢.
– ئیرەج ئەسکەندەری : لەساڵی ( ١٩٠٨)دا لەشاری تاران هاتۆتە دونیاوەو قۆناغەکانی خوێندنیشی تیا تەواوکردوە ، دواتریش بەمەبەستی درێژەدان و تەواوکردنی خوێندن چۆتە پاریس و یاسای لەوێ تەواو کردووەو لە ساڵی ( ١٩٣٩)دا ، لە سەر بیری کۆمەنیستی لەگەڵ چەند کەسایەتیەکیی تردا بۆ ماوەی پێنج ساڵ زیندانی کراوەو هەر لەگەڵ دامەزراندنی حیزبی تودەی ئێراندا بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردراوە و لەساڵی ( ١٩٤٧)داو ، لە کابینەکەی قەوام سەڵتەنەدا ، کە حیزبی تودەی ئێرانی تیایدا بەشداری کردووە . کراوەتە وەزیری بازرگانی ، دوای یاساخبوونی تودەش لە وڵات هەڵاتووەو ماوەیەکی زۆر لە سۆڤێت و ئەڵمانیا ژیاوە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە .بڕوانە: باقر عاقلی ، شرح حال رجال سیاسی و نقامی معاصر ایران ، جلد١، ص ١١٩ – ١٢٠.
– یرواند ابراهیمیان ، تاریخ ایران مدرن، ترجمە: محمد ابراهیم فتاحی، چاپ هفتم، ( تهران : ١٣٩١)، ص ٢٠٨.
– جەنەراڵ زاهدی : فەزڵلا زاهیدی ، کە زۆر جاریش بە( بصیر الدیوان) شۆرەت و ناوبانگی ڕۆیشتووە ، لە ساڵی ( ١٨٩٤ ) لە شاری هەمەدان هاتۆتە دونیاوە ، بەزۆری لە بواری سەربازی دا ، کاری کردووەو تەنانەت یەکێک بووە لەو سەرکردە سەربازییانەی سەردەمی محەمەد ڕەزا شای پەهلەوی، کە دژی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا جەنگاوە لەوانە: بزوتنەوەکانی ئیسماعیل ئاغای سمکۆ ، کە لەودەمانەدا ناوەندی بزوتنەوەکەی بەزۆری لە ناوچەی (

چاریە – چهریق) بووە، هەروەها بزوتنەوەی شێخ خەزعەلی میری (موحەمەرە) لەتەوەری باشووری ئێران و ماوەیەکیش کراوە بە بەڕێوەبەری گشتی دەزگای پۆلیس لەتارانی پایتەخت و ماوەیەکیش لەلایەن ئینگلیزەکانەوە دەستگیرکراوەو بۆماوەی دووساڵ دوورخراوەتەوە بۆ فەلەستین ، بەوەی پەیوەندی لەگەڵ ئەڵمانەکاندا هەبووە و دوای گەڕانەوەی هاتۆتەوە تاران و کراوەتە فەرماندەی هێزەکانی ئێرانی لە باشووری وڵات ، هاوکات لە سەردەمی هەردوو حکومەتی حسین عەلاو دکتۆر محەمەد موسەدەقدا ، پۆستی وەزارەتی ناوخۆی ئێرانی خراوەتە ئەستۆوە و لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندی بەدەزگای ناوەندی هەواڵگری ئەمەریکیەوە کردووە ، بەتایبەتی لەوکاتەیدا ، کە کۆتایی بەحکومەتەکەی دکتۆر موسەدەق هێنراوەو لەوەش بەدواوە تا ساڵی ( ١٩٥٦ ) سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیرانی ئێرانی بووەو ماوەیەکیش باڵوێزی وڵاتەکەی بووە لای وڵاتانی ئەوروپا کە بارەگای سەرەکی لەشاری ( جنێڤ)بووە ، تائەوکاتەی لەساڵی ( ١٩٦٥) دا کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە : باقر عاقلی ، شرح حال رجال سیاسی و نڨامی معاصر ایران، ج٢، نشر گفتار، ( تهران : ١٣٨٠) ، ص ٧٥٣– ٧٥٩.

– دکتۆر محەمەد موسەدەق : لەساڵی ( ١٨٨٣)دا لە شاری ( تاران ) هاتۆتە دونیاوەو زیاتر بە ( مصدق السلگنه ) شۆرەت و ناوبانگی ڕۆیشتووە ، بەرەگەز لەبنەماڵەیەکی بەختیاری و میرزا هیدایەتوڵلا خانی بەختیاری باوکی کار بەدەستێکی کۆکردنەوەی بواری ( باج ) بووە لەناوچەی ( خۆراسان) و لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی قاجاریەکاندا ، بەڵام بەزۆری لە ساڵی ( ١٩٠٥– ١٩٠٧) دا ، چۆتە نێو پرۆسەی سیاسییەوەو لەساڵی ( ١٩٠٦) دا ، بووە بەنوێنەری ( ئەسفەهان ) لە پەرلەمانی ئێرانی داو بۆ دواتریش و لە ساڵی ( ١٩٢١)دا ، بووە بەوەزیری دارایی و لە ساڵی ( ١٩٢٣ ) دا ، کراوەتە وەزیری کاروباری دەرەوە و دوای دوورخستنەوەی ڕەزا شای پەهلەوی لە دەسەڵات لەلایەن وڵاتانی هاوپەیمانەوە، لە ساڵی ( ١٩٤٤)دا دووبارە بووە بە ئەندامی پەرلەمان و لێرەش بەدواوە سەرۆکایەتی ( بەرەی نیشتمانی ئێرانی ) کەوتۆتە ئەستۆوە، لە( ٢٨ی نیسانی ١٩٥١)دا ، لەلایەن پەرلەمانی ئێرانییەوە بەزۆرینەی ( ٧٩ ) دەنگ بەرانبەر بە تەنها ( ١٢) دەنگی نەیار ، دکتۆر محەمەد موسەدەق ، بە سەرۆک وەزیرانی ئێرانی هەڵبژێردراوەو هەرلێرەش بەدواوە، دەستی کردووە بەکاری ڕیفۆرم و چاکسازی لە هەموو بوارەکانداو بە چەند ڕۆژێکی دواتریش بڕیاری خۆماڵی کردنی نەوتی ئێرانی ڕاگەیاندووە ، تا ئەوکاتەی بە هاوکاری و بەپێی پلانێکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو بەریتانیا ، کەسێکی سەربازی وەک جنەراڵ زاهیدی لە ڕێکەتی ( ٢٨ مرداد ) واتە لە( ١٩ ی ئابی ١٩٥٣) دا ، کودەتایەکی سەربازییان کردۆتە سەر حکومەتەکەی دکتۆر موسەدەق و دوای تۆپ بارانکردنی ماڵەکەی و دوورخستنەوەی لەدەسەڵات و زیندانی کردنی بۆ ماوەی ( ٣) ساڵ و دواتر لە شاری ( ئەحمەد ئاباد) خراوەتە ژێر چاودێری توندەوە ، تائەوکاتەی لە( ٥ی مارتی ١٩٦٧) داو لەتەمەنی ( ٨٤) ساڵیدا، کۆچی دوایی کردووەو هەر لە( ئەحمەد ئاباد) نێژراوە. بڕوانە: باقر عاقلی، شرح حال رجال سیاسی و نڨامی معاصر ایران ، جلد ٣، ( تهران: ١٣٨٠) ،ص ١٤٥٢ – ١٤٩٠، عبد المنعم عبدالوهاب وئخرون ، جغرافیە النفگ

والگاقه ، مدیریه دار الکتب للگباعه والنشر، جامعه الموصل: ١٩٨١)، ص ٣٤٠ – ٣٤١ .

– فریدون کشاورز ، من متهم می کنم ، کمیته مرکزی حزب توده ایران ، (تهران : ١٣٥٧)، ص١٣.

– موکەڕەم تاڵەبانی : ساڵی ( ١٩٢٣ ) لە شاری کەرکوک لە هاتۆتە دونیاوە ، خوێندنی سەرەتایی ، ناوەندی و دواناوەندی لەشاری کەرکووک تەواو کردووە و دواتر لە کۆلێژی حقوق وەرگیراوەو هەر لە سەردەمی لاوییەوە پەیوەندی کردۆتە ڕێکخراوی ( دارکەر) و ( هیوا)ەوە ، دوای هەڵوەشانەوەی هیوا و لەساڵی (١٩٤٦)ەوە پەیوەندی کردۆتە ڕیزەکانی حیزبی شیوعی عێراقەوەو بە هۆی ئینتمای حیزبیەوە ماوەیەکی زۆر زیندانی کراوە، ماوەیەکیش بەکاری پارێزەری و پاشان بەڕێوەبەری گشتی ئینحساری توتن و ماوەیەکیش وەزیری ئاودێری بووە لەعێراقدا، لە ساڵی ( ١٩٧٩)ەوە لەکاری حیزبی دوورکەوتۆتەوەو لەساڵی ( ١٩٨٧)دا، لە سەرداوای سەدام حوسێنی سەرۆکی پێشووی عێراق و ڕازی بوونی حیزبە کوردییەکان ڕۆڵی نێوان گیری هەبووە لە نێوانیاندا ، ئێستاش لە شاری سلێمانی دادەنیشێت. بڕوانە : مکرم گالبانی، مراحل تگور الحرکه القومیه الکردیه ، المجلد الپانی ، ( السلیمانیه: ٢٠١١ )، ص ٧٨٣- ٧٨٥ .

– شێخ عەتای تاڵەبانی: کوڕی شێخ جەمالی تاڵەبانیە، لەساڵی ( ١٩٢٥) دا لەدایک بووە. قۆناغی سەرەتایی خوێندنی لە شاری کەرکووک تەواو کردووە، بەهۆی مردنی باوکییەوە دەستی لە خوێندن هەڵگرتووەو، ماوەیەک ئەندامی پارتی ( هیوا ) بووە ، لەساڵی ( ١٩٤٧) ەوە پەیوەندی کردووە بەڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی عێراقەوە و لەساڵەکانی ١٩٥٤ و ساڵی ١٩٦٠ بە هۆی چالاکی حیزبییەوە دەستگیرکراوە و لەساڵی ( ١٩٦١) دا دوور خراوەتەوە بۆ بەندیخانەی عیمارە. دواتر لەسەر فەرمان و لێبووردنی عەبدولکەریم قاسم ( ١٩١٤- ١٩٦٣) گەڕاوەتەوە کوردستان و بووە بە بەرپرسی لیژنەی قەزای کفری حیزبی شیوعی عێراقی ، لەساڵی ( ١٩٧٢)ەوە کراوەتە بەڕێوەبەری شارەوانی کفری و هەروەها لە ڕاپەڕینی (١٩٩١) بەدواوە یەکێک بووە لە دامەزرێنەرانی ( کۆمەڵەی هیوای عێراقی ) ، لە ڕێکەوتی ( ٤/ ٥ / ٢٠٠٠). لەشاری سلێمانی کۆچی دوایی کردووە: ینڤر: الشیخ عگا الگالبانی، ژکریات النچال فی کوردستان، ( السلیمانیه : ٢٠١٠) ، الصفحه الاخیره .

( ) – محەمەد سەعید جاف: ساڵی( ١٩٢٥) لە کەلار لەدایک بووە، پلەکانی خوێندنی هەرلەم ناوچەیەوە دەست پێکردووە ، یەکێکە لە خوێندەوارو ڕووناکبیرەکانی سەدەی ڕابردوو، دەیان نووسین و وەرگێڕانی لە گۆڤارو ڕۆژنامە کوردیەکانی وەک : گەلاوێژ، هیوا، هەتاو، ڕوناهی و بەیان دا بڵاو کردۆتەوە ، لەسەردەمی خۆیدا، خاوەنی گەورەترین کتێبخانەی شەخسی بووە لەسنووری لیوای کەرکوکدا و بەرهەمێکی چاپکراوی هەیە، بەناوی ( ئاوارە)ەوە ، ماوەیەکیش لە بواری ڕۆژنامەوانیدا کاری کردووە و لەڕێکەوتی (١٦ی مارتی ١٩٩٦) دا لە بەغدا کۆچی دوایی کردووەو لەگۆڕستانی (مەحموودپاشای جاف) لەشارۆچکەی قزرەبات نێژراوە . بڕوانە: خوسرەو جاف ، پرسە، ئاهەنگی چلەی ماتەمینی خوالێخۆشبوو محەمەد سەعید بەگی جاف ( ٩/ ٥ / ١٩٩٦) ،( بەغدا : ١٩٩٩ )، ل ٦٤- ٧٣، محەمەد فاتح

، پەرەسەندنی ژیانی حیزبایەتی لە کوردستانی باشووردا، ( هەولێر: ٢٠١٤)، ل ٤١٣.

– مكرم الگالبانی ، صدیق السجون و المنافی ، فی ژكری وفاه صدیقی الوفی المرحوم محمد سعید جاف، فی : پرسە، ئاهەنگی چلەی ماتەمینی خوالێخۆشبوو محەمەد سەعید بەگی جاف (٩ / ٥/ ١٩٩٦) ، ئامادەكردنی : خەسرەو جاف، ( بەغدا : ١٩٩٩) ، ل ٣٠.

( ) – محمد علی حسین ، سقوگ حزب توده ، عرچ تحلیلی لتاریخ الحزب الشیوعی الایرانی وانهیاره امام الاسلام ، الگبعه الاولی، ( گهران : ١٩٨٤)، ص ٣١– ٣٢، خسرو روزبه، ازویکی پدیا ، دانشنامه ازاد ، ٨ / ٣ / ٢٠١٥.

( ) – اروند ابراهیمیان، ایران بین پورتین، مرکز البحوپ و المعلومات، الكتب المترجمه،( الموصل : ١٩٨٣)،ص ٥٠٢.

– ئەحمەد قەوام سەڵتەنە: کەسایەتیەکی سیاسی ئێرانی بووە لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی پەهلەویداو بە سەریەکەوە پێج جار پۆستی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی وەرگرتووە، بەتایبەتی لەساڵانی ( ١٩٢١ ، ١٩٢٢ ، ١٩٤٢ ، ١٩٤٧ ، ١٩٥٣) ، بەڕێوی پیر ( الیعلب العجوز ) ناسراوەو لەساڵی ( ١٩٥٥ )دا لەتاران کۆچی دواییی کردووە. بڕوانە: ویکیبیدیا ، تاریخ التسجیل( ٣٠/ ٣/ ٢٠١٥).

– محمد حسین خسرو پناه، سازمان افسران حزب توده ایران ١٣٢٣– ١٣٣٣، موسسه نشر پژوهش شیراز ( تهران : ١٣٧٧)، ص ١١٤، خاگرات ایرج اسکندری ، مؤسسه مگالعات پژوهشهای سیاسی( تهران: ١٣٧٢)،ص ٤٠١.

– محمد حسین خسرو پناه، مصدر پیشین، ص ١١٨.

– مصدر پیشین ، ص ١١٨– ١١٩.

– مكرم الگالبانی ، صدیق السجون و المنافی ، ص ٣٠ .

– عباس بخشی ، خسرو ڕوزبه کیست ؟، ( لە ئەنتەر نێتەوە) وەرگیراوە، ڕۆژی تۆمارکردن ، ( ١٠ / ٣ / ٢٠١٥)، خسرو روزبه، ازویکی پدیا، دانشنامه ازاد ، ٨ / ٣ / ٢٠١٥.

( ) – دار الكتب والوپائق ، الوحده الوپائقیه ، رقم الملف ( ٤٩٥٥ /٣١١ ) ، السفاره العراقیه فی گهران ، التاریخ ( ١٨ / ١٢ / ١٩٥٠ ) ، سری ، وزاره الخارجیه ، بغداد ، الموچوع : التقریریر الاسبوعی عن ایران ، فرار عشره من سجناو حزب توده من سجن گهران ، رقم الوپیقه ( ١٥) ، ص ٣٤.

( ) – دار الكتب والوپائق ، الوحده الوپائقیه، رقم الملف ( ٤٩٦٥ /٣١١)، السفاره العراقیه فی گهران ، التاریخ ( ١٨ / ١٢ / ١٩٥٠)، سری ، وزاره الخارجیه، بغداد ، الموچوع : مواصله نشاگ حزب توده، رقم الوپیقه ( ٧٨)،ص ٢٠٣

( ) – دیدەنی تایبەت لەگەڵ موکەڕەم تاڵەبانی ، سلێمانی ، ( ٢٦ / ٣ / ٢٠١٥).

– مەهدی محەمەد قادر، ڕۆڵی کورد لەبزوتنەوەی ئاشتیخوازان لەعێراقدا ١٩٥٠ – ١٩٦٣،( هەولێر: ٢٠١٥)،ل ٥٤ .

- دیدەنی لەگەڵ ئەمجەد شاکەلی ، شاکەل، ٢٩ / ٤ / ٢٠١٥.
- مكرم الگالبانی ، صديق السجون و المنافی ، فی : پرسه، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٠ .
- ئیقباڵ خانی کچی کەریم بەگی جاف: ساڵی ( ١٩٣٩) لە کەلار لەدایک بووە، سەرەتاکانی خوێندنی هەر لەم شارەوە دەست پێکردووەو وەکو خۆی ئەڵێت : تا پۆلی سێیەمی ناوەندی خوێندووە ، خێزانی سالاربەگی کوڕی داود بەگی جافە کە ئامۆزای خۆیەتی و زمانەکانی کوردی و عەرەبی و فارسی بەباشی دەزانێت، سالار بەگی هاوسەری لەگەڵ هاتنە سەرکاری کۆماری ئیسلامی ئێران و کۆتایی هێنانی فەرمانڕەوایەتی پەهلەویدا، ساڵی( ١٩٧٩)دا ، لەلایەن دەسەڵاتی نوێوە بەوەی کە سەر بەدەسەڵاتی محەمەد ڕەزاشای پەهلەوی بووە لەسێدارەدراوە .
- دیدەنی لە گەڵ ئیقباڵ خانی کەریم بەگی جاف ، کەلار ، ( ١٨ / ٣ / ٢٠١٥ ) .
- شێخ محەمەدی شێخ سلێمانی شاکەلی : لەساڵی ( ١٩٣٢)دا ، لەشاکەلی گەرمیان هاتۆتە دونیاوەو، لە قوتابخانەی کەلاری سەرەتاییەوە دەستی بە خوێندن کردووە ، کەسایەتیەکیی کۆمەڵایەتی خوێندەوار و ناسراوی گەرمیانە ، هاوکات دەبێتە باوکی شاعیر و نووسەری ناسراو فەرهاد شاکەلی و ئەمجەد شاکەلی و لە( ٩ی کانوونی دووەمی ٢٠١٧) دا، هەر لەگوندی شاکەل کۆچی دوایی کردووەو لەگۆڕستانی گوندی( سەیدە) نێژراوە.
- دیدەنی لەگەڵ شێخ محەمەدی شێخ سلێمانی شاکەلی، شاکەل، ( ٢٩ / ٤ / ٢٠١٥) .
( ) - سازمان اسناد ملی ایران ، وزارت کشور، شهربانی کل کشور ، محرمانه، ازگرف رئیس شهربانی کلی کشور : مهندس غفاری ، تاریخ ( ١٨/ ١٢/ ١٣٣٣) ، شماره ( ٣٩٠ / ٩٥٧٤١).
( ) - سازمان اسناد ملی ایران ، وزارت کشور ، شهربانی کل کشور ، محرمانه ، ازگرف رئیس شهربانی کلی کشور : سرهنگ نصیری ، تاریخ ٩/ ١/ ١٣٣٤ ، زماره ٧١١٦٤/ ٥.
( ) - خەسرەو جاف : لە ساڵی ( ١٩٤٥) دا ، لە کەلار لە دایک بووە و هەڵگری بڕوانامەی ماجستێری میعماریە. لە ساڵی ( ١٩٦٣ )ەوە ، بووە بە پێشمەرگەو لەدارمانی حکومەتی بەعس بە دواوە دوو جار بووە بەئەندامی پەرلەمانی عێراق ، تا ئێستاش چەندین گرەوی میعماری نێودەوڵەتی و خەڵاتی ڕۆشنبیری وەرگرتوە و، ( ٦٦) کتێبی چاپکراوی لەبواری جۆر بەجۆردا بڵاوکردۆتەوە. بڕوانە: خوسرەو جاف، مەولاناو ڕازی نەی ،( هەولێر : ٢٠١٤)، ل ٣٩٨.
- دەستنووسێکی تایبەتی خەسرەو جاف کە بۆ مەبەستی نووسینی ئەم لێکۆلینەوەیە بەدەستمان گەیشتووە .
- دیدەنی لەگەڵ موکەڕەم تاڵەبانی، سلێمانی، ( ٢٦ / ٣ / ٢٠١٥) .
- دیدەنی لەگەڵ موکەڕەم تاڵەبانی ، سلێمانی ، ( ٢٦ / ٣ / ٢٠١٥ ) .
- بەهجەت داود عەتیە : لەساڵی ( ١٩٠٠)دا لەشاری بەسرە لە دایک بووەو بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی عێراق بووە . بەپێی ئیرادەیەکی شاهانە لەلایەن شا فەیسەڵی یەکەمەوە نازناوی ( پاشا)ی دراوەتێ و بۆ

یەکەم جارو دوای تەواوکردنی خوێندنی دواناوەندی لەساڵی ( ١٩٢٩)دا ، کراوەتە بەڕێوەبەری پۆلیس و لەساڵی ( ١٩٤٦)ەوە، کراوەتە بەڕێوەبەری بەشی لێکۆڵینەوەی جینائی و بەرپرسی بەدوادا چوونی دۆسیەی شیوعیەکانی عێراق. لە (٢٠ی ئەیلولی ١٩٥٩) دا، بەپێی بڕیارێکی دادگای شۆڕش ، کە فازیل مەهداوی بەڕێوەی بردووە لە سێدارە دراوە . بڕوانە : ویکیبیدیا ، الموسوعە الحرە ، ( ٢٢/ ٣ / ٢٠١٥ ) .

- دەستنووسێکی تایبەتی خەسرەو جاف ، س .پ .

- مسعود بهنود ، از سید چیاو تا بختیار ، چاپ سیزدهم، ( تهران : ١٣٩٠) ، ص ٤٢٨ .

- دەستنووسێکی تایبەتی خەسرەو جاف، س . پ .

- محمد حسین خسرو پناه، مصدر پیشین، ص ٢٠٩ .

- محمد حسین خسرو پناه ، مصدر پیشین ، ص ٢٠٩

- اروند ابراهیمیان ، ایران بین پورتین ، مرکز البحوپ و المعلومات، ص ٥٠٣ ، اروند ابراهیمیان ، اعترافات شکنجه شدگان ، لە ئینتەرنێتەوە وەرگیراوە ، محمد حسین خسرو پناه، سازمان افسران حزب توده ایران ، ص ٢٢٥.

- دیدەنی لەگەڵ موکەڕەم تاڵەبانی، سلێمانی ، ٢٦ / ٣ / ٢٠١٥ .

- دیدەنی لەگەڵ موکەڕەم تاڵەبانی، سلێمانی ، ٢٦ / ٣ / ٢٠١٥.

- سازمان اسناد ملی ایران، نخست وزیر، جناب اقای نخست وزیر، محرمانه، رونوشت برای اگلاع وزارت کشور ارسال میشود ، بتاریخ ( ١٢/٢ / ١٣٣٧)، شماره ( ١٥٢٢٨).

- سازمان اسناد ملی ایران ، وزارت کشور، شهربانی کل کشور، محرمانه، رئیس شهربانی کل کشور. سپهبد علوی مقدم ، بتاریخ ( ١٢/١٤ / ١٣٣٧)، شماره ( ١٥٣٣٥).

- سازمان اسناد ملی ایران، از بغداد، وزارت امور خارجیه: جناب اقای حکمت وزیرمحترم امورخارجیه، بتاریخ ( ٢٩ / ٩/ ١٣٣٧)، شماره ( ١٦٩٢).

# جوگرافیای مێژوویی کەلار و دەوروپشتی بەپێی بەڵگە نوسراوە کۆنەکان



د. ڕافیدە عبدالله

## پێشەکی

دەشتی کەلار بەشێکە لە دەشتێکی پان و فراوان لە دەوروپشتی دۆڵی سیروان, لە خوار زنجیرە چیای قەرەداغ و بەمۆ دەست پێدەکات تا ئەم ڕووبارە چیای حەمرین ئەبڕێت و لەوێوە ئەڕوات تا دەڕژێتە ناو ڕووباری دیجلە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی بەغداد, ئەم دەشتە بەشێکە لە دەشتی حەمرین .

دەشتی کەلار ئەکەوێتە سەر ڕێگای گەورەی خوراسان, کەلەسەرچاوە عەرەبیە ئیسلامییەکان پێی ئەوترێت (گریق خوراسان الکبیر ) کە هەردوو وڵاتی عێراق و ئێران بەیەکەوە ئەبەستێتەوە, لەلایەن شوێنەوار ناسی ئەڵمانی (ئیرنست هرتفیلد ) پێی وتراوە (بوابە اسیا) واتا دەروازەی ئاسیا چونکە بە درێژایی سنووری نێوان هەردوو وڵات بەمەودای هەزار کیلۆمەتر چیای زاگرۆس وەکو دیوارێکی سروشتی وەستاوە بەڕووی جموجۆڵی مرۆیی, و هیچ ڕێگایەکی تر نییە وەکو ئەمە بۆ هاتووچۆ تەنها ٣٠ کیلۆمەتر نەبێت لە دۆڵی ئەڵوەن کە لەبارە بۆ هاتووچۆ بەدرێژایی ساڵ لە نێوان خانەقین - قەسری شیرین ئەم ڕێگایە (گریق خوراسان الکبیر ) لە شاری بابلەوە دەڕۆیشت بەرەو بەغدا و لە بەغدادەوە بۆ گەرمیان - قەسری شیرین - پاتاق - کرماشان - هەمەدان و لەوێوە بۆ خوراسان لە باکوری

ڕۆژهەڵاتی ئێران پاشان بۆ ناوەڕاستی ئاسیا(٢) .

ئەم ناوچەیە , بەهۆی دەوڵەمەندی بەسەرچاوەی خۆراك و ئاو بەدرێژایی ساڵا, لەدێر زەمانەوە شوێنی نیشتەجێبوونی مرۆڤ بووە, بۆیە زۆر دەوڵەمەندە بەپاشماوە شوێنەوارییەکان. لەکتێبی (اگلس المواقع الاپريه ) کە لەلایەن بەڕێوبەرایەتی شوێنەواری عێراقیەوە بڵاوکراوەتەوە لەساڵی ١٩٧٦ , تەنها لە قەزای کەلار ٩٦ شوێنەوار تۆمارکراون, ئەمە تەنها ئەوکاتە, ئیتر نازانین لە داهاتوودا چیترمان بۆ دەردەکەوێت (٣) .

لەڕووی جوگرافییەوە دەشتی کەلار بەشێکەلە ناوچەی گەرمیان, و ناوی گەرمیان ناوی شانشینێکە لەسەردەمی ساسانی دەرکەوت (٢٢٦-٦٣٧ز) و سەر بە ئیمپراتۆرییەتی ساسانی بووە, تاهاتنی ئیسلام, لە دەقەکانی سەردەمی ساسانی پێی ئەوترا بیت گەرمای (Bit – Garmai ) و خەڵکەکەی بە گەرمیانییەکان(٤) .

زۆربەی خەڵکی ناوچەکە پێیان وایە کەلار لە کۆندا لە ئێران بووە, خەڵکەکەی لە سەردەمێك لەسەردەمە کۆنەکان کۆچیان کرد لە ئێرانەوە لە دەورووپشتی زاگرۆس و هاتن بۆ ئەم شوێنە و کەلارێکی تریان دروستکراد .

## کەلار لە سەرچاوە مێخییەکاندا:

لەکۆتاییەکانی سەدەی هەشتەمی پێش زاینیدا, لەساڵی نۆیەمی فەرمانڕەوایەتی پاشای ئاشووری سەرجۆنی دووەم (شاروکین) (٧٢١ - ٧٠٥ پ.ز ) سەرچاوە مێخیەکان باس لە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی سەربازی دەکەن لە چەند شارە دەوڵەتێکی میدی لە ڕۆژهەڵاتی هەرێمی کوردستانی ئەمڕۆ و ناوچەکانی زاگرۆس وەکو ئیلیپی Ellipi و بیت دیاکو Bit – Diaku و کەراللا Karalla کە ڕاپەڕینێکیان بەرپاکردووە دژی فەرمانڕەوای ئاشووری ئاشوور – لیئو Liu – Aššur و لایان بردووە لەسەر تەختی شاهانە و براکەیان خستۆتە شوێنی کە ناوی ئامی – تاشی Ammi – Taši بووە, وا دیارە هەردوو براکە لە ململانێ دا بوون, بەهەرحاڵا, سەرجونی ئاشووری ڕاپەڕینەکەی دامرکاند, ووڵاتی میدیای ڕاماڵی و باس لەسەرکوتکردنی چل و پێنج شاری میدی دەکات و ملکەچکردنیان بۆ دەسەڵاتی ئاشووری و سەپاندنی باج بەسەریاندا هەروەها خستونیەتە چوارچێوەی یەکەیەکی کارگێڕی و کەسێکی بەناوی خولە (Hule) داناوە بەفەرمانڕەوا بەسەریاندا, و کۆمەڵێ دیاری باشی پێبەخشیوە و کچێکی لێ مارەکردووە (لەوانەیە ئاشووری بووبێت, بەڵام دیارنییە , چونکە دەقەکە لێرەدا شکاوە ) (٥) و کردی بەپاشا و شاری هیلاکی (Hilaki ) کردە پایتەختی, بەڵام خولەی گێل (بەپێی دەقەکە ) پاش ماوەیەکی تر, هەڵگەڕایەوە لە ئاشوورییەکان , و چووە پاڵ روسای Rusa(٦) ئوراتی و میتا Mita (٧)پاشای موشکی Muski و پێکەوە هاوپەیمانییەتێکیان دروستکرد لە وڵاتی تابال Tabal (٨) و هیرشیان کردەسەر سنوورەکانی باکووری وڵاتی ئاشوور, بەڵام سەرجۆن

هێرشەکەی تێکشکاند و سنورێکی بۆ وولاتی تابال و فەرمانڕەوایەکی ئاشووری دانا بەسەریدا (٩).
لێرەدا پرسیارێك ڕووبەڕوومان دەبێتەوە: ئایا کەراللا هەر شێوەزارێکی کۆنی کەلارە ؟
لەڕاستیدا وولامێکی یەك لا کەرەوەمان بەدەستەوە نیە دەربارەی ئەم پرسیارە بەلام لەوانەیە توێژینەوە شوێنەوارییەکانی داهاتوو بتوانن وەلامی ئەم پرسیارە بدەنەوە , چونکە دەربارەی شوێنی کەراللا توێژەران پێیان وایە ئەکەوێتە ناوچەی زاگرۆس لە باشووری قزلبوندا, واتا لە نێوان کرماشان و ئورمێ (١٠) .

## ناوە کۆنەکان

دەشتی کەلار و دەوروپشتی لە هەزارەی سێیەمی پێش زاینیدا, بەشێك بووە لە ولاتی خالمان Halman کە پاشتر بووتە یالمان Alman و دواتر لە سەرچاوە عەرەبییەکان پێی وتراوە ( حلوان ) دیارە ناوی ڕووباری ئەلوەن کە لقێکە لە ڕووباری سیروان هەوێنێکی زمانەوانی کۆنی ئەم ناوەی تێدایە .
یەکێك لە ناوە کۆنەکانی تری ئەم ناوچەیە باتیرە Batir , کەلە هەزارەی سێیەمی پێش زاینیدا. لەدەقە نوسراوەکانی (گردی سلێمە) کە ئێستا لە ژێر ئاوی دەریاچەی حەمرینە و لەساڵی ١٩٧٩ دۆزرایەوە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری عێراقییەوە, خوێندرایەوە و دەرکەوت کەوا لە گرێ بەستە ئابوورییەکانی ناوچەکە کار بەپێوەری باتیرکراوە (١١)و پاشان ئەم ناوە بەردەوام بوو لە هەزارەی دووەمی پێش زاینیدا, پاش لێکۆڵینەوە لە دەقە نوسراوەکانی (تل حداد) لە دەشتی حمرین کە ئێستا لە ژێر ئاوی دەریاچەی حەمرینە, دەرکەوت بە گردی حداد لە کۆندا ئەوترا شاری باتیر , هەروەها خواوەند عشتار لەم شوێنەدا پێی دەوترا عشتار - باتیراتۆم Ištar- Batiraum (١٢) . بەپێی بەڵگە نوسراوەکان, هەرێمی باتیر هەموو چەمی سیروانی دەگرتەوە تا سەرچاوەکانی ئەلوەنیش تا دەگەیشتە سەرپێڵ لە کوردستانی ڕۆژهەلات, لەوێ لەسەر شاخی سەرپێلا نەخشەیەکی هەلکەندراوی پاشای لولویی ئانو - بانینی Anu – Banini هەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی هەزارەی دووەمی پێش زاینی, نووسینێکی پێوەیە ئەڵێت :
((ئانوبانینی .. پاشای لولوپوم پاشای بەهێز پشت بە خواوەند عشتار لەسەر شاخی باتیر ئەم کارەم کرد )) (١٣) . واتا سنووری باتیر زۆر فراوانە , هەموو دۆڵی سیروان و ئەلوەنی گرتوەتەوە , جوگرافی ناسی کورد کەریم زەند ئاماژە بە کوردستانی عێراق دەکات بەشێوەی باتیرۆ و کاتێك پرسیارمان لێ کرد دەربارەی ئەم ناوە فەرمووی لە با و باپیرانمان بیستوومانە (١٤)
هەروەها سەرچاوە مێخیەکان لە هەزارەی سێیەمی پێش زاینیدا باس لە شارێك دەکەن بەناوی ئاوال Awal یان Ammali یان Ammale ( ئامالە) کە دەقە ئابوورییەکانی ناوچەی دیالی لە تل اسمر وتل خفاجی دەرکەوتوون (١٥) و لە دەقە ئابوورییەکانی (تل سلێمە ) . خەڵکی کەلار جاران

بەگەڕەکی بنگردیان دەووت ئامالە , هەروەها تیرەیەك هەیە لە خێڵی جاف پێیان ئەوترێت ئامالە , ئەمانە لەکاتی شەڕی عوسمانی – صەفەوی هەندێکیان کۆچیان کرد بەرەو دەشتی شارەزوور لە سلێمانی و گوندێکیان بنیادنا بەناوی (عەمەڵە ) و ئێستا لەوێن . (١٦)

لە هەزارەی یەکەمی پێش زاینیدا لەسەردەمی پاشای ئاشووری ئاشوور ناصر – بالی دووەم Aššur – Nasir – pal II (٨٨٣ – ٨٥٨ پ.ز) باس لە هاوپەیمانی ئەمیکا Amika پاشای ئەمالی Ammali دژی دەسەڵاتی ئاشووری دەکات, بەڵام لە کۆتاییدا سەرکەوتن بۆ پاشای ئاشووری بو:

( بەدرێژایی شەو تا بەرەبەیان بەردەوام بووم لە ڕۆیشتن, لە ڕووباری تورنات پەڕیمەوە, لەگەڵا گزنگی بەیان گەیشتمە نزیك ئەممالی Ammali شارە قایمکراوەکەی ئەراشتو Araštu , و پاش شەڕێکی قورس بەچەك, شارەکەم گەمارۆدا و داگیرم کرد و ٨٠٠کەسم لەجەنگاوەرەکانیان کوشت ) . (١٧)

دیارە ڕووباری تورنات بەڕووباری سیروان وتراوە تورنات Turnat (١٨) و لە هەزارەی سێیەمی پ.ز پێی ووتراوە دورول , کە بەشێکەلە ناوی دوا پاشای ئەکەدی شو – دورول (١٩) پاشان بووتە میتوران, و پاشان بەتورنات .

شوێنێکی تر لە ناوچەکانی دەوروپشتی کەلار هاتووە لەسەرچاوە مێخیەکان خارخارە Harhar کە لە هەزارەی سێیەمی پێش زایینی لەسەردەمی بنەماڵەی ئوری سێیەم (٢١١ – ٢٠٠٤ پ.ز) ناوی دێت بە شێوەی کارخار Karhar یان کاداخار Kadahar . (٢٠)

پاشاکانی بنەماڵەی ئوری سێیەم شولگی šulgi (٢٠٩٤ – ٢٠٤٧ پ. ز ) و ئەمارسین Amar – sin (٢٠٤٦ – ٢٠٣٨پ.ز) و شوسین šu – sin ( ٢٠٣٧ – ٢٠٢٩پ.ز) باسیان لێوە کردووە, دیارە شولگی لە بیست و چوارەم ساڵی فەرمانڕەوایەتییەکەی هێرشی کردۆتەسەر ناوچەکانی باکوور, و دۆڵی سیروان دەستی پێکردووە و هێرشی کردۆتە سەر کارخار و لەساڵی ٢٥-٢٦ بۆ سەر سیمورم Simurrm . و لەساڵی ٣١ بۆ جارێکی تر هێرشی کردۆتە سەر کارخار و لەساڵی ٤٥ بۆسەر ئوربیلوم و سیمورم و لولوپوم و کارخار (٢١) . کاتێك جێنشینەکەی ئەمارسین هاتە سەر تەخت ناوچەی گەرمیان لەوکاتەدا ڕاستەوخۆ لەژێر کۆنترۆڵی بنەماڵەی ئوری سێیەمدا بوو. و حاکمی سەربازی بەڕێوەی دەبرد (٢٢) .

یەکێك لە فەرمانڕەواکانی ناوچەکە لە ژێر سایەی دەسەڵاتی بنەماڵەی ئوری سێیەم ئەردامو یان ئەرادمو Ardamu Aradmu بوو پەیامنێری پاشا شولگی لە وڵاتی سورباتو کە لەسەردەمی شوسین هەمان ڕۆڵی دەبینی. و لەسەردەمی شوسین بەدواوە بالانسی هێز لە ناوچەکە دا گۆڕا, و وردە وردە ئیمپراتۆریەتەکە بەرەرو پووکانەوە دەڕۆیشت و هەریمەکان جیادەبوونەوە(٢٣) .

و لەسەردەمی دواپاشای بنەماڵە ئیبی – سین sin Ibbi- ( ٢٠٢٨-٢٠٠٤پ.ز) خورییەکان پەلیان هاویشت بەرەو کێوی حەمرین(٢٤) , و سەرچاوەکان باس لە گەمارۆدانی مارتووەکان دەکەن

لەلایەن سوپای سومەرییەوە بەسەرکردایەتی شارروم - بانی šarrum - bani بەڵام خەڵکی سیمورم simurrum فریای دۆخەکە کەوتن و یارمەتی مارتووەکانیان دا (٢٥) .

لە هەزارەی یەکەمی پێش زاییندا, لە حەوتەم ساڵی سەردەمی فەرمانڕەوایەتی سەرجۆنی دووەمی ئاشووری (٧٢٢-٧٠٥ پ.ز) سەر لەنوێ ناوی خارخار دێت, کاتێك پاشای ناوبراو باس لە یەکخستنەوەی دانیشتوانی ڕووبارەکانی باکوور و باشوور دەکات (کە لەوانەیە سەرچاوەکانی دیجلە و فورات و هەردوو زێکە و ڕووباری سیروان بکات ) و نیشتەجێ کردنیان لە ناوچەی خارخار کە توێژەران پێیان وایە ئەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری سیروان (٢٥) . هەرچەندە قوڵنگی تەنقیب هێشتا شاری خارخاری نەدۆزییەتەوە بەڵام لەوانەیە گوندی خوڕخوڕ کە ئەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی سیروان بەرامبەر باوەنوور هەوێنێکی زمانەوانی کۆنی هەڵگرتبێت .

## دەربەندی بێلولە:

نەخشەیەکی هەڵکەندراو لەم دەربەندە هەیە, دیمەنی سەکەوتن دەخاتە ڕوو, هاوشێوەی میلەکەی نەرام سینە کە وا لە مۆزەخانەی لۆڤەر لە پاریس. کەسی سەرەکی ئەم دیمەنە جەنگاوەرێکە لە حاڵەتی سەرکەوتندایە پێی خستۆتە سەر دوژمنەکەی و دیلێکی باڵبەست کراو لەبەردەمیدایە. لەپشت ئەم دیمەنە شوێنێك هەیە نووسینی تێدایە کە ئاماژە بەناوی دەکات بەشێوەی تاردونی Tarduni یان لیشیر - بیر -ئانی Lišir –Bir-Anni بەبێ هیچ نازناوێك کە باس لە پلەوپایەی بکات . بەڵام لێکدانەوەیەکی زمانەوانی بۆ ووشەی بێلولە, وادەردەکەوێت لە زاراوەی بێل - لولو bel – lullu وە هاتبێت کە واتای گەورەی لولوییەکان دێت . (٢٦) .

هەندێك لە توێژەران پێیان وایە ئەم نەخشەیە ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەکەدی یان هەزارەی سێیەم بەگشتی بەبیانووی ئەوەی دیمەنەکە هاوشێوەی دیمەنی میلی سەرکەوتنی نەرام سینە, و هەندێکی تریش پێیان وایە ئەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی دووەمی پێش زایینی بەبەڵگەی کڵاوەکەی و ملوانکەکەی ملی ...... و لە هەموو حاڵەتێك ئەم نەخشەیە پەیوەستە بە قەوارەیەکی دیاریکراو کە هێشتا پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە ...

## لیستی سەرچاوەکان

١- (اگلس المواقع الاپریه ). منشورات المؤسسه العامه للاپار والتراپ . بغداد ١٩٧٦ .

٢- احمد کامل محمد. دراسات فی نصوص مسماریه غیر منشوره من منگقه دیالی. حوچ حمرین. تل حداد. رساله ماجستیر جامعه بغداد ١٩٨٥.

٣- رافدە عبداللە عبدالصمد. بەسەرهاتە مێژووییەکانی ناوچەی گەرمەسێر. گۆڤاری هەزارمێرد

ژماره (٤) ساڵی حەوتەم ٢٠٠٤ ل ٤٥-٥٠ .
٤- رافده عبدالله عبد الصمد القرداغی. کردستان العراق فی التاريخ القديم فی چوو النصوص المسماريه من اقدم العصور حتی سقوگ نینوی ٦١٢ ق. م . اگروحه دكتوراه غير منشوره. جامعه السليمانيه . ٢٠٠٨ .
٥- شاكر خصباك. العراق الشمالی. دراسه لنواحيه الگبيعيه و البشريه. بغداد (١٩٧٣).
٦- فوزی رشيد. اقدم الكتابات المسماريه المكتشفه فی حوچ حمرين. منشورات المؤسسه العامه للاپار و التراپ .بغداد (١٩٨٣).
٧- هاری ساكز. قوه اشور. ترجمه عامر سليمان. مگبعه المجمع العلمی. بغداد ١٩٩٩.

## سەرچاوە بیانییەکان

. Bahzad Mofidi Nasrabadi ; Beobachtungen zurn Felreief Anubanini . wed , cite -
٧٤ Frayne , D , «The Early Daynastic List of Geographical Names « AOS VOL -
(١٩٩٢)
. (١٩٧١ ) . Cambridge ٢ B.C .CAH . part ١٨٠٠ – ٢١٢٠ Gadd. C.J.»Babylonia -
. (١٩٨٧) . Grayson , A. K . , «Assyrian Rulers of Early first Millennium , , Toronto -
Kozad . M . A. The Northern Transtigris in the first half of the second milliennium -
٢٠٠٣ B.C.Leiden
. » Levine ; L. , «Sargon eighth Compaighn-
, ١١.Levine ; L. , «Geographical Studies in the New Assyrian Zagros « IRAN voL-
١٩٧٣
. Chicago . ٢ .Luckenbell , D.D, Ancient Records of Assyria and Babylonia . voL -
١٩٦٢
Michalowoski , «The Earliest Hurrians toponomy Anew sargonic inscription . -
.(١٩٨٦) voL ٧٦ .ZA
. ٢٠٠٢ Parpola . S . and porter .» The Helsinki Atlas» Finland -
.١٩٨٣ Pords o . skjaerv . The Sassanian inscription of paikuli . Wiesbaden -



# دانیشتوانی شاری کەلار و ئیمارەتی گۆران

**نیعمەت زەحمەتکێش/ تاران**

لە کۆندا دوو وشە تێکەڵاوی ژیانی کوردانی گەرمیان بووە بە نیوەی وشەکانی ئێلاخ و گەرمەسێر یان ئیلاخ و قشلاخ، بەشی هەرەزۆری دانیشتوانی کەلار لە سەدەی ڕابردوودا ئێلاخ و قشلاخیان کردووە، پاییز و زستانیان لە دەشتی شێروانە و بنکوورە لە قشلاخی گەرمەسێرانەی خۆیان ژیاون، بەهار و هاوین کۆچیان کردووە بۆ کێوەکانی چوارقوڵڵەی داڵەهۆ، بەداخەوە لەگەڵ دیاریکردنی ئەو سنوورە دەسکردانە لەنێوان کوردان لە ساڵی ١٩١٤دا، ئەو دابڕانە هەست هەژێننانە هاتە ئاراوە.

زۆر لە کوردانی گەرمەسێر لە گەرمیانی خۆیان وەکو قشلاخ مانەوە و هەروەها هەندێکیانیش لەکێو و پێدەشتەکانی چوارقوڵڵەی داڵەهۆ لەناو ئێلاخ نیشتەجێبوونە، ئەو ئێلاخ و گەرمیانیانە کە ئێستا لە یەک دابڕاون؛ لە کۆندا پەیوەندییەکی قووڵی خزمیانانە و کولتووریانەی زۆر پتەو لە نێوانیاندا هەبووە، تەنانەت بەشێکیان خاوەنی ئیمارەتێکی هاوبەش بوون بە ناوی ئیمارەتی گۆران.

ئیمارەتی گۆران لە سەدەی نۆهەمی مانگی، پاش هاتنی میر خەسرەوی گۆران لە هەورامانەوە بۆ داڵەهۆ دامەزراوە، ماوەیەک هۆزی کەڵهوڕ بەشێک بوونە لە ئەم ئیمارەتە، پاشان جیابوونەتەوە، بەهۆی کێشە ناوخۆییەکانی هۆزی گەورەی جاف و

تێکهەڵچوونەکانی لەگەڵ ئەردەلانەکان، بەشێک لەم هۆزە جیا دەبێتەوە و دێنە ناوچەی داڵەهۆ و ئەبنە بەشێک لە ئیمارەتی گۆران، ئەم ئیمارەتە ئەوەندە مەزن و کاریگەر بووە لە ڕۆژئاوای ئێران، مێژوونووسانی ئەو سەردەمە بە حوکوومەتی گۆران ناویان هێناون، هەر وەکو لە سەرەوە باسمان کرد، هۆزانی کە بەشداری ئەم ئیمارتە بوون؛ بە حەوت سوڵتانەی گۆران ناسراون، لەو سەردەمەدا ئێلاخ و گەرمەسێریان کردووە، بەشێکی زۆریان پاش دیاریکردنی سنووری نێودەوڵەتیی ئێران و عێراق لە دیوی باشوور نیشتەجێبوونە، بەپێی بەڵگە باوەڕپێکراوەکان سنووری حەفت سوڵتانەی گۆران لە دەشتی ماهیدەشت هەتاکو لێواری ڕووباری سیروان لە تەنیشت دەشتی شێروانە بوون. ئێمە لەم وتارەدا باسی بەشێکی زۆر گرنگ لە دانیشتوانی ئێستای شاری کەلار دەکەین کە لە ڕابردوودا بەشێکی بەرچاو لە ئیمارەتی گۆرانی گەورە بوون بە نێوی حەوت سوڵتانەی گۆران.

## حەوت سوڵتانەی گۆران یەکێتییەکی بەهێز

حەوت هۆزی کورد بێجیاوازی ئایینی لە بەرامبەر قەجەر و عوسمانی بوون، لەو سەردەمەدا، لە سەرەتای دەستەڵاتی قاجارەکان فەوجی سەربازیی گۆران دادەمەزرێنن، چوار هۆزی پێکهێنەری فەوجی گۆران و ئەم قەوارە لە ڕۆژئاوای ئێران، کوردانی سونە سێیانی کوردانی یارسانی بوونە و بە سەرۆکایەتی بنەماڵەی دێریەنی میرخەسرەوی گۆران. ئەم هۆزانە بە ناوبانگ بوونە بە جافی گۆران، واتە:

١- هۆزی تایشەیی پالانی (نەزەر سوڵتان)؛

٢- هۆزی قادرمیروەیسی (کاکەخان سوڵتان)؛

٣- هۆزی نێرژی (سەفەر وەیس سوڵتان)؛

٤- هۆزی بێویانی (فەیز سوڵتان).



## هۆزی تایشەیی یان پالانی

عەشیرەتی تایشەیی لە ساڵی ١٨٤٨ بەم لاوە هاتوونەتە نێو ئیمارەتی گۆران، پاشان بوونەتە یەکێک لە حەوت سوڵتانەی گۆران، سەرۆکهۆزیان یەکەمجار نەزەر سوڵتان تایشەیی بووە، ئێستا بەشێکیان لە کەلار وەکو گەرمەسێر و بەشێکیان لە دەشتی زەهاو لە دیوی ئێران نیشتەجێن، لە سەردەمی ئیمارەتی گۆران لە ناوچەی پالانیی داڵەهۆ گوندەکانی حەسەن گاویار، کانی سەفەر، پەلەزەرد نیشتەجێبوونە، مێژوونووسانی وەکو عەلی عەسغەر شەمیمی و دوکتۆر کەیهان و ناسیر موحسنی پێیان وایە سەرەتا هۆزی تایشەیی لە ئەرمەنیاوە هاتوونەتە کوردستان و لە شارەزوور و ناوچەی جافایەتی نیشتەجێبوونە و پاش تێکهەڵچوونی جاف و ئەردەلان وەکو

جاف؛ هاتوونەتە ژێر دەستەڵاتی میری گۆران و بە نێوی جافی گۆران نێوبانگیان دەرکردووە و بوونەتە بەشێکی گرنگی ئیمارەتی گۆران، دوکتۆر موحەممەد عەلی سوڵتانی بەپێی بوونی نێوی پیاوانی ئایینی ئیسلامی لە سەرەتای داری بنەماڵەی سوڵتانەکانی هۆزی تایشەیی وەکو فەقێ موستەفا، ئەو بۆچوونەی نووسەرانی ئێرانی ڕەد دەکاتەوە.
سەرەتا لەگەڵ هۆزی قادر میروەیسی یەکێک لە فەوجە تایبەتییەکانی گۆرانیان پێکهێناوە، پاشان هۆزی قادرمیروەیسی لێیان جیابۆتەوە و ئەوانیش بوون بە سوڵتانێکی سەربەخۆ لە ئیمارەتی گۆران، سەرەتا یەکەم سوڵتانی تایشەیی لە سەردەمی ئیمارەتی گۆران نەزەر سوڵتان بووە، پاشان مارف سوڵتان و دوایین سوڵتانی تایشەیی تا سەردەمی هەرەسهێنانی ئیمارەتی گۆران، عەلی سوڵتان بووە، لە سەردەمی عەلی سوڵتان وەکو یەکێک لە حەوت سوڵتانەی گۆران، تایشەیی خاوەنی دووسەد سواری شەڕکەری بووە، لە فەوجی گۆران تا سالی ١٣٠٤ ئەم دەستەڵاتە بەهێزە لە ناوچەکەی خۆی درێژەی هەبووە، لە ساڵی ١٩٣١زایینی پیاوچاکانی تایشەیی لەلایەن حوکومەتی ئەوکاتەوە دەستبەسەر دەکرێن و بۆ ماوەی ١٠ساڵ لە بەندیخانەی قەسری قەجەریی تاران بەند دەکرێن، پاش هەرەسهێنانی ئیمارەتی گۆران پلەی سەرۆکهۆزی تایشەیی لە سوڵتانی لەلایەن دەوڵەتی ئەوکاتەی ئێران کەم کراوەتەوە بۆ نازناوی کوێخا، یەکەم کوێخای تایشەیی کوێخا موستەفا بووە.

## عەشیرەتی قادر میروەیسی (کاکەخانسوڵتان)

قادر میروەیسییەکان لە عەشیرەتی یەزدانبخەشی هۆزی جاف بوونە، مەلا موحەممەد قازیی جوانڕۆیی لە نووسینی داری بنەماڵەیاندا، ئەم عەشیرەتەی بردۆتەوە بۆ سەر پیرخزری شاهۆیی لە پیرانی پردێوەر. لە سەردەمی قادر بەگی جافدا لە لە ساڵی ١٨٤٨ لە هۆزی جاف جیا دەبێتەوە و دێتە ناوچەی داڵەهۆ. سەرۆک عەشیرەتی ئەو کاتەیان قادر میروەیس بووە، پاشان بەم ناوە عەشیرەتەکەیان دەناسرێت، کاتێک دێنە داڵەهۆ و ئەبنە بەشێک لە ئیمارەتی داڵەهۆ، سەرۆکیان موستەفا ناوێک بووە لە لایەن میری گۆرانەوە نازناوی سوڵتانی پێدەبخشرێت و ئەبن بە یەکێک لە حەفت سوڵتانەی گۆران، پاشان لە گوندەکانی بەڕیشا، خۆرەمیر، نیشتەجێ دەبن و هاوینان دەچنە میرگبەلا، قەلا ئاوارە، کانی شار و حەسیل کەریم خان عەشیرەتی قادر میروەیسی پاش هەرەسهێنانی حەفت سوڵتانەی گۆران دەستەلاتیان لە سوڵتانی بۆ کوێخایی دادەبەزێت و بۆ هەمیشە داڵەهۆ چۆڵ دەکەن، بەشێکیان لە سەرقەلا و جیران و بەشێکیان لە باشوور لە گوندەکانی حاجیلەر و چوارکلاو، گۆڕگونووژ نیشتەجێ دەبن، ئێستایش بەشێکی زۆریان لە شاری کەلار دەژین و لە ئێران یەکەم کوێخای قادر میروەیسی خوالێخۆشبوو کوێخا حەسەن حەسەنپوور بووە.

## نێرژی یان نێرجی (سەفەر وەیس سوڵتان)

شێوەی سەرەتایی ئەم عەشیرەتە ناوچەی نێرژ بووە، ناوی عەشیرەتەکەیان لە ناوچەکەیانەوە وەرگیراوە، لە ساڵی ١٨٦١ لەبەر تێکچوونی نێوانیان لەگەڵ ئەمانوڵڵا خانی ئەردەڵان ناوچەکەیان چۆڵ دەکەن و دێنە ناوچەی گۆران، لە سەردەمی سلێمان خانی گۆران دەبنە بەشێک لە حەوت سوڵتانەی گۆران و لە گوندەکانی چیاچووین و دەوروبەری گاوارە و دەسەک و بنە و نەوشیروان نیشتەجێ دەبن، یەکەم سوڵتانی ئەم عەشیرەتە سەفەروەیس سوڵتان بووە و بەناوبانگ بووە بە سەفەرخان سەرهەنگ، گۆڕەکەی لەناو حەوشی باوەیادگارە لە داڵەهۆ.

ئەم هۆزە سەرەتا لە ناوچەی گاوارەی گۆران موڵکی تایبەتیی میری گۆران خۆی نیشتەجێیان دەکات، دوایین سوڵتانی ئەم هۆزە لەو سەردەمەدا کە بەشێک بوونە لە حەوت سوڵتانەی گۆران، یاروەیس سوڵتان بووە، دوای هەرەسهێنانی ئیمارەتی گۆران نازناوی سوڵتانیان لێ وەردەگرن و نازناوی کوێخایان پێدەبەخشرێت.

یەکەم کوێخای نێرژی خوالێخشبوو کوێخا ڕەزای یاروەیس بووە و ناوچەی داڵەهۆیان چۆڵ کردووە و لە ناوچەی نێرژ و هەڵوڵ و زەهاو لە ئێران نیشتەجێ دەبن. لە باشووریش لە گوندەکانی سەنگەر و بانزەمین نیشتەجێ بوونە، ئێستایش بەشێکی زۆریان لە شاری کەلار دادەنیشن.

## عەشیرەتی بێویانی (فەیز ئەلاسوڵتان)

ناوی ئەم عەشیرەتە لە ناوی ناوچەکەیانەوە کە بێویانی ناو بووە وەرگیراوە، لە بەڵگەکانی سەردەمی قاجارەکاندا بە بی بیان و بیامە ناوبراون، هەرچەند بیامەیش دوو گوندە لە نزیک بێویان و ئاغای سوڵتانی لە کتێبی ئێڵ و تەوایفاتی کرماشان نووسیویەتی، بێویانییەکان هاوکات لەگەڵ نێرژییەکان هاتوونەتە ناوچەی داڵەهۆ و بوون بە بەشێک لە حەفت سوڵتانەی گۆران، عەشیرەتی بێویانی بە جافی گۆران زانراوە، بەڵام بە بڕوای من وانییە، بە پێی بەڵگە مێژووییەکان بەر لە هاتنی عەشیرەتەکانی جافی گۆران و قەڵخانی و بەهرامی و توفەنگچی هاتوون بۆ داڵەهۆ، دانیشتوانی داڵەهۆ تێکرا ماچۆزمانن، واتە: بە کوردی گۆران ئاخاوتوون، بە پێچەوانەی عەشیرەتە جافەکانی گۆرانی وەکو تایشەیی، قادر میروەیسی، نێرژی، بێویانییەکان وەکو دانیشتوانی ئیمارەتی گۆران ماچۆزمان بوونە و بەپێی گێڕانەوەی بەساڵاچووانی ناوچەکە بێویانییەکان خاوەنی کەلتوورێکی تایبەت بوونە. یەکەم سوڵتانی بێویانییەکان لە سەردەمی هاوبەشییان لە ئیمارەتی گۆران وەکو حەفت سوڵتانەی گۆران؛ فەیزوڵڵا سوڵتان بووە و دوایین سوڵتانی بێویانییەکان شوکروڵڵا سوڵتان و فەیزوڵڵا سوڵتانی دووەم بووە.

سەرەتا بێویانییەکان لە گەرمەسێر لە گوندەکانی سەرقزڵ و بیشکان و بانلوادە نیشتەجێ بوون، لە ئێڵاخیش لە گوندی دۆشەمیان و بێویان کە لە نووسراوە کۆنەکان بە بێویان مارف سوڵتان هاتووە نیشتەجێ بوونە، پاش هەرەسهێنان حەفت سوڵتانەی گۆران؛ پلەی گەورەی عەشیرەتی بێویانی گۆڕدراوە بۆ کوێخا و ناوچەی داڵەهۆیان چۆڵ کردووە و ئێستایش بەشی زۆر گرنگی ئەم عەشیرەتە لە شاری کەلار دادەنیشن.

## سەرچاوەکان


١- تاریخ ایل قلخانی، دەستنووس.

٢- تاریخ گهوارە.

٣- ایلات و طوایف کرماشان، جلد یک.

٤- تاریخ کرمانشاه، ایرج افشار.

٥- کردهای گوران.






# گەشتی دێیەک بۆ شار

م/ برهان محمد فرج

میژووی شارێک یان ناوچەیەکی کۆن و دێرینی وەک کەلار دەتوانین زۆری لەسەر بنووسین بە تایبەت کە بتەوێت چەندین بوار لە یەکتر جیابکەیتەوە بە تێر و تەسەلی لەسەری بنووسیت ، بە شێوەی توێژینەوەی زانستی و ئەکادیمی قۆناغی گەشەسەندنی ئەو شارە دیاری بکەیت لە ڕووی میژووی و ئیداری و سیاسی و ئابووری و ....تاد، بە دڵنیایەوە هیچ شارێک بە خۆرسک دروست نەبووە ،ئەگەر هۆکار گەلێک نەبوبێتە مایەی دروست بوونی ، لە نمونەی فەراهەم بوونی هۆکاری ژیان و گەشەسەندنی ، لە باری هەڵکەوتەی جوگرافی و بە پیتی خاک و بوونی سەرچاوەی ئاو (ڕووبار و دەریاکان) ، سەرەڕای لە بار بوونی هەل و مەرجی سیاسی و ئابووری و سروشتی و .پاراستنی شوێنەوارە ئەرکیۆلۆجییەکان، فاکتەرێکی تری بەهێزە بۆ هێشتنەوەی بە زیندووی شارێک و گەشە سەندنی لە ڕووی گەشتیاریەوە !بە دیاریکراوی باسەکە لەسەر میژووی گەشەسەندنی قۆناغەکانی کەلارە لە دێوە بۆ شار

* هەڵکەوتەی جوگرافیا وتۆبۆگرافیا :

لەڕووی جوگرافیاوە :- کەلار دەکەوێتە ڕۆژئاوای ڕووباری سیروان و قەڵایشێروانە،لە باشورەوە دێ ی گردە گۆزینە و لە باکورەوە دێ ی (سەید خلیل و قاسم ئاغا ) یە ڕۆژئاوای کەلار دەشتی شاکەل و گردەکانی دێینەیە. جوگرافیای دەشتی کەلار دابەش بووە بەسەر چەند ناوێکی دیاریکراودا ئەمە هەندێک لە ناوی شوێنەکانە ( گاقران،تەختە نەختە،سەیسۆنە،کۆترە میل ،(تەپەی رەسول) و پەینکە بریاو ،سەیلماڵ ،پەچە ڕەش،خەرقە ڕەش،سەربێریکە .....
دەشتی کەلار چەند خرێک لە ئامێز دەگرێت ،خرِ ئەو ئاوەڕۆیەیە کە زستان ئاوی پێدا دەڕوات و بەردەلانیە، وەک ( خرِی حاجی،،خرِی سەید خەلیل، خرە شێت، خرە ووشک،خرِی سالە قوت،خرِکونار،خرِپوڵنە،خرِجولەکە ) تاکە سەرچاوەی ئاویش جۆگەی کەلار بوو ، سەرچاوەکەی کانیەک بوو لە دێ ی سەید خەلیلەوە دەهاتە خوارەوە. بۆ خواردنەوە و پاکوخاوێنی و ئاودانی مەڕو ماڵاتیش بەکاردەهێنرا و چەندین باخ وباخات لەو بەراوە بەرهەم دەهات بە تایبەت ماڵە بەگزادەکان چەندین چیمەن و باخیان لەو بەراوە دروست کردبوو .

*ئابووری و خۆژیاندن :



دەشتی کەلار بەگشتی زۆر بەپیتە بۆ بەرووبومی کشتوکاڵی بە تایبەتی دانەوێڵەی ( گەنم و جۆ) هاوکات لەوەرگەیەکی بە پیتە بۆ بەخێوکردنی ئاژەڵ و مەڕو ماڵات هەرچەندە زەوی و زاری دێمی بوو زۆر بەکەمی سوود لە ئاوی ڕووباری سیروان وەردەگیرا لەبەر بەرزی ڕووی زەویەکان لە ئاستی ڕووبارەکەوە ، تەنها ساڵانێک سوودیان لە ماتۆڕی ئاو وەردەگرت بۆ هەڵدانی ئاو لە بەراوەکەیدا مەرەزە دەکرا لە دەشتی کۆترە میل و پەینکە بڕیاو بۆ بەرهەم هێنانی چەڵتوک (برنج) .
ئەوەی شایەنی باسە چەندین جۆر گەنم لە کەلار هەبوون وەک ( گەنمی قەناری (قەندەهاری)،مەکسیکی ،کەڵەتی ) تاساڵی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو پێش پەیدابوونی ئامێری دەڕاسە و مەکینەی جووت ،ئەو زەمانە جوتیار و وەرزێر لە ئێرانەوە بۆ کەلار دەهاتن بۆ کارکردن لەبەر زۆری بەرووبوومی کشتوکاڵیی لە کەلار .زۆرێک لە بەرووبوومەکەش هەناردەی قەسری شیرین دەکرا بۆ فرۆشتن و ساغکردنەوەی و کڕینی پێداویستی تری ساڵانە بۆ بەڕێوە بردنی ژیان ، هەرچەندە تاڕادەیەکی زۆر خەڵکی کەلار پێداویستی
ڕۆژانەو ساڵانی خۆی لە بەرووبوومی دانەوێڵە و ئاژەڵ فەراهەم دەکرد بۆ نمونە (چنینی قاڵی وگلێم ،جاجم ،بەرماڵ ،گوریس، کڵاش ، لەباد،فەرەنجی،کڵاو...) نان،ساوەر،قەرەخەرمان،دۆینە،ک

ەشک،هێلکە،ماست،پەنیر،ڕۆن،دۆ.....
دروست کردنی کونە، مەشکە،هیزە ،لە پێستی خۆشەکراوی ئاژەڵی مەڕوو بزن.هەندێک پێداویستی تریان لە چەمی سیروان دەهێنا وەک : قامیش،نەیجە،پیکە،گسک،بۆ دروست کردنی حەسیر و چیخ و دارەڕاو سەرمیچی خانوو ...جوتیارانی دێی( بنگرد یان مەکینەکە)سودیان لەبەراوی ئاوی سیروان دەبینی بۆشتوکاڵ بەتایبەت باخ و دالێ و بۆیسانکردن
ئاگر خۆشکردن کوانو و تەنور بە پشقل و تەپاڵە دەکرا ئەو سەردەمە نەوت زۆر کەم بوو هاوکات بەردەوام کەلار گەمارۆی ئابووری لەسەر بوو لەلایەن ڕژێمەکانی عێراقەوە تەنانەت شەکر و چاو و نەوت بە یاساغ بۆ کەلار دەهات. کەوابوو زۆربەی پێداویستیەکانی هەمووماڵێک کاری دەستی ژن و پیاوە جوتیارەکان خۆیان بوو پشتیان بە پیشەی خۆماڵی دەبەست.

## * ژیاری و ئارکۆلۆجی :

ئەم ناوچەیە پێدراوە مێژوویەکەی و ئاماژەکانی ، ئەو ڕاستیە دەسەلمێنن ، کە ناوچەیەکی ژیاری زۆر کۆنی تێدایەو دیارترینیان کارکردن بووە لە بواری کشتوکاڵیدا ، چونکە بوونی شوێنەواری ئاودێری ڕاستی بە پیتی دەشتی کەلار دەسەلمێنێت ، بە تایبەتی جۆگە و پرۆژەی (ئاوی گاوریەکە ) کە ئاوی ڕووباری سیروان دەگەیەنێتە دەشتی (گومار) ، ئەو پرۆژەیە بە خشتی سورەوەکراو دروستکراوە لەسەردەمی ساسانیەکاندا، جگە لەوانە چەندین گردی تورەکەڕێژ هەبووە و تا ئێستاش هەن و ڕاستی بوونی ژیان و گوزەران لە ناوچەکەدا دەردەخات، یەکێک لەو گردانە گردی (شێروانە) بووە ، کە ژمارەیەک ئاسەواری تێدا بینراوە و دۆزراوەتەوە بە پێی قۆناغە مێژوویەکان .ئەوەی لای من ئاشکرایە،گردی شێروانە وەک پایتەختی گەرمیان بووە لە هەموو سەردەمەکاندا(کیشییەکان،ساسانیەکان ،ئیسلام تا دەگاتە سەردەمی حەمە پاشای جاف) .
مستەر ریچ (Claudius James Rich) لە گەشتی ریچ بۆ کوردستان ساڵی (١٨٢٠)ز دا ئاماژە دەکات لە کاتی سەردانی بە (حەوش کوڕو) بۆ لێکۆڵینەوە لە ئاسەوارەکەی ، دەبێژێ « لەپاش ئەوەی بەرەو ڕۆخی ڕووباری (دیالی) واتە (سیروان) بەڕێکەوتم لەسەر ڕۆخی سیروانەوە بینیم گردێکی تورەکەڕێژ ناوی گردی شێروانە بوو .... تاد « (گەشتی ریچ بۆ کوردستان ساڵی (١٨٢٠)ز و:محمد حمە باقی ل ٣٧٨ چاپی پێنجەم ).... لە گەشت نامەکەدا ریچ ئاماژە بە گردی تورەکە ڕێژ دەکات و ناڵێت قەلا ! بۆیە وا دەردەکەوێت قەڵای شێروانە لە پاش ساڵی (١٨٢٠ز) لەسەر ئەو گردە دروست کراوە و بۆتە سومبولی ئەو ناوچەیە . هەر بۆ

پشت ڕاستکردنەوەی ئەم بۆ چوونە بەو گوندەش کە نزیک بووە لە گردەکەوە  ئێستا یەکێکە لە گەڕەکە کۆنەکانی شاری کەلار وتراوە (بنگرد) نەوتراوە (بن قەڵا) بە پێچەوانەی قەڵای هەولێرەوە کە مێژووەکەی کۆنە بە ئاوەدانیەکانی بن قەڵا دەوترێت (بن قەراتی).سەرەرای ئەوەی مستەر ریچ لە ڕووباری سیروان پەڕیوەتەوە بۆ گوندی (زەنگاباد) کە ئەو بە (زەنگ ئاباد) ناوی دەبات دەڵێت « چەندین گردی تورەکە رژێن هەیە و (قەلات تەپەسپی) خشتەکن و خشتیان لێدەردەهێنان » کەوابوو ئاسەواری کۆنتری تێدا بووە هەروەها ئاماژە دەکات بەو گردانە لە گردی (بابل)ی دەچوون .

کەس ناتوانێت بڵێت ئەم ناوچەیە ، ناوچەیەکی قەرەباڵغ نەبووە چونکە دیسانەوە ریچ باس لەوە دەکاتە « کەلاوەیەکی ئێجگار زۆر لەو ناوەدا هەیە بەتایبەت لە نێوان کفری و زەنگابادا» ، بوونی کەلاوەش لەو ناوچەیە ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ ناسەقامگیری دانیشتوان لەڕووی (سروشتی و سیاسی و ئابوری )یەوە ئاشکرایە هۆزی جاف لە گەرمیان و کوێستاندا بوون و لە هەردوو وەرزی زستان و بەهاردا هاتونەتە گەرمیان و ماونەتەوە و کەلارەیان دروست کردوە (کەلارە ئەو شوێنەیە کە بۆ هەلچگرتنی سوتەمەنی بەکاردێت بە تایبەت (پشقلی مەڕ و بزن ) جگە لە جاف چەندین عەشیرەتی تر  لە کۆنەوە لەو ناوچەیە ژیاون بە تایبەت (زەنگەنە،گێژ،کەلهور،ر ۆژبەیانی،پاڵانی،سەید و شێخان) مەبەستم لە عەشیرەتەکانی دەشتی شێروانە و شاکەلە بۆیە ناوی عەشیرەتەکانی تر ناهێنم ، بۆنمونە هەردوو گوندی (کەوا چەرموو ، ئەولاقوت) بە ناوی دووکەسایەتی عەشیرەتی رۆژبەیانیەوە ناوبراون .

## * مێژووی دروستبون و ئاوەدانکردنەوەی کەلار :

دەگەڕێتەوە بۆ پێش دروست بوونی قەڵای شێروانە ، ڕێک لە سەردەمی (محمود پاشای جاف) دا ، کە ئەو دەمە محمود پاشا لە (قەڵای پاشا) جێگیر بووبوو.خێڵەکانی جاف بۆ گوزەرانی ژیان گەرمیان و کوێستانیان دەکرد و دەوار نشین بوون ، لەوکاتەدا خێڵی (عباس جلیل) یش کە بە هەمان شێوە دەوار نشین بوون لە دەشتی شاکەل و گوماردا شوانکارە بوون و مەڕوماڵاتیان بەخێو کردووە، بۆ دروستکردنی چەرداخ (کەپر) ، لە چەمی سیروان قامیشیان هێناوە ، کە گەیشتونەتە (کەلارە)کان باریان خستووەو دواتر بۆ وەرگرتنی ڕەزامەندی چوونەتەلای (محمود پاشا ی جاف ) و داوایان لێکردووە ڕێگەیان بدات (کەلار ) ئاوەدان بکەنەوە ، ئەویش ڕازی بووە .ئیتر بۆ یەکەم جار لەسەر (خڕکەی کەلار : کە چەمکێکی بەردەڵانیە و بە بەردیان وتووە خڕ یان خڕک ) نیشتەجێ بوونە و دواتر (خڕکە) ناونرا ( خڕی حاجی ) واتە بە ناوی (حاجی ئەڵماس )ەوە ناونرا . کە کوڕە گەورەی (عباس جلیل)ەو، کوڕە بچوکەکەشی ناوی (فەرەج) بووە

دوو کچیشی هەبووە بە ناوەکانی ( عاصمە و دورسە) پاشان (حەسەن بەگ)ی باوکی (حمە رەشید بەگ) هاتووەتە کەلار و لەگەڵ بنەماڵەی (عباس جلیل)دا نیشتەجێ بووە . کە مێژوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نێوان ساڵانی (١٨٦٠-١٨٦٥).لەوکاتەوە لەگەڵ چەندین بنەماڵەیتر تا ئێستاش هەر لە کەلار نیشتەجێن و وەک کەس و کاری یەک لە خۆشی و ناخۆشی دا پێکەوە دەژین . پاش ئاوەدانکردنەوەی (کەلاری کۆنی) ئێستا ، قەڵای شێروانەش ئەو کۆشک و تەلارەی لەسەر دروستکراوە لەسەر دەستی (حمە پاشای جاف ) و مستەر ریچیش ئەوەی بۆ ساغ کردوینەتەوە ! ،هەندێک کەس پێشتر ئاماژەیان دابوو کە گوایە ناوی کەلار لە (کەلاردەشتی)ەوە هاتبێت، کە ئەم بیرۆکەیە دوورە لە ڕاستیەوە ، چیرۆکی ئەم بۆچوونەش تەنیا لەوەوە هاتووە ،تومەز بەگزادەکانی جاف لە گەشتێکیاندا سەردانی باکوری ئێرانیان کردووە و چوونەتە ناوچەیەک کە ناوی (کەلار دەشت ) بووە و لە دانیشتوانەکەیان پرسیوە « ئێوە چ عەشیرەتێکن ؟» ئەوانیش وتوویانە « ئێمە عەشیرەتی گێژین و ئەهلی حەقین ». ئەگینا چەند پشتێکی تری ئێمە هەر لەم ناوچەیە ژیاون و مردوون و زانیاریەکانم لە دەمی کەسە بە تەمەنەکانی بنەماڵەکەمان بیستووە، کەلە سەدەی (١٩)دا ژیاون و خۆیان و تەمەنیان شایەتحاڵی ئەو گوزەرانە بوون کە لەم ناوچەیە گوزەراوە و چەندین ئاسەواری تریش دروستی زانیاریەکان دەسەلمێنن ، بۆ نموونە لە پشت گوندی (دێبنەوە) شوێن هەوارێک هەیە پێی دەوترێت (کاکولیل) کە خەڵکی سادە بە (کاکولی) ناوی دەبات ، ئەم (کاکولیل)ە باپیرەی(عباس جلیل)ەو کاتی خۆی لەو شوێنە نیشتەجێ بووە .

## * قۆناغی دوای شەڕی یەکەمی جیهانی :

لە شەڕلی یەکەمی جیهاندا کەلار بووە بەشەڕگەو جێی ململانێی هێزە گەورەکانی ( عوسمانی،ئینگلیز،روس) لەو نێوەندەدا کەوتووە نێوان بەرداشی ئەو شەڕەوە کە عوسمانیەکان کشاونەتەوە سوپای رووس چەندرۆژێک کەلاری داگیرکردووەو ماوەتەوەبۆیە بەوساڵە دەوترێ ساڵی رووسەکە، سەرەڕای کارەساتی گرانی و وشکە ساڵی کە دواتر بە گرانی گەورە ناسراو ناونرا . دیارە لە سەرەتای سەدەی بیست و سەردەمی قاتوقڕیدا ، کوڕانی (فەتاح بەگی حمە پاشای جاف) بڕیاریان داوە چیتر نیشتەجێبن و لە قەڵای شێروانەوە دەگوێزنەوە بۆدێی کەلار، بەڕاستی هاتنی ئەوان ڕۆڵێکی گەورە و گرنگیان بینیوە لە گەشەسەندنی کەلار لە دێوە بۆ شارەدێ و بەهێزبوونبی پێگەکەی ، ئەو کۆچەی ئەوان ساڵ بە ساڵ کەلاری قەرەباڵغتر کردووە،بۆخۆشگوزەرانی دێکە دەستیان داوەتە هێنانی کارەبا و پۆست و قوتابخانە و نەخۆشخانە و دانانی ئاش و......تاد.

هەر لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی  عێراقەوە کەلار دەبێتە پایتەختی حەوزی شێروانە و شاکەل و بەردەوام نوێنەری هەبوو لە ئەنجومەنی لیوای کەرکوک  و ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا، یەکەم جار (حمە بەگی جاف)لە ساڵی ١٩٢٥ بووبە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران ڕۆڵێکی ئێجگار کاریگەری دەبێت لە ئەنجومەنی نوێنەران و لیوای کەرکوکدا ، دواتر (داود بەگی جاف) تا ساڵی ١٩٥٨ نوێنەر و پەرلەمانتارێکی دەمڕاستی ئەو سەردەمە بووە .

## * ڕۆڵی سیاسی و هزری کوردایەتی :

سەرەڕای ئەوەی کەلار بوو بە نیمچە مەڵبەندێک بۆکۆکردنەوەی بیر و بۆچونی سیاسی و هزری کوردایەتی لە ناوچەکەدا وەک فاکتەرێک بۆ کۆکەرەوەی کەسایەتیەناودار و چالاکەکانیبواری کوردایەتی نموونەی (رفیق حلمی و مستەفا نەریمان ) و هاوڕێکانی ، بە تایبەت لە سەردەمی دروست بوونی هیوا و ( موئتەمەری قەنیلە) دا .  دواتریش دامەزراندنی بارەگای پارتی دیموکراتی کوردستان و پاشان گەشەکردنی حزبی شوعی و ململانێی چینایەتی لەسەردەمی عبدولکەریم قاسم دا کاریگەری خۆی دەبێت وئەو دێیە دەکات بە دوو بەشەوە ،  بزوتنەوەی جوتیاران لە بەرەیەک و بەگزادەکانی جاف و لایەنگرانی پارتی و هاوکارەکانیان لەبەرەیەکی تردا،  پاشان هاتنی بارەگاکانی باڵی مەکتەبی سیاسی خوالێخۆش بووان (ابراهیم احمد و مام جلال) دیسان کاریگەری خۆی هەبوو لەناوچەماوەردا. هاوکات هەندێک جار ناکۆکی و ململانێکانی نێوان بزوتنەوەی کوردستان کاریگەری نێگەتیڤی لەسەر سەقامگیری دێکە هەبوو بەوهۆیەوە چەندجارێک خەڵکی کەلار توشی کۆڕەوبووە.  هەندێک جاریش لەسەر دەستی ڕژێمەکان ی عێراق ، کەلار دەکەوتە بەر شاڵاوی دەست درێژی ڕاوەدوونان بەتایبەت لەسەردەمی حەرەس قەومیەکاندا وەک  (زعیم صدیق و تەها شەکرچی ) بەهێزەوە هێرشیان دەکرد و ماڵەکانیان تاڵان دەکرد. کەلار وەک شارە دێیەک پەیوەندیەکی دینامیکی لەگەڵ کفری و خانەقین هەبوو ، ئەو دوو شارە وەک دوو شاری زیندوو کاریگەر لە گەرمیان و گەرمە سێردا رۆڵی گەورەیان هەبوو،
هەروەها ئەوەی بیرمە بۆ گواستنەوە  ئەم بەر و ئەوبەری سیروان کەڵەک هەبوو ئەوەش هۆکارێک بوو بۆ بازرگانی و پەیوەندیە گشتیەکان لە ناوچەکەدا ، یان بۆپێکەوە بەستنەوەی خانەقین و گوندەکانی و قەسری شیرین و بە کەلار و شێروانەو شاکەلەوە.
ئەوانەی سەرەوە کورتەیەک بوو لە مێژوو  و جوگرافیای کەلار کە ئێستا مەڵبەندی ئیدارەی گەرمیانە و زانکۆ و پەیمانگا و چەندین دام و دەزگای فەرمی و چەند کارگە و پارکی تێدایە یەکێکە لە شارە گەشەکردووەکانی کوردستان و کەلاری کۆنیش گەڕەکێکە لەوشارە.

# فەرهەنگی شوانکارەیی
## بنزاری گەرمیان،
## خورجێکی لە هەزار لاوە دڕاو



**بەمۆ ئیبراهیم سەمین**

### پێشەکیی:

### فەرهەنکوژیی و گەلکوژیی، سەرەتایەکی مێژوویی سەبارەت بە بندەستیی فەرهەنگیی کوردیی:

پاش کەوتنی یەکەم پێکهاتەی ڕامیاریی و کۆمەڵایەتیی و ئایینیی نێوان فیدراسۆن و پێکهاتەی هۆز و خێڵایەتیی ناوچە کوردییەکان (ئیمپڕتۆریای ماد)، کە لە سەردەمی خۆیدا یەکێک بووە لە چەشناوچەشنترین فرە پێکهاتەترین پێکهاتە و جۆری فەرمانڕەوایی لە چاو فەرمانڕەوایانی سەردەمی خۆی، ئیدی زمان و هەبوون و کەلەپوور و مانەوەی کوردیش وەک تێکڕووخان و داتەپینی فەرمانڕەواییەکەی کەوت و دای لە کزی، وەک دەڵێن هەر پارچە و لکێکی یان دزرا و کرا بە هیی نەتەوەکانی تر، یان بە زۆری زۆردارەکیی ئاوەکیی کرا و تاوێنرایەوە. (ئاسمیلاسیۆن)، لەبری ئەوە داب و فەرهەنگێکی بە زۆری چەک و چەکمە بەسەرا سەپێنرا.

---

١ خورج: لە کۆندا بەو کیسە و توورەکەیە وتراوە کە لە بەنی ڕەنگاوڕەنگ چنراوە، جۆر و شێوازەکەی سەرنجڕاکێش و ڕەنگاڵەیی بووە. ئێستا جیاواز لە بەکاربردنە کۆنەکەی، وەک جێلاپتۆپ و کامێرا و شتی مۆدێرنی تر بەکار دەهێنرێتەوە.

بە ڕای زماناس و مێژوونووسێکی وەک ‹جەماڵ نەبەز› بە شێوەیەکی سرووشتیی فەرهەنگ و داب و زمانی کوردی پێکهاتە و بیچمێکی فرە دیموکراسیی هەیە، بە شێوەیەک کە ئەو هەموو شێوەزار و بنزار و بنزارۆچکە و جۆری دین و جەژن و یاد و بۆنە و بوونی دەیان جۆری هەڵپەڕکێ و لاوک و حەیران و گۆرانیی و هۆرە و شیعر و ئەدەبییاتێکی فراوان لەنێو جوگرافیایەکی بەریندا لە کووت و تکریتەوە (کووت چی ‹کوخت یان کۆلێت› کوردیی جاران نییە و کووتی ئێستای عەرەبیی کوردەکانی لێ دەرپەڕێنراوە)، تاوەکوو ئەوپەڕی کوردستانی سوور، لە هەر شار و پانتاییەکی بچووکی کوردستاندا بە ڕادەیەکی سەیری وەها جێی ژیانی ئەو هەموو جیاوازیی و دەوڵەمەندییە بووەتەوە، کە دووپاتبوونەوەی لە زۆر جێی تردا نەکردەنییە.

ئێستا با بێینە سەر ئەوەی ئەو دەوڵەمەندیی و تێکچڕژانە فەرهەنگیی و زمانییە دەوڵەمەندەی کە وا لە هەر سووچ و پەنایەکەوە خۆڵی مردووی کراوە بە سەردا بیتەکێنی و هەڵی بدەیتەوە و وەک ئاوی پەنگخواردوو فیچقە بکات، بۆ ئاوا دیل و پارچەپارچە و ژینۆساید کراوە و ونە؟

بە کورتیی دەتوانین هۆی یەکەم لە ڕووخان و داتەپینی یەکەم دەسەڵاتی کوردیی و فەتحی عەرەبیی بۆ ئێراقی جێنشینی کورد و گەلانی ڕەسەنی تری ئێراق ببینینەوە. لە تیۆری ‹بنەچەی جۆرەکان›ی داروینیدا هاتووە کە مانەوە بۆ بەهێزەکانە. ئەمە فیتاوفیت لەگەڵ دۆخی کورددا وێک دێتەوە. ئەوەی هاتووە دایکوتاوە و دایپڵۆساندووە و چمکێکی فەرهەنگ و کەلتووری کوردیی بۆ خۆی داپچڕیوە و خاک و ئاوەکەی تەعریب و تەتریک و تەفریس کردووە، لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەمیشە و هەردەم مانەوە بۆ ئەوانە بووە کە زۆری چەک و چەکمەیان زیاترە.

ئەمەش کاری یەک ڕۆژ و دوو ڕۆژ نییە، بەڵکوو پرۆسەیەکی نزیک بە هەزار و پێنجسەت ساڵەی دووررودرێژە، بگرە کۆنتریشە، بۆ ئەو کاتەی فارسەکان بە ڕێبەرێتیی داریوش دەسەڵات لە ماد دەستێنن. هەرچەن ساڵ جارێک سوپایەکی توندوتیژ و تاڵانچیی و ڕاوڕووتکەر ڕووی کردۆتە مەڵبەندی دەوڵەمەندی کوردەواریی: (دەوڵەمەند هەم لە ڕووی ئابووریی هەم فەرهەنگیی) و ئەم هەبوونەی پلیشاندۆتەوە. هەرجارە و بە گوتارێکی دنیایی یان دینیی سەرکوتیان کردوون. سەردەمێک وەک پاشماوەی جنۆکەکانی سلێمان، سەردەمێکی تر وەک دێوی کەوشەکوڵکینەی نێو چیاکان و سەردەمێک وەک زیادە و کلکدار و خوێنپیس و ئاگرپەرست و هۆکاری کۆتاییهاتنی دنیا و نەوەی زوحاک و کاوە و چیاپەرست لێیان نواڕیون. ناتۆرەی کەوشەکوڵکینە تانووتی ئەو زانا موسڵمانانەی سەدەکانی ڕابردوو بووە، ئەویش لە سۆنگەی جلوبەرگ و کڵاشەکانیانەوە. لە سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانییشدا کوردیان وەک هۆکاری ئاخیرەت و نەتەوەیەکی نەفرەتلێکراو تەماشا کردووە.

یان دواتر لە سەردەمیی مستەفا کەماڵ ئەتاتوورک کوردیان وەک تورکی چیایی تەماشا کردووە، پاشانیش لە سەردەمی بەعسی فاسیستدا بنەچەی کوردیان داوەتە پاڵ عەرەبە سوننەکانی ئێراق.

ئەم لێڕوانینانە هەم ترسێک بووە بە هۆی ئەوەی کە کوردان دەبنە هۆی ئاخیرەت و ناوچەی ئەوان دەبێتە مەیدانی دوایی هاتنی دنیا، هەمیش ترس بووە لە بەهێزییان گەر یەگ بگرن. هەمیش سەرەنجامی ئەو ئاگاییانە بووە کە ئەم نەتەوە تازانەی سەر خاکی کوردان لەوە دڵنیا بوون ئەوان تازەترن و لەسەر خاکی نەتەوەیەکی تر هەبوونی خۆیان مشتوماڵ داوە،

بۆیە لایان وابووە زیندووبوونەوەی نەتەوە ڕەسەنەکە یەکەوجێ واتای تێکرووخانی دەسەڵاتە نارەسەنەکەیە. هەموو ئەمانەش پێکڕا پاشخانێکیان لە ڕق و نەفرەت لای دەسەڵاتە دینیی و دنیاییەکانی ناوچەکە درووست کردووە کە بووە بە پاساوێک بۆ گەلکوژیی و تواندنەوەیان.

خاڵێکی تری هۆی لەبەینچوونی فەرهەنگیی و شووناسی کورد دەوڵەمەندییە ئابوورییەکەیەتی، کە وای کردووە هەمیشە ببێتە مەیدانی پێکدادان و یەکلاکردوەوەی کێشەی شوێنەکانی تر.

تا ئێستاش ئەوەی کوردی پاراست لە تواندنەوەی یەکجارەکی فەرهەنگ و جۆری ژیانی لادێنشینی و شوانکارەیی بووە، چوکە پتر سرک و سلۆک و نەگیر بووە و دەستی هێز و دەسەڵاتە فەرهەنگیی و پەروەردەییەکەی داگیرکەر و بێگانەی پێ نەگەشتبوو.

تەنها کاتێ ڕێ لەم گەلکوژیی و فەرهەنگکوژییە دەگیرێ کە کورد خاوەنی چوارچێوەیەکی سەربەخۆی ڕامیاریی و فەرهەنگیی و ئابووریی و بێت و کەسێتیی و شووناسی کورد بەرجەستە بێ و لە پاڵ گەلانی تردا ڕۆڵی لە ڕەنگرێژکردنی ئازادیی و کەلتووری جیهانییدا هەبێ.

بێگومان پێویستیی نوێکردنەوەی ئەدەب و فەرهەنگ پەیوەندییەکی توند و ڕەگئاژووی بە زیندویی زمان و فەرهەنگ و ئاستی چەمکازسیی لە زماندا هەیە، ئەمەش پرۆسەیەکی درێژمەودایە و لەگەڵ درێژەدان بە ڕەوتی گۆڕانکارییەکاندا گەشە دەکات و زیندوویی دەبەخشێتە زمان و فەرهەنگی نەتەوە و یەکێکە لە پێویستییە نەتەوەیی و فەرهەنگیی و ئەدەبییەکان بۆ ئەدەبی هەر نەتەوەیەک.

من لەم وتارەدا کۆشاوم دەست بخەمە سەر لایەنە گرنگەکانی جوگرافیای سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و ئەدەبییاتی ناوچەی گەرمیان بە گشتیی و دواتر هاتووینەتە سەر وشە و دەستەواژە و فەرهەنگی ناوچەی گەرمیان و تیشکخستنە سەر ئەو فەرهەنگە دەوڵەمەندە و هێنانەوەی چەند نموونەیەک لەو فەرهەنگە پانوپۆڕ و گرنگە، لێرەدا چەند ئامانجێکمان هەیە: باسکردن لە جوگرافیا و باری کۆمەڵایەتی و ئەدەبیاتیی ناوچەکە. گرنگی ئەم ناوچەیە لە ڕووی ئەدەبییات و پاشان ئەو سەربارەی دەیخاتە سەر ئەدەبییاتی نەتەوەیی گەلی کورد. دواتر دێینە سەر باسی سەرەکیمان کە باسکردنە لە فەرهەنگی وشە و دەستەواژەی ناوچەی گەرمیان. لە میانەی هێنانەوەی چەند نموونەیەکەوە ئاستی فراوانیی و دەوڵەمەندیی و گەشەی ئەم شێوەزارە بەرباس دەخەین

## بەشی یەکەم:

## کورتەیەک لە گرنگیی ناوچەی گەرمیان لە ڕووی جوگرافیی و سیاسیی و فەرهەنگییەوە:

ناوچەی گەرمیان لە ڕووی جوگرافییەوە دەکەوێتە خوارترین سنووری باشووری کوردستان و هاوسنووری ئێراقە. لەسەردەمی گۆتییەکانەوە بە ناوچەی گەرم ناسراوە، هەروەها لە کۆندا بە گەرمیان وتراوە ‹گەرمەکان›، ئەم ناوچەیە لە کۆندا ڕووبەرێکی فراوانتری لە ئێستا هەبووە

و ‹تۆفیق وەهبی بەگ› پێی وایە: گەرمیان سنوورەکەی لە باکوورەوە زنجیرەچیای هەورامانە و لە باشوورەوە چیای حەمرینە. ڕۆژهەڵاتی ڕووباری سیروان و زێی بچووکیش سنووری ڕۆژئاوایەتی. ئەم هەرێمە هەردوو لیوای کەرکوک و سلێمانی دەگرێتەوە، جگە لە پشدەر. ناوەندی باگرمێش شاری «›کرخ سلوخ، کەرکوک›ە. دیارە وشەی ‹باگرمیَ› لە گەرمیانی کوردییەوە هاتووە و واتە ناوچە گەرمەکان، بەرامبەر ‹زۆزان› واتە ناوچە ساردەکان.

ناوچەکە دەوڵەمەندە بە چەندین سەرچاوەی گرنگی مێژوویی و سیاسیی و جوگرافیی و ئەدەبیی. ناکرێ لێرەدا تیشک بخەینە سەر هەموو ئەو لایەنانە و قسەیان لە سەر بکەین و لێی ورد بینەوە، چونکە باسەکەی ئێمە دەربارەی شتێکی ترە. بەڵام گەر بە کورتیش بێت لەم بەشەدا دەتوانین تیشک بخەینە سەر چەند لایەنێکی ئەم ناوچەیە.

گەرمیان لانکەی چەندین شۆڕش و پارتیی نەتەوەیی کوردییە، یەکێک لەو شۆڕشانە شۆڕشی ‹برایم خانی دەلۆ›یە. لە ٢٢ی ئابی ١٩٢٢ لە شاری کفری و بە سەرکردایەتیی برایم خان هەڵگیرسێنرا. یەکێکی تر لە ڕووداوە گرنگە و مێژووییەکانی ناوچەکە ‹شەڕی ئاوباریک›ە کە هۆزەکانی ناوچەکە ‹جاف، زەنگەنە، دەلۆ، گل› بە سەرکردایەتیی سەرۆکەکانیان ڕۆشتنە پاڵ شێخ مەحموود و لەو کاتەدا لە ‹ملەبۆر›ی دێی زەرد لەشکری ‹کەریم بەگی فەتاح بەگ› ڕووبەڕووی حکومەتی ئێراق دەبنەوە. هەروەها گەرمیان لانکەی چەندین پارت و حزب بووە، لەوانە ‹حزبی هیوا›، ساڵی ١٩٣٧ لە کەرکوک دامەزرا. ئەم بابەتە ئاوکێشە و دەمانبا بۆ زۆر باسی پێچەڵپێچی مێژوویی. بۆیە لێرەدا لێی دەوەستین.

یەکێکی تر لەو دوو ناوچەیەی گەرمیانی ئێستا کە بەشێک لە کۆنەست و یادەوەریی مێژووی مرۆڤی ئەم ناوچەیەی گرێ داوە بە خۆیەوە، ڕووباری سیروان و قەڵای شێروانەیە.

ئەم دوو هێمایە بوون بە دوو بابەتی گرنگی نێو ژیانی فەرهەنگیی و کۆنەستی خەڵکی ناوچەکە، سیروان بەهۆی دەوڵەمەندیی و ڕۆڵەکەی لە ژیانی ئابووریدا، شێروانەش بەهۆی دەسەڵاتە ناوخۆیی و گرنگەکەی لە ڕابردووی ژیانی کۆمەڵایەتیی و سیاسییدا.

بنزاری گەرمیانیی لە ڕویی جوگرافیای زمانەوە و بنزارێکە. لە زاری کرمانجی خواروو. کە یەکێکە لە زارە زیندوو و دەوڵەمەند و پڕبەرهەمەکانی ئەمڕۆی ژیانی ڕامیاریی و فەرهەنگیی و کەلتووری کۆمەڵی کوردەواریی و پەیوەندییەکی باڵکێش و گرنگی لەگەڵ ئاستی گەشە و ئەدەبییات و هونەر و فەرهەنگی کۆمەڵگەی کوردیی هەیە.

بەشی دووەم:

## گەرمیان: کانگای وشەی ڕەسەن:

ناوچەی گەرمیان بە حوکمی ئەوەی لە کۆندا کەمتر ناوند یان سەنتەرێکی هەبووە بۆ کۆبوونەوەی خەڵک، بۆیە بنەمای مۆدێرنبوون و دامەزراندنی شاری دەرەنگتر تیا دامەزراوە و بەشێکی زۆری خەڵکەکەی لەم پانتاییە بەرین و بڵاوەدا بڵاو بوونەتەوە و گوندیان پێکهێناوە و شێوەژیانێکی

شوانکارەییان درووست کردووە. مسۆگەر فەرهەنگی زاراوەسازیی و وشەسازیی لادێش جیاوازە لە شار. پێکهاتەی ناونان و زاراوەسازیی لادێ پێکهاتەیەکی شوانکارەیی و کشتوکاڵییە، بەو مانایەی کە لە ناونان و دروستکردنی ناو و دروستکردنی حیکایەت و ئەفسانە لەسەر ئەو کەرەستانەی کە هاوڕێ و بەڕێکەری ژیانییەتی دەستێکی باڵای هەیە و دەوڵەمەندییەکەی داوە بە فەرهەنگەکەی. ئێمە لێرەدا هەوڵ دەدەین ڕاوەستانێکی گەر کورتیش بێت لەسەر ئەم فەرهەنگە بکەین و لەسەری بووەستین، تا ئەو جێگەیەی کات و سنووری لێکۆڵینەوەکە ڕێگەمان دەدا باسیان بکەین.

بێگومان ‹ناونان› بەشێکە لە پرۆسەی ئاگایی مرۆڤ بەشێک لە مێژووی مرۆڤ مێژووی ناونانە لە شتەکان. مرۆڤ بەوەی کە توانای بیرکردنەوەی هەیە، ناو لە شتەکانیش دەنێ و بەم ناونانەش پێناسەی ئەو شتانە دەکا کە وەک کەرەستەی ژیانبەڕێکەری خۆی بەکاری دەبات.

بێگومان سەرەتا ناوی لەو شتانە ناوە ک نزیکترین و دەستی بەریان کەوتوو و زووتر و پێش هەرشت بینیونی. ناونان ئاستی سایکۆلۆژیی و ترس یان دڵخۆشیی ڕازیی بوون یان ڕازیی نەبوون بەرامبەر ئەو شتە پیشان دەدا. بۆ نموونە لە ناوچەی گەرمیان وشەی ‹دێو، دەعبا، درنج، جنۆکە› بۆ ئەو بوونەوەرە ئەفسانەییە بەکار دەبا کە بێزی لێ دەکاتەوە و لێی دەترسێ و بووە بە بەشێک لە کۆنەستی ناوچەکە. یان کاتێک دەترسێ ناوی بهێنێ، بەپێی ئەفسانەکان گوایە لەگەڵ ناوهێنانیدا ئەوا تەنیا بە ‹ئەوان یان ئەوانێل› ناوی دەبا. ئەمەش لە ترسی ئەوەی نەوەک لەگەڵ ناوهێنانی لێی پەیدا بێت.

## ا. کشتوکاڵ و ئاژەڵداریی :[2]

* **دێم**: دێمەکار: ئەو زەوییەیە کە وا تەنیا پشت بە سەرچاوەی باران دەبەستێ و هیچ سەرچاوەیەکی کانی و ڕووباری لەبەر ڕانەخراوە.

***.شێف**: ئەو زەوییەیە کە دووجار یان زیاتر کێڵراوە و ئامادەیە بۆ بەرهەمهێنان.

* **بورە و بەرچین:** ئەو زەوییەیە کە یەکسەر تۆو دەکرێت و بە بەیارەکەیەوە دەکێڵرێت.

* **گاوخان:** پانتاییەکی زەویی، ئەوەندەی جووتیار و گاکانی بێزار دەکەن. بە ڕۆژێک یان زیاتر بکێڵرێت، هەر گاوخانێک دەکرێت بە چەند بانەیەکەوە.

* **بانە:** بانە یەکەیەکی بچوکترە و زیاتر وەک سنوورێک بۆ وەشاندنی تۆو دووبارە نەبوونەوە. لە سەرەتای دەستپێکردنی جووتەوە بەشێوەی لاکێشە جیاریی دەکرێت.

بێگومان کەرەستە و ناوی تر بەم بوارە زۆرن و گەر بە وردیی باسیان بکەین، باسەکەمان بە ئاقارێکی تردا دەبات و لە شارێی خۆمان دەردەچین و ناتوانین ئامانجەکەمان بپێکین.

---

٢ پریاسکە، عەلی حاجی عەبدوڵای کەوڵۆش. ل١٣

**٢/ کەرەستەکانی جووت**[٣] :

* **هێش:** هەوجارِ: دارێکی دووپەلە لقێکی درێژ و ئەوی تری کورت.

* **دەسەکەوشە:** پارچەئاسنێکی شێوە سێگۆشەی تیژە، دیوی سەرەوەی قۆقزە، بەشی دواوەی وا دروست کراوە کە بچێتە پەلە کورتەکەی هەوجارِدا.

* **مژان:** دارێکی ڕاستی درێژە و سێ کونی تێ دەکرێت و دوانیان لە بەشی دواوە و یەکێکیان لە سەرەکەی تریەوە.

* **هەپە:** پارچەدارێکی درێژکوولەی تەختە کە دەوری کیلۆن دەبینێ، بەهۆی دوو کوونەکەی مژانەوە هەوجارِەکە بە سەری مژانەکەوە دەبەستێ.

* **گایجنە:** لە شێوەی هەپەیەکدایە و کەمێک درێژتر و هەندێک چەماوەیە و ئەوسەری مژان بە وێژەوە دەبەستێ.

**وێژە:** دارێکی چەماوەی بازنەییە و بە ئەستوریی سۆندەیەکی ¼ و بە قەد دەمی دەورییەکی مامناوەند. کە بەهۆی قایشێکی چەند لۆوە بە ناوەڕاستی نیڵەکەوە بەستراوە.

**کەڵەمە:** دوو تولّ داری درێژی نزیکەی ٧٠ سم و سەرێکیان خڕ و ئەستوورە و لە هەرلایەک.

**٣. دەنگی هەندێک ئاژەڵ و کەرەستە:**

*زریکە: هاواری تیژ و باریک

*زڵە: دەنگی چەقە و هەرا.

*هێستر:لووشکەیهێستر

*قۆڕەی گا

*پرمەی بەراز، مرقەی بەراز

*واقەی ڕێویی

*بزنمژە: هوشەی بزنمژە، یان بزنمژەک

* گەناسری پۆڕ

وڵتەیسوێسکە

حیلکەیئەسپ

فیشکەیمار

---

٣ هـ س، پ، ل١٨

### د. ناوی کاتی جوتبوونی هەندێک ئاژەڵ:

*مایین: تەڵەو

*بزن: بە تەگەیە

*سەگ: بە بایە

*پشیلە: بە نورۆیە

*مانگا: بە کەڵە، یان وەکەڵە، لە کوردەوارییدا یەکێ زۆر سەرچڵیی و کاری لنگەوقووچ بکات دەڵیت خۆ وە کەڵ نیت.

دیسانەوە ئەمە نیشانەی ئەو ڕابردووە بەهێز و پتەوەی ژیانی کورد و ئاوێتەییەتیی لەگەڵ ئاژەڵانی دەوروبەری، هەمیش نیشانەی ئەو ڕابردووە دێرینەیە کە هەزاران ساڵ ئینجا ئەم ناو و دەنگەناوانە بیچمیان گرتووە.

### ٥. هەندێک لە نەخۆشییەکانی ئاژەڵ:

* **دەمەڕووشە:**[4] دەمولێوی ئاژەڵەکە دەبێتە برین و زیپکە، ترشەسماقی هاڕاوەی بە ئاوەوە لێ دەدرێت بۆ چاکبوونەوە.

* **کلاوڕەش:** ئاژەڵەکە دەکۆکێ و زیان بە سییەکانی دەگات یان سیی ڕەش دەبێتەوە.

* **وفە:** چۆکی دەئاوسێ

* **سایمەل:**[5] بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە و ئەبڵەق دەبێت.

* **لاڕەشە:** جگەر و سییەکانی ڕەش دەبێتەوە. کوردەواریی دەڵێ: لاڕەشە بگری.

* **جەوشەن:** سەروگوێلاکی دەئاوسێ و ڕۆشتنی نامێنێ و حەزی بە تەنیاییە و زۆر ئەخوات.

* **باڵەشۆرە:** تایبەتە بە باڵندە بە گشتیی و قەل و قاز و مریشک بە تایبەتیی، خۆی بە پێوە بۆ ناگیرێت و خواردنی بۆ ناخورێت.

* **سەگەناز:** نەخۆشیی سەگە و لەڕ و بنێس و بێ قەوارەی دەکات.

### ٦. ناوی چەند بەش و شوێنێکی خانووی ماڵ:

---

٤ ە، س، پ، ل٣٣

٥ چاوپێکەوتنی ڕووبەڕوو.

* **کونەواجە:** کونێکە لە ناوەڕاستی سەربانەکەدا بۆ ڕۆشنایی و دەرچوونی دووکەڵ لە شێوەی چوارگۆشەیی چەترێکی دوو لاشیان بەسەرەوە درووست دەکرد پێیان دەوت کڵاوڕۆشنە (کڵاوڕۆژنە)، تا باران و بەفر نەچێتە خوارەوە. هەڵبەت پاشان کڵاوڕۆژنە دواتر وەک هاوواتای وشەی ئاییندەش بەکار دەبرا.

* **کەلەوەر:** ناوێکی گشتییە بۆ ئەو شوێنەی دەرو و ماڵی لێوە دەکرێت، لە جیاتی وشەی دەرگا بەکار دەهینرێت، ئەم وشەی کەلەوەرە بەپێی گۆڕانی جوگرافیی لادێ و شوێنی نیشتەجێبوونی خەڵکی جیاواز، ئەوا جیاوازی فۆنەتیکیش درووست دەکات و بەشێوەی تر دەردەبڕدرێت بۆ نموونە لە هەندێک جێگا دەوترێت: کەلۆر، یان کەلوەر.

* **چەپەرە:** لە تووڵی دار و شوڵی ژاڵە بە ئەندازەی کەلەوەر- کەلۆر-دەرگا-کەدا دەتەنرا و بۆ کۆزی کار و بەرخ و گەوڕی مەڕ و بزن بەکار دەهێنرا، لە بری دەرگە.

* **باڵینجە**[٦] :سەربانی بچووکی تاک، وەک سەربانی تەنوربان یان هەر سەربانێکی بچووکی جیا لە بانەکان.

* **خێزەرە:** بریتییە لە داری باریکی ڕێک و بێ گەڵا، زۆر جار دوای دارەڕا، واتا دوای دانانی شایەرەکان و دەسەکان، خێزەرەکەیان بە شێوەیەی یەکسان بەسەرا دابەش دەکرد بەسەر دارەڕاکاندا.

### ٧. قاپوقاچاخ:

* **کاسە:** ئەم دەفرە لە دار درووست دەکرا، زیاتر بۆ دۆ و بەروبوومی ئاژەڵ کەوچکی دارینی قوڵی تیا دادەنرا و دۆیان پێ دەخواردەوە.

* **کیتەڵە**: لەسەر شێوی دێزەیە، بەڵام بە بچووکیی و لە قوڕ درووست دەکرا. لە زۆر ئیش و کاردا بەکار دەبرا.

* **بەڕە:** یەکێکە لە هونەرەکانی ژنی کوردی لە بواری نەخشەسازیی ڕایەخ لە کەرەستەی ماڵدا و لە مووی بزن دەتەنرێ. یەکێکە لە ڕەسەنترین کەرەستە و داهێنراوەکانی سەردەمی لادێنیشینی کۆمەڵگەی کوردی.

هەر یەک لەم دەستەواژانە بەشێکی گەورەی دیوی ناوەوە و سایکۆلۆژیای مرۆڤی کوردی دەردەخەن و هەڵوێست و قسە و بۆچوون و چۆنێتی بیرکردنەیان لە دیاردە جیاوازەکان دەخەنە ڕوو، بەڕە لەنێو ژیان و جوانکاریی و پێویستی ژیانی مرۆڤی کوردییدا دەورێکی بڵاو و باڵکێشی گێڕاوە، هەر بۆیە هەمیشە مرۆڤ لە چاوی ئەو ئامراز و پێداویستییانەی ژیانییەوە پێناسەی ژیان و دیاردەکان دەکات.

---

٦ پریاسکە، ل٢٢

## ٨. کۆمەڵێک ناوناتۆرە و جنێوی کۆن:

*** گەنەوەخەڵ:** دزێک کە لە ماڵە خزم و برا و کەسوکار شت دەدزێ.

*** کەرەسکۆ:** ئەم وشەیە لە جیاتی کۆی وشەی باوان و دایان بەکار دێت بۆ نموونە دەڵێت: کەرەسکۆم دەرهات، واتە کەسم نەماوە، یان منداڵ هاروهاجی بکردایە: دایکی چەمۆڵەیەکی پیا دەماڵی و پێی دەوت: کەرەسکۆت دەربێ.

قەرەچۆڵ: قەرەچۆڵت ببڕێ.

*** دەغەزار:** کەسی لاواز و ڕەنگزەرد و لێوبەبار.

تێبینی: سوودم لە پەڕتووکەکەی مامۆستا عەلی کەلۆش زۆر دیتوە و زۆر وشە و دەستەواژە هەبوون لای من، پێم باش بوو پێناسەکەی ئەو دابنێمەوە، کارەکەی ئەوان گرنگ و زانستییتر بووە. گەر سەربارێکیشم هەبووبێ بۆ پێناسەکەی ئەو، زیادم کردووە.

لایەنێکی تری دەوڵەمەندیی فەرهەنگ و بنزاری گەرمیان لە بواری ڕێزمان و ڕستەسازییەکەیدایە، یان ئاستی دەنگسازیی، کە چارەنووسی ئەمەشیان چارەنووسێکی گەش نییە و وردەوردە بەرەو پووکانەوە دەچێ.

## ئەنجام:

لەم باسە کورتەدا و لە کۆتاییدا ئێمە گەیشتینە کۆمەڵێک دەرەنجامی گشتیی و تایبەتیی کە بەرچاوڕوونییەکی تارادەیەک باشمان پێ دەدا بۆ ناسینی نوێکردنەوەی زمان و فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی و دەور و کاریگەری ئەو بابەتەی هەڵمانبژادووە بۆ ئەم باسە. لەم باسەدا ئێمە گەیشتینە ئەم دەرەنجامانەی لای خوارەوە:

١. نوێکرنەوە نیشانەی زیندوویی هەر ئەدەبیاتێکە.

٢. هەموو نوێکردنەوەیەک بە ڕووخاندن و لە هەمان کاتدا سود وەرگرتن لەوەی کە لە پێشوودا هەبووە، ڕوو دەدات. ئەمە ناکاتە ئەوەی کە سوود لە وشە و دەستەواژەی کۆنی کوردەواری وەرنەگرین و بەلاوەیان بنێین.

٣. گەیشتینە ئەوەش کە فەرهەنگی گەرمیان فەرهەنگێکی دەوڵەمەند و گەورە و چڕ و پڕ و ڕەسەنە.

٤. پێویستە لە نووسینی نوێی کوریدا ئەم وشانە دووبارە بخرێنەوە ناو نووسین و زیندوو بکرێنەوە لە تەپووتۆزی فەرهەنگەکان دەرباز بکرێن.

بەڵام هەموو ئەگەرەکان بۆ ئەوە دەچن، لەگەڵ هاتنی ئەم گەردەلوولی تەکنەلۆژیی و ستانداردی سۆرانیی لکی سلێمانیی و زۆر شتی تر بنزاری گەرمیان نەختەنەختە لەبەین دەچێ و دەسڕێتەوە

یان بە شێوەیەکی وا دێتەوە سەر تەختەکە کە نایناسینەوە. ئەمەش چارەنووسی غەمگینی هەموو کەمینەیەکی زمانەوانییە.

سوودم لەم سەرچاوانە بینیوە.

١. کەلار، مێژوویەکی دێرین و شارێکی زیندوو- ڕزگار حاجی حەمید-١٩٧٠-٢٠١٢.

٢. قەزای کفری، شارەدێی کەلار لە پەنجاکاندا و پاسەکەی حاجی حەسەن. محەمەد شاکەلیی.

٣. پریاسکە، عەلی حاجی عەبدوڵای کەولۆش.چاپی یەکەم ٢٠١٣

٤. فەرهەنگی دەنگەناو لە زمانی کوردیدا، ئیبراهیم ئەحمەدی، ٢٠١٠

٥. چاوپێکەوتنی ڕووبەڕوو لەگەڵ چەند کەسێکی بەڕێزی ئاواییەکانی گەرمیان.

# چەمکی سمارت سیتی و گۆڕانکارییەکانی سەدەی بیست و یەک



ئەلی شێرخان- مانچستەر

شاری زیرەک یان شاری سمارت یان دجیتاڵ سیتی، دەتوانرێت بە زۆر شێوە پێناسە بکرێت، بەڵام زۆربەی لێکۆڵینەوەی کۆنفرانسە هاوچەرخەکانی تایبەت بە بواری شار و تەکنەلۆژیا، بیر و بۆچوونی لێکچوویان لەسەر چەمکی شاری هاوچەرخ هەیە. وای بۆ دەچن سمارت سیتی مانای بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای هاوچەرخە بە هەموو بەشە جیاوازەکانییەوە؛ (سۆفتوێر و هاردوێر)، بە هاوکاریی هەبوونی سەرچاوەیەکی مرۆییی هۆشیار و ژیر لەو بوارەدا. تەکنەلۆژیا چەترێکی گەورەیە بۆ چەمکی سمارت سیتی، کلیلی سەرکەوتنی سمارت سیتی تەکنەلۆژیایە؛ دەتوانرێت بوترێت سمارت سیتیی تەکنەلۆژی.

لە رێگەی تەکنیکی سمارت سیتییەوە دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی شار، داتایەکی زۆر بە رێژە و قەبارە و جۆری جیاواز لە هاوڵاتی و هەموو سێکتەرەکان کۆ دەکاتەوە، ئەم داتایە شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی بۆ دەکرێت، لە رێگەی ئەم داتاوە دەتوانرێت؛ پلانی ستراتیژیی دەمدرێژ، پێشکەوتنی تۆکمە، بەڕێوەبردنی چالاک، ورد و پرۆفیشناڵ، کۆنترۆڵکردن و رێکخستنی هەموو ئەو سەرچاوانەی کە بە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ

پەیوەندییان بە شارەوە هەیە، دابین بکرێت....هتد. ئامانجی سەرەکی لە چەمکی سمارت سیتی؛ دابینکردنی خۆشبەختی و جۆرێتیی ژیانێکی خۆشتر و باشترە بۆ هاوڵاتی. هاوچەرخکردنی هەموو دامودەزگاکانی بەڕێوەبردن، پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان بە شێوەیەکی پرۆفیشناڵ، باشترکردن و پێشخستنی جووڵەی ئیشوکار و ئابووری و بنیاتنانی ژێرخانێکی سمارت بۆ شار.

بەپێی لێکۆڵینەوەیەک لە ساڵی ٢٠٠٩، لەم ساڵانەی دواییدا زیاتر لە نیوەی دانیشتووانی جیهان لە شارەکاندا دەژین، لێکۆڵینەوەکە وای بۆ دەچێت زۆربەی ئەو شارانەی کە کەوتوونەتە بەشی خوارووی گۆی زەوی، بەدەست کێشە و گرفتی زۆرەوە دەناڵێنن، وەک: گەشەکردن و زۆربوونی ژمارەی دانیشتووان، نەبوونی خزمەتگوزاریی سەرەتایی و پێویست، نەبوونی ژێرخانی شار، هەژاریی دانیشتووان، بێهزیی دەسەڵاتە لۆکاڵییەکان و تێکچوون و گرفتە کاریگەرەکانی ژینگە سرووشتییەکان. لێکۆڵینەوەکە وای بۆ دەچێت، گرفتە هەنووکەییەکانی وەک گۆڕانکاریی ئاو و هەوا، سەرچاوەکان و وزەکان، نادڵنیاییی خۆراک و خراپی و تێکچوونی ڕەوشی ئابووری، بارودۆخەکەی ئاڵۆزتر کردووە. سەرەڕای دەسەڵاتی بازاڕ و بەربەرەکانییەکان لەسەر ئەوەی کێ براوەیە، بەڵام بەپێی بیروبۆچوونی نەتەوە یەکگرتووەکان، حکومەت ڕۆڵی سەرەکی و کارای هەیە لە بەڕێوەبردن و پلانی شارنشینیدا. نەتەوە یەکگرتووەکان دەستنیشانی دەکات و دەڵێت لە زۆربەی بەشەکانی جیهاندا، لە ئێستادا سیستەمی پلاندانانی شاری، بەشێکی سەرەکی کێشەکەیە بۆ چۆنیەتیی گەشەکردنی کۆمەڵگە، گەشە و فراوانبوونی شار، نەمانی هەژاری و دڵنیایی و جێگیری و ئاساییش..

وەک دیارە لەم دوو-سێ سەدەی دواییدا، شارنشینی لە باکوور و باشووری زەوی، گۆڕانی بەردەوامی بە خۆیەوە دیوە: لە ڕووی ئابووری، کۆمەڵگە، داگیرکردنی ڕووبەر و ژینگە، بەڵام گۆڕانکارییەکان لە باشوور زۆر بە هێواشی بووە، یان دەکرێت بوترێت لە هەندێک بەش نەبووە. بەڵام بە پێچەوانەوە بەشی باکوور پێشکەوتنێکی سیستەماتیکی و داینامیکی بە خۆوە دیوە، فکری پلان و سیستەمی پێشکەوتنی شار لە باکوورەوە بۆ باشوور، لە ڕێگەی داگیرکاری و جیهانگیرییەوە بووە، نەک لەدایکبووی سرووشتیی کۆمەڵگەی باشوور خۆی

## دیزاینکردنی پرینسپلەکانی سمارت سیتی:

پرینسپل زۆرن، بەڵام کۆمەڵێکیان سەرەکی و گرنگن، پێویستە هەر شار و بایەخی خۆی پێ بدات، لە پێناو ژێرخانی بیناکردن، پێکەوەبەستن، دەستەبەرکردنی پەیوەندیکردن، گەشەی ئابووری، گواستنەوە، حکومەتداری، پاراستنی نهێنی و سەلامەتی خەڵک. بە شێوەیەکی کورت و سادە کۆمەڵێک پرینسپل کە پێویستە لە بەرچاو بگیرێت لە پلانی سمارت سیتیدا:

١- لەبەرچاوگرتنی ژیانی شار پێش جێگەی شار. لەبەرچاوگرتنی جێگەی شار پێش تەکنەلۆژی.
٢-هەبوونی دیدگا لەسەر بەردەوامیی جێگیر و شێوازی گەورەبوونی قەبارە و ئاراستەی شار بەپێی کات و سەردەم.
٣-نەرومونیانی و ئاسانیی گۆڕنکاری بەپێی کات.
٤- هەموو کایەکانی گەشەسەندن و فراوانبوونی شار، دەبێت شێوازەکانی پەیوەندیکردن و پەیوەندییە تەکنەلۆژییەکان لە بەرچاو بگرێت.
٥-دڵنیابوون لەوەی کە فراوانبوون و گەشەکردنەکانی ژێرخانی شار لەگەڵ هەموو پێشکەوتنە تەکنەلۆژییەکاندا گونجاو و تەواوکاری یەکتر بن.
٦-لە پلانی پرۆژەی باڵەخانە تازەدرووستکراوەکان، دەبێت هەموو پێشکەوتنە تەکنەلۆژییە هاوچەرخەکان بەهەند وەربگیرێت و پلانی کراوە و مۆدێرن و ستراتیژییان هەبێت بۆ پێشکەوتن و گەشەکردن.
٧-ئەرکی حکومەتە لۆکاڵییەکانە لە ڕێگەی سۆشیال میدیاوە، یارمەتی بڵاوکردنەوەی هۆشیاری بدەن، لە هەموو ئاست و سێکتەر و ناوەندە جیاوازەکاندا؛ دەربارەی تەکنەلۆژی و سوودی بۆ کۆمەڵگە.
٨-هەموو پلانەکانی فراوانبوون و گەشەکردنی شار، پێویستە هەلی سوودبەخش و بەرفراوان درووست بکات، بارودۆخێکی ئیشوکاری یەکسان و هەلی گونجاو بهێنێتە کایەوە لە نێوان هەموو ئەو ڕێکخراو، کۆمپانیا، پرۆژە و کەسەکان و حکومەتدا کە ڕاستەخۆ و ناڕاستەخۆ لە دەرەوە و ناوەوە، پەیوەندییان بە هەموو لایەنەکانی شارەوە هەیە.
٩-هەموو فراوانبوون و گەشەکردنەکان، پێویستە پرۆژەکانی داهاتوو و ئاراستەی فراوانبوونی شار و پێشکەوتنە تەکنەلۆژییەکان، لە بەرچاو بگرن.
١٠-لە درووستکردن و گەشەپێکردنی هەر سیستەمێکی زانیاریی ئەلیکترۆنی (وێبسایت) بۆ شار، پێشوەخت پێویستە دەستوورێک یان پەیڕەو و پرۆگرامێک (پۆلۆسی) بۆ ئەو سیستەمە دابنرێت، کە ماف و زانیاریی هەموو تاکێک و هاوڵاتییەک بپارێزێت.
١١-هەموو پلانەکانی پێشخستنی شار، دەبێت دڵنیایی ئەوە بدات کە توانای ئەوەیان هەیە جۆرێک لە جۆرەکانی سمارت دیجیتاڵ، یان شارنشینیی هاوچەرخ درووست بکەن.
وەک لە وێنەکەدا دیارە؛ سمارت سیتی زادەی تێکەڵەی هەموو ئەو فاکتەرانەیە کە بە ڕاستەخۆ و ناڕاستەخۆ پەیوەندی و کاریگەرییان هەیە لەسەر ژیانی مرۆڤ لەسەر ئاستی جیهاندا. وەک دیارە لە ڕێگەی سمارت سیتییەوە دەتوانرێت: ژینگەیەکی سمارت، گواستنەوە و پەیوەندیی سمارت، ئابووریی سمارت، حکومەتی سمارت، خەڵکی سمارت و ژیانێکی سمارت بهێنرێنە کایەوە، لە ڕێگەی ئینتەرنێت بۆ هەموو شتەکان، ئینتەرنێت بۆ خزمەتگوزاری، ئینتەرنێت بۆ

داتا و ئینتەرنێت بۆ هاوڵاتی. بێ گومان ئەنجامدانی هەموو ئەم کارانە لە ڕێگەی چاکسازی و پێشخستنی وڵاتەوە دەبێت لە هەموو کایەکانی: سیاسی، ئابووری، یاسایی، کۆمەڵایەتی، پەروەردەیی و...هتد. بە هاوکاریی هەبوونی ژێرخانێکی تەکنەلۆژیی هاوچەرخی بەهێز، سەرچاوەیەکی مرۆیی ژیر کە توانای پڕکردنەوەی پێداویستیی بەکاربەری هەبێت و جێگەی متمانە و پاراستنی مافی تاک بێت.




ئەم وێنەیە بنەماکانی سمارت سیتی ڕوون دەکاتەوە.

زۆر ئەرگومێنت و لێکۆڵینەوەی تازە هەن، باس لە هەموو ئەو گۆڕانکارییە چاوەڕوانکراوانە دەکەن، کە بەسەر ژیانی مرۆڤ و جیهاندا دێت. پاتریک دیکسۆن لە ساڵی ٢٠١٩ لە کتێبەکەیدا بە ناوی (داهاتووی هەموو شتێک)، باس لەو گۆڕانکارییانە دەکات کە لە جیهاندا ڕوو دەدەن لە ماوەی ١٠٠ ساڵی داهاتوودا. دیکسۆن نووسەر و کەسێکی ئەزموونداره لەسەر ئاستی جیهان. باس لەو ڕاستییانە دەکات کە لە داهاتوودا ڕوو دەدەن. دەڵێت؛ یان ئێمە داهاتوو کۆنترۆڵ دەکەین، یان داهاتوو ئێمە کۆنترۆڵ دەکات. لێرەدا تەنها بە کورتی باسی هەندێک لە بیر و بۆچوونەکانی دیکسۆن دەکەم لەسەر شارنشینی. دیکسۆن پێی وایە ئەو گۆڕانکارییانەی لە داهاتوودا

تایبەت بە شار ڕوو دەدەن؛ وەک درووستبوونی شاری گەورە (سمارت سیتی)، کۆچکردن، دیمۆگرافیا، تەندرووستی و جۆر و ئاستی ژیان؛ هەموو شارەکان لە ڕووی قەبارە، ڕووبەر، ژمارەی دانیشتوان، جۆری ژیان، بەڕێوەبردن، گەشەکردن، پەروەردە و تەندرووستییەوە... هتد، گۆڕانکاریی زۆریان بەسەردا هاتووە. پێی وایە لە ٢٠٢٥ نیوەی دانیشتووانی جیهان لە ئاسیا دەژین، هیندستان گەورەترین وڵات دەبێت لەسەر زەوی، بە هەبوونی ژمارەیەکی زۆری گەنج. وا پێدەچێت ٩ بیلیۆن مرۆڤ لەسەر زەوی بژین لە ساڵی ٢٠٤٠، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ڕێژەی لەدایکبوون لە جیهاندا تا ڕادەیەک دابەزیوە. کۆچکردن لە لادێوە بۆ شار زۆرە و بەردەوامە، شارەکان زۆر زۆر قەرەباڵغ بوون و دەبن، ئەمە پاڵەپەستۆیەکی زۆر درووست دەکات لەسەر حکومەت، بۆ بەڕێوەبردن و دابینکردنی خزمەتگوزاری. گۆڕانکارییە سرووشتییەکان و ئاو و هەواییەکان و کەمبوونەوەی ڕووبەری وشاکانی، کێشەی زۆری گەشە و پلانی شار و شارنشینی درووست کردووە.
ئێستا نیوەی جیهان لە شارەکاندا دەژین، هەتا ٢٠٢٥ زۆربەی گەلانی پێشکەوتووخواز هەوڵ دەدەن ئایدیای چەمکی سمارت سیتی پێش بخەن و بەکار بێنن. لەم ڕێگەیەوە تەکنەلۆژیا وەکوو ستراتیژ و میکانیزمێکی سەردەم بەکار دێنن بۆ دەستەبەرکردنی گۆڕانکارییەکی ڕادیکاڵی لە ڕووی باشترکردنی جۆری ژیان، خزمەتگوزاری، گواستنەوە، دابەشکردنی وزە، جێگەی ئیشوکار و هەبوونی ماڵێکی گەرموگوڕ...هتد.

زۆربەی سەرمایە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا لە بنیاتنانی ژێرخانی شار لە نێوان ساڵانی ٢٠٢٠-٢٠٥٠ خەرج دەکرێت لە بوارەکانی: پەروەردە و قوتابخانە، تەندرووستی، پرۆژەی وزە، پرۆژەی ئاو و ئاوەڕۆ، پرۆژەی کارەبا، ڕێگاوبان، هێڵی شەمەندەفەر و میترۆ و ترام، فرۆکەخانە...هتد. پاڵنەری داهاتووی ئەفریقا لە لایەن شارەکانەوە دەبێت. ئەفریقا گەشەیەکی هەمەلایەنەی گەورەی بە خۆیەوە دیوە. کۆمپانیا گەورەکانی جیهان لە هەموو سێکتەرەکاندا بە تایبەتی سێکتەری سمارت موبایل، کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت و تەکنەلۆژیاکانی تر، پرۆژەی ئیشوکارەکانی خۆیانیان گواستووەتەوە بۆ ئەفریقا. چین بەرهەمهێنانێکی بەرفراوان لە هەموو بوارەکاندا دەکات لە گەشەکردنی ئەفریقادا.
.نایجیریا خاوەن زۆربەی ژمارەی دانیشتووانی ئەفریقایە و ئابوورییەکی مەزنیشی هەیە. وا پێدەچێت ژمارەی دانیشتووانی نایجیریا بەم زووانە لە ١٨٥ ملیۆنەوە بگاتە ٣٠٠ ملیۆن. لە هیندستان ژمارەی دانیشتووان هەڵکشانێکی بەرچاوی بە خۆیەوە دیوە، بەڵام لە چین، ڕێژەی زیادبوونی دانیشتووان بە بەراورد بە هیندستان لە دابەزیندایە، ئەویش لە ئەنجامی هەموو ئەو یاسایانەی کە چین دایناوە بۆ لەدایکبوون (یاسای یەک منداڵ). هەمان دیاردە لە یابان و کۆریای

باشوور درووست بووە، ژمارەی دانیشتووان ڕوو لە دابەزینە، بە هۆی کەمیی لەدایکبوونەوە. ٤٠ ساڵ پێش ئێستا باوک و دایکەکان ٦ منداڵیان هەبووە، بەڵام لە ساڵی ٢٠١٨ دابەزیوە بۆ ١.١ لە هەموو جیهاندا. هەرچەندە جیهان پێویستی بە ٢.٣ منداڵە بۆ هەر دایک و باوکێک، بۆ پاراستنی جیهان بەبێ کۆچکردن. کۆچکردن بۆ شارەکان دیاردەیەکە لەم سەردەمەدا بە ڕێژەیەکی بەرچاو زیادی کردووە، بە تایبەتی بۆ ئەورووپا و ناوەڕاستی ئاسیا. لە ناوەڕاستی ئاسیاوە بۆ ئەورووپای ڕۆژئاوا، مرۆڤ لە جووڵەدایە لە کازاخستانەوە بۆ ڕووسیا، ئۆکرانییەکان بۆ پۆڵاند، پۆڵاندییەکان بۆ بەریتانیا و بەریتانییەکان بۆ ئەمریکا...هتد.

یوڤاڵ نوحا هاراریی بە ڕەگەز جوولەکە، پرۆفیسۆری بواری مێژووە لە زانکۆی هیبرۆ لە ئۆرشەلیم، خاوەنی سێ پەرتووکی گرنگە: (کورتەمێژوویەکی مرۆڤ ٢٠١٤/ کورتەمێژوویەکی سبەینێ ٢٠١٦/ ٢١ وانە بۆ سەدەی ٢١). نووسەر و کەسێکی ناسراوە لەسەر ئاستی جیهان، زۆربەی ئەرگومێنتی سەرەکی نووسەر؛ باسی ئەو گۆڕانکارییانە دەکات کە پێشکەوتنە تەکنەلۆژییەکان درووستی کردوون. دەڵێت تەکنەلۆژیا گەورەترین گۆڕانکاریی جیهانی درووست کردووە لە مێژووی مرۆڤدا، کە هیچ فەلسەفە و ئایدۆلۆژیایەک نەیتوانیوە درووستی بکات. نووسەر دەڵێت تەکنەلۆژیا هات و لە دەرگای دا، دەیەوێت چیرۆکێکی تازە پێشکەشی مرۆڤایەتی بکات، لە ئێستەوە تەکنەلۆژیا دەبێتە هێزی پاڵنەری سەرەکی و سەرکردە بۆ دیاریکردن و ئاراستەکردنی ژیانی مرۆڤ، مرۆڤ بەبێ هەبوونی تەکنەلۆژیایەکی هاوچەرخ و گونجاو، ناتوانێت پێشڕەوی بکات و شانبەشانی جیهان پێش بکەوێت. پێی وایە هەر گەلێک هەوڵ نەدات ببێت بە خاوەنی هێزێکی تەکنەلۆژیی مۆدێرنی باش، ئەوا لە پێشکەوتنەکانی جیهان بە جێ دەمێنێت؛ چونکە تەکنەلۆژیا و داتا، گەورەترین چەک و هێزی سەردەمە بۆ بەدەستهێنانی ئامانج و پێشکەوتن. نووسەر دەڵێت تەکنەلۆژیا داهاتووی ئیشوکار، ئازادی، یەکسانی، کۆمەڵگە، شارستانییەت، نەتەوە، ئایین، کۆچکردن، توندوتیژی، شەڕ، مرۆڤایەتی، سیکۆلاریزم، پەروەردە...هتد، گۆڕیوە و دەگۆڕێت. وای بۆ دەچێت؛ دیار نییە لە داهاتوودا یان ٢٠٥٠ چی ڕوو دەدات، بەڵام مرۆڤ بەرانبەر بە تەکنەلۆژیا تا ڕادەیەکی زۆر کۆنترۆڵی لەدەست داوە. سەردەم سەردەمی بوونی داتای زۆرە (بیگ داتا)، ئەو دەوڵەتانەی خاوەنی زۆرترین بڕ و چۆنیەتی و جۆرێتیی داتا بن، ئەوا دەبنە خاوەنی گەورەترین هێز.

بۆ نموونە بەهێزی لەوەدا نییە کە ژمارەیەکی زۆری سەرباز و سوپای گەورەت هەبێت، بەڵکوو بەهێزی لەوەدایە تا چەندە خاوەن داتایەکی زۆری هەمەچەشن و تەکنەلۆژیایەکی هاوچەرخیت، نموونەی هێرشەکەی مانگی یەکی ٢٠٢٠ی ئەمریکا بۆ سەر ئێران.

بە گشتی ئەرگومێنتەکان کاریگەریی تەکنەلۆژیا لەسەر ژیانی مرۆڤ ڕوون دەکەنەوە و نیشانی دەدەن کە تەکنەلۆژیا ڕاستەخۆ یان ناڕاستەخۆ ژیانی مرۆڤی گۆڕیوە، کاریگەرییەکان لە

ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەک و کۆمەڵگەیەک بۆ کۆمەڵگەیەکی تر جیاوازە، ئەمەیش پەیوەندیی بە ئاستی هۆشیاری و زیرەکیی کۆمەڵگەکانەوە هەیە. بەڵام شۆڕشی تەکنەلۆژی؛ گۆڕانکارییەکی جیهانییە و کاریگەرییەکانی لەسەر ئاستی هەموو جیهانە. ئەمڕۆ دەبینیت زۆربەی تاکەکانی هەموو خێزانێک سمارت موبایلێکی پێیە، موبایلی هەر تاکێک بڕێکی زۆر داتای هەمەجۆری تیادا خەزن کراوە، تاکەکان لە ڕێگەی موبایلەکانیانەوە بە میکانیزم و چات و شێوازەکانی پەیوەندیکردن، پەیوەندی دەکەنە جیهانەوە. وەک دیارە ئەم بەکارهێنانە زۆرەی تەکنەلۆژیا؛ هەڵسوکەوت، ئارەزوو، خولیا، خەیاڵ، بیرکردنەوە، پێداویستی، داواکاری، کات، پەیوەندیی کۆمەڵایەتی، هەڵسوکەوتی تاک...هتد، لە ڕەگەوە گۆڕیوە. سمارت سیتی تاکی سمارت درووستی دەکات، بە گشتی لە ڕێگەی ئینتەرنێت و سمارت موبایلەوە، تاک هێواش هێواش بەرەو سمارتبوون دەچێت. بەلای پلانی درووستبوون و گەشەکردنی سمارت سیتی، تەنها بە تاک ناکرێت، بەڵکوو بە پاڵپشتی و پلانی سەرەکی دەسەڵاتی سیاسی، پلاندانەرانی شار، بەڕێوەبردن دەکرێت. لە سەدەی ٢١ تەنها لە ڕێگەی چەمکی سمارت سیتییەوە دەتوانین: ژیانی سمارت، چارەسەری سمارت، خۆشبەختی، یەکسانی، بەڕێوەبردنی پرۆفیشناڵ، پێشکەوتنی جێگیر و درێژخایەن و زۆر شتی پۆزەتیڤی باشتر بەدەست بهێنرێت. تەکنەلۆژیای سەردەم میکانیزمێکە بۆ پێشکەوتن، لە ڕێگەی سۆشیال میدیاوە نەوە و کۆمەڵگە و جیهانێک درووست بووە؛ خاوەن هیچ فەلسەفە و ئایدۆلۆژیایەک نییە و هەموویان یەک داواکارییان هەیە: چاکسازی، یەکسانی، ژیانێکی باش، شەفافییەت....هتد. هەر کۆمەڵگەیەک لەگەڵ گۆڕانکارییە جیهانییەکاندا خۆی نەگۆڕێت، ئەوا بەجێ دەمێنێت.

دەتوانین تێکڕای ئەم گۆڕانکاری و پێشکەوتنە زانستییەی نێو دنیای ئەمڕۆ، لە کوردستان و گەرمیانی خۆماندا بەکار بهێنینەوە و سوود لە پێشکەوتنە تەکنەلۆژییەکان وەربگرین و ببینە بەشێک لەم شۆڕشە تەکنەلۆژییە، تا ببینە بەشێک لە پێکهاتەی نوێی جیهان، تا بگەڕێینەوە نێو مێژوو. ئێمە دەتوانین.

سەرچاوەکان:


The planned city weeps the poor way... Urban planning .(٢٠٠٩) .Watson,W
.٢١st century urbanisation. Journal and

.The Future of Almost Everything. Profile Book Ltd .(٢٠١٩) Dixon, P

.٢١st century. London lessons for ٢١ .(٢٠١٨) .Harari, Yuval

https://www.google.com/search?q=smart+city+principles&source=lnms&
٢ahUKEwjeoIyPv_vmAhUMIMAKHdvkAkQQ_AU=tbm=isch&sa=X&ved
:٧CM-imgrc=b٠etESCSWM#٦٥٧=bih&١٢٨٠=oAXoECA٤QAw&biw



# ده ساڵ
# له تەمەنی زانکۆی گەرمیان

پ.ی.د. دارا حەمید محەمەد

زانکۆی گەرمیان کۆلێجی پەروەردە
بەشی زمانی کوردی

پێش ئەوەی بچمەسەر ناوەرۆکی بابەتەکەم ، کە زیاتر دیۆکۆمێنتارییەکە لەسەر زانکۆی گەرمیان لەسەرەتاوە تا ئەمڕۆ ، دەمەوێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەم ، وەک یەکێک لەو مامۆستایانەی زانکۆی گەرمیان ، کە تەواوی بەڵگە و ڕاستییە حاشا هەڵنەگرەکانی پرۆژەی کردنەوەی زانکۆی گەرمیانم لا پارێزراوە ، لەیەکەم هەنگاوەوە تا ئەمڕۆی زانکۆ ، کە تارادەیەک لە (چێشتی مجێور)ەکەی (هەژاری موکریانی)دەچێت ، چوون تێکەڵەیەکە لە هەڵوێستە جیاجیاکان ، خەمخۆرو دڵسۆزانی بێناز بەڵام بەئیرادە ، دەم و دەست و داوێنپاکان ، مامۆستایانی بەپەرۆش بۆ زانست و مەعریفە و پەروەردە و فێرکردن ، دژە گەندەڵ و خۆبەخش و بەرژەوەندنەویستەکان ، لەبەرانبەریشدا بەرخۆرو هەڵپەکەرانی پلەوپۆست ، گەندەڵ و تالانچییەکانی ناو زانکۆ و پێش بە زانکۆبوونیش ، ڕێگەخۆشکەران بۆ دەستێوەردانی دەرەکی لە هەموو جومگەکانی زانکۆ(زانستیی ، کارگێڕیی ، دارایی ...تد) ، قۆرخکاری و هەلپەرستان ، ئاستی زانستیی و هۆکارەکانی دابەزینی ئاستی زانستیی و بێخەمی بەرپرسانی زانکۆ ...تد ئەمانە و چەندین بابەتیتر ، کە لەبەرنامەمدایە لە داهاتوودا  بە چەند بەشێک لە سۆشیال میدیا بڵاویان بکەمەوە .

ئەم بابەتش پوختەیەکە سەبارەت بە سەرەتاو دەسپێکی زانکۆی گەرمیان و کۆمەڵێک زانیاری پێویست لەبارەی ئەم زاکۆیە دەخاتەبەردیدی خوێنەرانی بەڕێز ، ئومێد دەکەم سوودی هەبێت ، هەڵبەت هەندێک لە داتاکان بەردەست نەبوون لەو ڕووەوە داوای لێبوردن دەکەم .

دەساڵ پێش ئێستا و ڕێک لە ١٤ / ٤/ ٢٠١٠ بەردی بناغەی زانکۆی گەرمیان لە کەمپی زانکۆ لە کەلار لەلایەن سەرۆکی ئەوکاتەی حکومەتی هەرێم و سەرۆککۆماری ئێستای عێراق (د. بەرهەم ساڵح)ەوە دانرا، دواتر و بەپێی فەرمانی هەرێمی ژمارە ( ١٦٧٠ ) لە ( ٢٠١٠/٧/٨)دا زانکۆی گەرمیان دامەزرا، لە ئێستادا زانکۆی گەرمیان (٩) کۆلێج و (٢) بەشی زانستیی سەربەخۆی تێدایە ، کە بەشەکانی یاسا و ئەندازیارین ، زانکۆی گەرمیان (٢٩٨) مامۆستای هەیە لە هەڵگرانی بڕوانامەی ماستە و دکتۆرا ، ژمارەی خوێندکارانی سەروو( ٧٠٠٠) خوێندکارە ، لەم زانکۆیەدا ژمارەیەکی بەرچاو خوێندکاری ماستەر و دکتۆرا هەیە ، کە لە ناوەوە و دەرەوەی هەرێم دەخوێنن ، تا کۆتایی ساڵی خوێندنی ٢٠١٨ / ٢٠١٩ ( ١٢٧٢١) دوانزەهەزار و حەوسەدوبیست و یەک خوێندکار لەم زانکۆیەدا خوێندنیان تەواوکردوە و بڕوانامەی بەکالۆریۆسیان بەدەست هێناوە(هەڵبەت ئەو ژمارەیە ئەو خوێندکارانەش دەگرێتەوە کە پێش زانکۆی گەرمیان لە کۆلێجەکانی پەروەردە و ئاداب و پەروەردەی بنەرەت ) بڕوانامەی بەکالۆریۆسیان بەدەست هێناوە ) . لە زانکۆی گەرمیاندا بەشەکانی ( زمانی کوردی ، زمانی عەرەبی ، زمانی ئینگلیزی ، دەروونناسی ، جوگرافیا ، بایۆلۆجی ) خوێندنی باڵایان تێداکراوەتەوە و چەندین خوێندکار لەو بەشانە بڕوانامەی باڵا(ماستەر ) و (دکتۆرا)یان بەدەستهێناوە و ئێستا بەشێکیان مامۆستان لە زانکۆی گەرمیان ، ئەم زانکۆیە لە ماوەی دەساڵی تەمەنیدا لەڕووی چەندایەتییەوە گەشەی باشیکردووە ، بەڵام لەڕووی چۆنایەتی و کوالیتییەوە ئەوا سەرنج و تێبینی زۆری لەسەرە و بەدەست کۆمەڵێک گرفتی زانستیی و کارگێڕی و داراییەوە دەناڵێنێت ، هەڵبەت بەشێکی کێشەکان پەیوەستن بە ستاف و کەمی ستافی بەشەزانستییەکانەوە ، بەشێکیش لە کێشەکان پەیوەستن بە کارگێری و گرفتە کارگێڕییەکانەوە ، هەندێک لە کێشەکانیش پەیوەستن بە کەمی تاقیگە و نەبوونی بینای کتێبخانەی ناوەندیی ، بەشێکی باشیش لە کێشەکانی ئەم زانکۆیە پەیوەستە بە گەندەڵی کارگێڕی و داراییەوە ، کە بە ڕۆژی ڕووناک ئەنجام دەدرێت و کەسیش نییە پێیان بڵێت سەرچاوتان بڕۆیە . ئەم بەشەی باسەکەم بە نووسینی تایبەت و لە کاتی خۆیدا کە دەخوازم زۆردوور نەبێت بڵاو دەکەمەوە .

# کۆلێجەکانی زانکۆی گەرمیان :

## ١- کۆلێجی پەروەردە :



سەرەتا و بناغەی زانکۆی گەرمیان لە کۆلێجی پەروەردەی کەلارەوە دەستپێدەکات ، کاتێک لە٢٤ / ٥/ ٢٠٠٤ بەپێی فەرمانی وەزاری ژمارە ( ٦/٢/١٧٤٤) بڕیاری کردنەوەی کۆلێجی پەروەردە دەرکرا لە شاری کەلار . سەرەتا ئەم کۆلێجە (٤) بەشی لەخۆ دەگرت ، کە بریتیبوون لە (زمانی کوردی ، زمانی عەرەبی ، زمانی ئینگلیزی ، بایۆلۆجی ،) دواتر بەشەکانی(جوگرافیا ، کیمیا ، دەروونناسی) کرایەوە و لە ڕیکەوتی ١٣ / ٥ / ٢٠٠٧ بەشەکانی ( فیزیا ، بیرکاری ، مێژوو) کرایەوە ، لە سالی ٢٠١٨ خوێندنی ئێواران لەبەشەکانی (زمانی ئینگلیزی ، دەروونناسی ، کیمیا ) کرایەوە . شوێنی ئەم کۆلێجە بینای بەشی ناوخۆیی پەیمانگای تەکنیکی کەلاربوو تاساڵی ٢٠٠٩ / ٢٠١٠ دواتر بە دوو قۆناغ گوێزرایەوە بۆ کەمپی ئێستای زانکۆی گەرمیان ، سەرەتا بەشەکانی زمانی کوردی ، مێژوو ، زمانی ئینگلیزی ، بەشەکانی جوگرافیا و دەروونناسیش لە بینای سەرۆکایەتی دووی زانکۆ بوون ، ئینجا دوای تەواوبوونی بینای کۆلێجی پەروەردەی ئێستا سەرجەم بەشەکانی زانکۆ گوێزرانەوە بۆ کەمپی زانکۆ ، تەنها تاقیگەکان لە شوێنی خۆیان لە بینای کۆنی کۆلیج بۆ ماوەیەک مانەوە ، ژمارەی دەرچووان لەم کۆلێجەدا لەسەرەتای دروستبوونییەوە تا کۆتایی ساڵی خوێندنی ٢٠١٩/٢٠١٨ (٦٤٣٦) شەش هەزار و چوارسەد و سی و شەش خوێندکارە ، کە بڕوانامەی بەکالۆریۆسیان لەبەشە جیاجیاکانی کۆلێجی پەروەردە بەدەستهێناوە .

٢- کۆلێجی زمان و زانستەمرۆڤایەتییەکان / خانەقی :



ماوەیەکی کەم دوای کردنەوەی کۆلێجی پەروەردەی کەلار و بەپێی فەرمانی وەزاری ژمارە ( ٣٨٨٣/١/٦) لە ( ١٩ / ٩ / ٢٠٠٤) کۆلێجی زمان لە شاری خانەقی کرایەوە ، سەرەتا تەنها بەشی کوردی بوو دواتر ناوەکەی گۆڕا بۆ ئاداب و بەشەکانی زمانی عەرەبی و زمانی ئینگلیزی و جوگرافیا و دەروونناسی و مێژووی تێداکرایەوە ، شوێنی ئەم کۆلێجە لە ناوبازاڕی شاری خانەقی و نزیک مزگەوتی ( ئەبو حەفصە) بوو ، دواتر گوێزرایەوە بۆ بینای قوتابخانەیەک لە تۆڵەفرۆش و دواجارگوێزرایەوە بۆ بینای ئێستای کۆلێجی زمان و زانستەمرۆڤایەتییەکان . ژمارەی دەرچوانی ئەم کۆلێجە لەسەرەتای دامەزراندنییەوە تا کۆتایی ساڵی خوێندنی ٢٠١٨/٢٠١٩ ( ٣٦٦٢ ) سێهەزار و شەشسەد و شەست ودوو خوێندکارە، کە بڕوانامەی بەکالۆریۆسیان بەدەستهیناوە .

٣- کۆلێجی پەروەردەی بنەڕەت :

لە ساڵی ٢٠٠٧ کۆلێجی پەروەردەی بنەڕەت بەپێی فەرمانی وەزاری ژمارە ( ) لە (  ) دامەزرا و بەشەکانی (زمانی کوردی ، زمانی عەرەبی ، زانستە کۆمەڵایەتییەکان ، بەشی وەرزش)ی لەخۆدەگرت و لە ٢٠١٥ بەشی باخچەی ساوایانی تێدا کرایەوە . شوێنی ئەم کۆلێجە سەرەتا لە بینای پەیمانگای مەڵبەندیی مامۆستایانی کەلار بوو تا گوێزرایەوە بۆ کەمپی زانکۆ بۆ ئەو

شوێنەی ئێستای ، ژمارەی دەرچوانی ئەم کۆلێجە لە سەرەتای دامەزراندنییەوە تا کۆتایی ساڵی خوێندنی ٢٠١٩/٢٠١٨ (١٧٧٠) خوێندکارە ، کە بڕوانامەی بەکالۆریۆسیان بەدەستهێناوە .



٤- کۆلێجی پەروەردەی وەرزش :





کۆلێجی پەروەردەی وەرزش بەپێی فەرمانی وەزاری ژمارە (٧ / ٥ / ١٢٤٢٧ ) لە (٢٧ / ٩ / ٢٠٠٨ ) لە شاری خانەقی کرایەوە ، شوێنی ئەم کۆلێجە دەکەوێتە گەڕەکی عەلەمدار. لە ساڵی٢٠١٩ ناوی ئەم کۆلێجە گۆڕا بۆ (کۆلێجی پەروەردەی جەستەیی و زانستە وەرزشییەکان) ژمارەی ئەوخوێندکارانەی بڕونامەی بەکالۆریۆسیان لەم کۆلێجە بەدەستهیناوە (٣٣٠) خوێندکارە .

## ٥- کۆلێجی پەروەردەی بنەڕەتی ئێواران :

ئەم کۆلێجە بەپێی فەرمانی زانکۆیی ژمارە (٣٨٠٥ ) لە ٢٠١٢ دامەزراوە و بەشەکانی ( زمانی کوردی ، زمانی عەرەبی ، زمانی ئینگلیزی ، زانستە کۆمەڵایەتییەکان ، پەروەردەی وەرزش ، بیرکاری ، و دواتر بەشی باخچەی ساوایانی تێداکرایەوە ) . ژمارەی دەرچووانی ئەم کۆلێجە لەسەرەتای دروستبوونییەوە تا کۆتایی ساڵی خوێندنی ٢٠١٩/٢٠١٨ (٤٤٢) خوێندکارە ، کە بڕوانامەی بەکالۆریۆسیان بەدەستهێناوە .

## ٦- کۆلێجی زانستە ئەندازیارییە کشتوکاڵییەکان / کفری:

ئەم کۆلێجە سەرەتا تەنها بەشێک بوو ئەویش بەشی سامانی ئاژەڵ بوو ، کە بەپێی فەرمانی وەزاری ژمارە ١٠٣٨٩ لە ٢٧/ ٥/ ٢٠١٣ لەشاری کفری کرایەوە ، دواتر بەپێی فەرمانی وەزاری ژمارە (٢٢٣٧) لە ٣١ / ١٢ / ٢٠١٣ کۆلێجی کشتوکاڵی کفری کرایەوە ، بەشەکانی (سامانی ئاژەڵ ، بەشی بەروبوومی کێڵگەیی ) تێدایە . شوێنی ئەم کۆلێجە دهکەوێتە ناوکتێبخانەی گشتی شاری کفرییەوە . ژمارەی دەرچوانی ئەم کۆلێجە لەسەرەتای دروستبوونییەوە تا کۆتایی ساڵی خوێندنی ٢٠١٩/٢٠١٨ ( ١٥٥ ) خوێندکارە ، کە بڕوانامەی بەکالۆریۆسیان بەدەستهێناوە.
کۆلێجی زانستە ئەندازیارییە کشتوکاڵییەکان لە ئێستادا خاوەنی ئەم پرۆژانەیە :
١- پرۆژەی بەخێوکردنی ماسی لە بەنداوی باوەشاسوار .
٢- پرۆژەی بەخێوکردنی مریشک و سوێسک .
٣- پرۆژەی پەروەردەکردنی هەنگ .

## ٧- کۆلێجی زانست :



ئەم کۆلێجە سەرەتا و لەساڵی ٢٠١٣ بە بەشی کۆمپیوتەر دەستپێکرد ولەساڵی ٢٠١٥ بەشی کیمیا کرایەوە ، هەر هەمانساڵ کۆلێجی زانست بەپێی فەرمانی وەزاری ژمارە ( ١٠٤٤) لە (٢٠١٥/٨/١٠ ) کرایەوە ، ئێستا جگە لەو دووبەشە و لەساڵی خوێندنی (٢٠١٧ – ٢٠١٨ )ەوە بەشی (IT) تێیداکراوەتەوە . شوێنی ئەم کۆلێجە لە کەمپی زانکۆیە . ژمارەی دەرچووانی ئەم کۆلێجە لەسەرەتای دروستبوونییەوە تا کۆتایی ساڵی خوێندنی ٢٠١٩/٢٠١٨ (١٨٤) خوێندکارە ، کە بڕوانامەی بەکالۆریۆسیان بەدەستهێناوە .

## ٨- کۆلێجی پزیشکی :

لەساڵی ٢٠١٨ و بەپێی فەرمانی وەزاری ژمارە ( ١٣٦٥ ) لە ( ٢٠١٧/٩/٢٨ ) کۆلێجی پزیشکی لە زانکۆی گەرمیان کرایەوە و تەنها یەک بەش لەخۆدەگرێت ئەویش بەشی (پزیشکی گشتی) یە ، ئێستا دوو قۆناغیان هەیە و ژمارەی خوێندکارانی قۆناغی یەکەم (٥١) و قۆناغی دووەم (٣٤) خویندکارە .

## ٩- کۆلێجی کۆمپیوتەر و تەکنۆلۆجیای زانیاری / خانەقی :

ئەم کۆلێجە بەپێی فەرمانی وەزاری ژمارە ( ٥٤٢٠) لە (٢٠١٩/٤/١٠ ) لەشاری خانەقی کرایەوە و بەشەکانی ( تەکنۆلۆجیای زانیاری ) و (نیتۆرک، Network ) ین .

لە زانکۆی گەرمیاندا بەشی ئەندازیاری بیناکاری هەیە کە تا ئێستا نەبووە بە کۆلێجێکی سەربەخۆ و ڕاستەخۆ پەیوەستە بە سەرۆکایەتی زانکۆوە ، ئەم بەشە بەپێی فەرمانی وەزاری ژمارە ( ١٠٣٩١) لە ٢٧ / ٥/ ٢٠١٣ دامەزراوە . شوێنی ئەم بەشە لە کەمپی زانکۆیە لەناو بینای کۆلێجی زانست ، لەم بەشەدا ( ٤٢ ) خوێندکار خوێندنیان تەواوکردووە و بڕوانامەی بەکالۆریۆسیان بەدەستهێناوە .

بەشی یاسا ، ئەم بەشە بەپێی فەرمانی وەزاری ژمارە (٣٥٩) لە (٣٠ /٣/ ٢٠١٦ ) کراوەتەوە تەنها یەک ساڵ خوێندکاری وەرگرت واتە ساڵی ٢٠١٦-٢٠١٧ و ژمارەی خوێندکارانی بەیانیان ٥٩ خویندکار و ئیواران ٢٨ خویندکاربوون ، و ئیتر خوێندنی تێدا هەڵپەسێردرا تا ساڵی خوێندنی ٢٠١٩ / ٢٠٢٠ دووبارە خوێندکاری وەرگرتەوە . شوێنی ئەم بەشە لەکەمپی زانکۆیە لەناو بینای کۆلێجی زانست .

لەزانکۆی گەرمیاندا کۆمەڵگای تاقیگەکان هەیە و ٣٨ تاقیگەی جۆراوجۆری تایبەت بە بەشە زانستییەکانی (کیمیا ، بایۆلۆجی ، ئەندازیاری ، کشتوکاڵ ، کۆمپیوتەر و زمانی ئینگلیزی) تێدایە، وانە پراکتیکییەکانی ئەو بەشانە لەو تاقیگانەدا دەخوێنرێت.

تاقیگەیەکی بەشی بایۆلۆجی :




سەنتەرەکانی زانکۆی گەرمیان

١- سەنتەری توێژینەوەی زانکۆی گەرمیان بەپێی فەرمانی زانکۆیی( ) لە ( )کراوەتەوە .



ئامانجەکانی :

ئامانجی ئەم سەنتەرە بەرزڕاگرتنی ڕانکی زانکۆی گەرمیانە لە ئاستی زانکۆ پێشکەوتوەکانی جیهاندا، لەڕێگەی ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی بە کوالیتی بەرز.

١- بە جیهانی بوونی زانکۆی گەرمیان و بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی.

٢- کۆکردنەوەی مامۆستایانی ئەکادیمی بەئەزموون لە یەک ناوەندی توێژینەوەدا.

٣- پەرەپێدان بە توێژینەوەی زانستیی کواڵیتی بەرز.

٤- دابینکردنی پاڵپشتی دارایی بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی.

٥- دەستنیشان کردن وپلاندانان بۆ چارەسەرکرنی کێشەکان لە ڕێگای ئەنجامدانی توێژینەوەوە.

٦- ئاسانکاری بۆ ئەنجامدانی توێژینەوە لە لایەن خوێندکارانی ماستەر ودکتۆرا لە ناو ودەرەوەی زانکۆدا.

٧- دروستکردنی پرۆژەی وەبەرهێنان بۆ دابینکردنی سەرچاوەی دارایی.

٨- ئەنجامدانی کۆنفرانس وسیمینارو ۆرکشۆپی زانستی بۆ مامۆستایان لە ناوەوە و دەرەوەی زانکۆ.

٩- دروستکردنی پردی پەیوەندی لەگەڵ ناوەندەکانی توێژینەوە و زانکۆکانی ناوەوە و دەرەوەی هەرێمی کوردستان وعێراق.

٢- سەنتەری زمان : بەپێی فەرمانی وەزاری ژمارە (٨٨١٤/٢) لە (٢٠١٦/٦/٨) و بە پێی فەرمانی زانکۆیی ژمارە (١٧٨٢) لە ڕێکەوتی (٢٠١٦/٧/٢٥) کراوەتەوە .

زانکۆی گەرمیان لە ئێستادا خاوەنی دوو گۆڤاری زانستییە بەناوەکانی (گۆڤاری زانکۆی گەرمیان ) کە تایبەتە بە توێژینەوەکانی زانستە مرۆڤایەتییەکان و گۆڤاری ( Passer ) کە تایبەتە بە زانستە پەتییەکان .



زانکۆی گەرمیان خاوەنی سایتێکی ئەلکترۆنی پێشکەوتووە ، کە زانیاریی زۆری تایبەت بە زانکۆ و کۆلێجەکان ، بڵاوکراوەکان ، توێژینەوەی زانستیی و چالاکییەکان ...تد .تێدایە و لەئێستادا سەرچاوەیەکی گرنگی بەدەستهێنانی زانیارییە و دەیان هەزاران کەس سەردانی ئەو سایتەیان کردووە .




لە ئامادەکردنی ئەم بابەتە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:

١- ڕێبەری خوولەکانی ( ٢٣ ، ٢٤ ، ٢٥، ٢٦ ، ٢٧، ٢٨، ٢٩ )ی دەرچووانی زانکۆی سلێمانی .

٢- ڕێبەری خوولەکانی ( ١، ٢، ٣، ٤، ٥ ) ی دەرچووانی زانکۆی گەرمیان .

٣- سایتی زانکۆی گەرمیان http://garmian.edu.krd/#

٤- هەندێک زانیاری پێویست کەبەردەستنەبوو بەسوپاسەوە لەم بەڕێزانەمان وەرگرت:

ا- بەڕێز (پ.ی.د. عومەر یونس ) ڕاگری کۆلێجی زانست .

ب- بەڕێز(پ.ی.د. ئاسۆلطیف عزیز) ڕاگری کۆلێجی زمان و زانستەمرۆڤایەتییەکان . خانەقی .

پ- بەڕێز (د. عەلی جەبار) ڕاگری کۆلێجی کۆمپیوتەر و تەکنۆلۆجیای زانیاری) خانەقی .

ت- بەڕێز (م. کۆمار ئەکبەر) سەرۆکی بەشی بەروبوومی کێڵگەیی .

ح- بەڕیز م. سەلام ڕەحیم ، بەڕیوەبەری نووسینگەی سەرۆکی زانکۆ .

# جێگۆڕکێو ئەرکگۆڕکێو فۆرمگۆڕکێی جێناوە لکاوەکان له دروسته مۆرفۆسینتاکسییەکاندا (بە کەرەستەی شێوەزاری گەرمیان)



پ.ی.د. ئومێد بەرزان برزو

زانکۆی گەرمیان ـ کۆلێجی پەروەردە ـ بەشی زمانی کوردی

شێوەزاری گەرمیانی بە یەکێک لە شێوەزارەکانی زاری کرمانجیی ناوەڕاست ناودەبرێت، سنوری جوگرافی ئەو ناوچانەش دەگرێتەوە، کە (کەرکوکو چەمچەماڵو قەرەهەنجیرو شوانو قادرکەرەمو لەیلانو قەرەحەسەنو تەکیەو سەنگاوو دەوروبەریان لە باکور تا دێتە خوارەوەو دەگاتە داقوقو دوزخورماتوو کفریو قەرەتەپەو جەبارەو سەرقەڵاو ڕزگاریو کەلارو جەلەولاو دەوروبەریان لە باشور) قسەی پێدەکەن.

شایانی باسە، ژمارەیەکی زۆری سەرچاوە کوردیو بیانییەکان باسی دابەشکردنی زارو شێوەزارەکانی زمانی کوردییان کردوە، هەریەکەیان بۆچونی خۆی لەو بارەیەوە خستوەتەڕو، سەبارەت بە دەستنیشانکردنی ناوو شوێنی جوگرافی ئەم شێوەزارە، لە هەندێکیاندا ئاماژە بۆ شێوەزاری گەرمیانی کراوەو لە هەندێکی تریاندا ناوی شێوەزاری کەرکوکی بەکارهێنراوە، بەڵام لە هەندێ سەرچاوەدا ناوی هیچ لەمانە نەهاتوە. لە ڕاستیدا شێوەزاری گەرمیانی بە یەکێک لە شێوەزارەکانی ناوەڕاست ناودەبرێتو سنورێکی جوگرافیی بەرفراوانی هەیە، وەکو لە سەرەوە ئاماژەمان پێداو چەندین بێچوە یان بەشە شێوەزاری لێدەبێتەوە. تەنانەت شێوەزاری کەرکوکی شێوەیەکە لە زاری گەرمیانیو لەناو شاری کەرکوکیشدا چەند بێچوە شێوەزارێک واتە شێوەئاخاوتنێک بەرچاودەکەوێ.

جێناوەکان وەکو دانەیەکی فەرهەنگی دەبنە سەرەی فرێزی جێناوی، واتە سادەترین دروستەی فرێزی جێناوی لە جێناوێك پێکدێت‌و لە ڕستەدا هەمو ئەرکە سینتاکسییەکان دەبینێت، بۆیە بە کاتیگۆرییەکی سینتاکسی ناودەبرێت. ئاشکرایە جێناوە کەسییەکانیش لە زارێکدا یان شێوەزارێکدا لە ڕوی ژمارەو فۆرمو ئەرك‌و تایبەتییەوە جیاوازییان هەیە، ئەم جێناوە کەسییەکانیش وەك بەشێکی گرنگی ئاخاوتن ڕۆڵ‌و تایبەتمەندیی ڕێزمانیی خۆیان لە دروستە سینتاکسی‌و مۆرفۆسینتاکسییەکاندا دەبینن، لەم توێژینەوەیەدا فۆرمی جێناوە کەسییەکان دەستنیشاندەکەین، پاشان باسی جێگۆڕکێ‌و ئەرکگۆڕکێ‌و فۆرمگۆڕکێی جێناوە کەسییە لکاوەکان لە ڕستە مۆرفۆسینتاکسییەکان دەکەین.

### ١) فۆرمی جێناوە کەسییەکان:

جێناوە کەسییەکان دەکرێن بە دو بەشەوە:

ا- جێناوە کەسییە سەربەخۆکان.

ب- جێناوە کەسییە لکاوەکان.

دەتوانرێت جێناوە کەسییەکان بەپێی کەس‌و ژمارە لە شێوەزاری گەرمیان لەم خشتەیەدا بخرێنەڕو، بەم شێوەیە:

| ژمارە | کەس | جودا | لکاو A | لکاو B |
|---|---|---|---|---|
| ١ | تاك | من | م | م |
| ٢ | | تو | ت | ی/یت |
| ٣ | | ئەم (نزیك)<br>ئەو (دور) | ی | ا/ات - ێ/ێت ، Ø |
| ١ | کۆ | ئێمە | مان | ین |
| ٢ | | ئێوە | تان | ن |
| ٣ | | ئەمان (نزیك)<br>ئەوان (دور) | یان | ن |

خشتەی ژمارە (١)

### ٢) سەرەوڕیزبون‌و جێگیرکردنی جێناوە لکاوەکان:

سەرەوڕیزکردنی کەرەستەکان لە دروستەی قوڵی ڕستە سینتاکسییەکاندا خاوەنی شەش قاڵبی بنچین. هەریەکە لەم قاڵبانە بە دانەی فەرهەنگی پڕکراونەتەوەو دروستەی ڕستەی تەواو لە دروستەی قوڵدا بەرهەمدەهێنن، لەکاتی گوێزانەوەی هەندێ لەم قاڵبانە لە دروستەی قوڵەوە بۆ دروستەی ڕوکەش‌و جێبەجێکردنی یاساکانی گوێزانەوە، دەتوانرێت بەشێك لە کەرەستەکانی ناو ڕستە سینتاکسییەکان بە جێناوی لکاو جێگیربکرێن، بەتایبەتی جێکەوتەکانی بەرکارو سەربارو تەواوکەرو دیارخراوو دیارخەر کە بە فرێزی ناوی یان فرێزی جێناوی پڕکراونەتەوە، بەمەش ڕستەی

مۆرفۆسینتاکسی لە دروستەی ڕوکەشدا بەرهەمدەهێنن، بۆ خستنەڕوی چۆنێتی سەرەوڕیزبونو دابەشبونی جێناوە لکاوەکان لە ڕستە مۆرفۆسینتاکسییەکاندا، لەم خاڵانەدا باسیان دەکەین:

١- فرێزی بکەری لە دروستەی هەمو ڕستەیەکدا جێکەوتەیەکی چەسپاوی هەیەو لە سەرەتای ڕستەوە دەردەکەوێتو بەپێی کەسو ژمارەی خۆی جێناوێکی لکاو هەڵدەبژێرێت، هەر بۆیە جێناوە لکاوەکە وەك فۆرمێکی فەرهەنگی ناو کردارەکە لە دروستەی قوڵدا هەمان کەسو ژمارەی فرێزە بکەرییەکە دەنوێنێت، بۆ نمونە:

ا- ئێمە کوچکەکەمان لابرد.

ب- مناڵەکە ئاشەکە ئەخوا.

پ- مناڵەکە ترسیاØ.

ت- ئەوان ئەکەون.

لە نمونەکانی (ا ب پ ت)دا فرێزە بکەرییەکان لە فۆرمی کەرەستەی فەرهەنگی سەربەخۆ لەگەڵ فۆرمی جێناوە لکاوەکاندا دەرکەوتونو هەمان کەسو ژمارەش دەنوێنن، بۆیە دەتوانرێت فرێزە بکەرییەکان لە دروستەی ڕوکەشدا دەرنەبردرێنو (pro) لە شوێنیان دابنرێت:

ا- pro کوچکەکەمان لابرد.

ب- pro ئاشەکە ئەخوات.

پ- pro ترسیاØ.

ت- pro ئەکەون.

٢- هەروەها فرێزی بەرکاریش لە دروستەی قوڵی ڕستەی سینتاکسیدا لە فۆرمی فرێزی ناوی یان فرێزی جێناویدا دەردەکەوێت، دەتوانرێت بە جێناوی لکاو لە دروستەی ڕوکەشدا جێگیربکرێت، بڕوانە نمونەی (١)و (٢).




نمونەی (١)




نمونەی (٢)

لە نمونەی یەکەمدا لەکاتی گوێزانەوەی ڕستەکە لە دروستەی قوڵەوە بۆ دروستەی ڕوکەش، دەبینین فرێزی بەرکاری بە جێناوێکی لکاوی هەمان کەس و ژمارە لە دەستەی یەکەم جێگیرکراوەو چووەتە کۆتایی کردارەکەوە، واتە لە شێوەزاری گەرمیاندا جێناوی لکاوی بکەری و بەرکاری لە دەستەی یەکەم دەبن، بەمەرجێ کردارێکی ڕابردوی تێپەڕ بێت، بڕوانە یاسای ژمارە (١).

| کرداری بنەڕەتی + جێناوی لکاوی بەرکاری + جێناوی لکاوی بکەری |
|---|
| (A) (A) |
| یاسای ژمارە ـ ١ ـ |

لە نمونەی دووەمدا کرداری ڕستەکە ڕانەبردوی تێپەڕەو جێناوی لکاوی بکەری لە دەستەی دووەمە، لەکاتی گوێزانەوەی ڕستەکەو بەکلیتیککردنی فرێزی بەرکاری لە ڕستە مۆرفۆسینتاکسییەکەدا، دیسان فرێزە بەرکارییەکە بە جێناوێکی لکاو لە دەستەی یەکەم جێگیرکراوە، بەڵام چووەتە سەر ئەسپێکتی بەردەوامی (ئە)، بڕوانە یاسای ژمارە (٢).

| ئەسپێکتی (ئە) + جێناوی لکاوی بەرکاری + کرداری بنەڕەتی + جێناوی لکاوی بکەری |
|---|
| (A) (B) |
| یاسای ژمارە ـ ٢ ـ |

واتە بەکلیتیککردنی فرێزە بەرکارییەکان لەکاتی گوێزانەوەیان لە دروستەی قوڵەوە بۆ دروستەی ڕوکەش و جێگیرکردنیان لەناو دروستەی کردارەکەدا، هەمیشە لە دەستەی یەکەم دەبن، ئەگەر چی کردارەکان ڕابردو یان ڕانەبردوی تێپەڕ بن.

٣- ئەگەر فرێزی بەند لە ئەرکی تەواوکەر یان سەربار بە جێناوی لکاو جێگیربکرێت، ئەوا فرێزەکە نزمدەکرێتەوە بۆ دەستەواژەیەکی مۆرفۆسینتاکسی، بڕوانە نمونەی (١)و (٢).




نمونەی (١)




نمونەی (٢)

لە نمونەکانی (١)و (٢)دا دەردەکەوێت، کە دەتوانرێت فریزە بەندییەکان لە ئەرکی تەواوکەر یان سەربارادا نزمبکرێنەوە بۆ دەستەواژەیەکی مۆرفۆسینتاکسیو فریزە ناوییەکان یان فریزە جێناوییەکانی دوای پێشبەندەکان بەپێی کەسو ژمارە لە دەستەی یەکەم جێگیربکرێنو هەمیشە بە پێشبەندەکانەوە دەنوسرێنو جێگیردەبن، ئەگەر چی کردارەکان ڕابردو یان ڕانەبردو، تێپەڕ یان تێنەپەڕ بن.

٤- فریزی خاوەنێتی وەکو دیارخەری پاشەوەی سەرەی فریزی ناوی کە لە فۆرمی کەرەستەیەکی فەرهەنگیدا دەردەکەوێتو بەیاریدەی مۆرفیمی خستنەسەری (ی) بە ناوەکەوە دەبەسترێتەوە، دەتوانرێت بە جێناوێکی لکاو جێگیربکرێت، بڕوانە نمونەی (١)و (٢).




نمونەی (١)




نمونەی (٢)

نمونەکان ئەوە دەخەنەڕو، کە هەمیشە فرێزی خاوەنێتی بەپێی هەمان کەس‌و ژمارەی خۆی بە جێناوێکی لکاوی سەر بە دەستەی یەکەم جێگیردەکرێت‌و بە ناوە دیارخراوەکەوە دەنوسێت، لەم بارەشدا مۆرفێمی (ی)ی خستنەسەر دەقرتێنرێت.

٥- هەروەها سەرەی فرێزی ناوی یان فرێزی جێناوی کە لە پێشەوەو لە دروستەی قوڵدا بە دیارخەرەکانی فرێزی ڕادە (گشت، ...)و ژمارە (پلەیی، کەرتی)و ناوی ئاوەڵکرداری (ژێر، بەرانبەر، ...) فراواندەکرێن، دەتوانرێت بە جێناوی لکاو لە دروستەی ڕوکەشدا جێگیربکرێن‌و بە دیارخەرەکەوە دەنوسن، بڕوانە نمونەی (١)و (٢).




نمونەی (١)




نمونەی (٢)

٦- ئەگەر فرێزی خاوەنێتیو فرێزی بەند بە جێناوی لکاو جێگیربکرێن، ئەوا لە هەمان شوێنی خۆیان لە دەستەی یەکەم دەردەکەون، بڕوانە نمونەکانی (١)و (٢).

(١) ا- کاوە خانییەکەی منی وە ئەوان فرۆشت.

ب- کاوە خانییەکەمی پێیان فرۆشت.

(٢) ا- کاوە پارەکەی ئێمە بۆ ئەوان ئەتێرێ.

ب- کاوە پارەکەمان بۆیان ئەتێرێ.

٧- هەروەها فرێزی بەرکاریو فرێزی بەند بە جێناوی لکاو جێگیردەکرێن، بڕوانە نمونەکانی (١)و (٢).

(١) ا- من ئەوانم بۆ تو نارد.

ب- pro t ناردیانـم بۆت.

(٢) ا- من ئەوان بۆ تو ئەگرم.

ب- pro t ئەیان گرم بۆت.

لە نمونەکانی (١-ا ب)دا، کرداری ڕستەکە ڕابردوی تێپەڕەو لە نمونەکانی (٢-ا ب)دا، کە کرداری ڕانەبردوی تێپەڕە، فرێزە بەرکاریو فرێزە بەندەکان بە جێناوی لکاو لە دەستەی یەکەم جێگیرکراون، لە نمونەی (١-ب)و (٢-ب)دا جێناوی لکاوی بەرکاریو لەگەڵ خۆیدا جێناوی لکاوی بکەریش دەچنە ناو دروستەی کردارەکەوە، بەڵام جێناوی لکاوی پێشبەندی بە پێشبەندەکەوە دەنوسێتو جێگیردەبێت.



### ٣) جێگۆڕکێی جێناوە لکاوەکان:

ئاماژە بەوە درا، کە لەکاتی گوێزانەوەی ڕستەکان لە دروستەی قوڵەوە بۆ دروستەی ڕوکەش، چەند کەرەستەیەکی ناو ڕستەکە لە فۆرمێکی سەربەخۆوە بۆ فۆرمێکی لکاو جێگیردەکرێنو بەم پرۆسەیەش دەوترێ بەنوسەککردن (بەکلیتیککردن)، لەم شێوەزارەداو لە ئەنجامی خستنەڕوی نمونەکاندا، کە جێناوە لکاوەکان لە ئەرکی بکەریو بەرکاریو تەواوکەرو سەربارو دیارخراوو دیارخەردا دەردەکەون، هەندێکیان لە شوێنی خۆیاندا دەمێننەوەو جێگۆڕکێ ناکەن وەك جێناوی لکاوی بکەری لە کردارەکانی ڕابردوی تێنەپەڕو ڕانەبردوی تێپەڕو تێنەپەڕدا، کە هەمیشە بە کۆتایی کردارەکانەوە دەنوسن، جێناوی لکاوی پێشبەندی لە ئەرکی تەواوکەرو سەربارد، کە هەمیشە بە پێشبەندەکەوە دەنوسێت، هەروەها لە جێناوی لکاوی دیارخەرو دیارخراوشدا، بەڵام هەندێکی تریان شوێنی خۆیان لەناو دروستەی ڕستەکەدا دەگۆڕن، وەك جێناوی لکاوی بکەری لە کرداری ڕابردوی تێپەڕداو جێناوی لکاوی بەرکاری، بڕوانە ئەم بارانەی خوارەوە:

١- ئەگەر فرێزی بەرکاری لە ڕستەکەدا لابرێت، ئەوا جێناوی لکاوی بکەری دەچێتە پاش فرێزی بەندەوە، بەمەرجێ کردارەکە ڕابردوی تێپەڕ بێت، بۆ نمونە:

ا- کتابێکیان بۆ من هاورد.

ب- pro بۆ منیان هاورد.

پ- pro بۆمیان هاورد.

له نموونەکانی (ب پ)دا پاش لابردنی فرێزی بەرکاری، جێناوی لکاوی بکەری (یان) دەچێتە پاش فرێزە بەندەکەوە. هەروەها بە لابردنی فرێزە پێشبەندەکەش، ئەوا جێناوەکە دەچێتە کۆتایی کردارەکەوە:

ت- pro pro هاوردیان.

٢- کاتێ فرێزە بەرکارییەکان بە جێناوێکی لکاو لە دروستەی ڕوکەشدا جێگیرکران‌و کرداری ڕستەکانش چ ڕابردو یان ڕانەبردوی تێپەڕی بنەڕەتی بن، هەمیشە لە دەستەی یەکەم دەبن، دەبینین لە کرداری ڕابردوی تێپەڕی بنەڕەتیدا جێناوی لکاوی بەرکاری‌و پاشان جێناوی لکاوی بکەری شوێنی خۆیان دەگۆڕن‌و دەچنە کۆتایی کردارەکەوەو ڕستەکەش لە قاڵبی (کردار + جێناوی بەرکاری + جێناوی بکەری)دا دەردەکەوێت، بەڵام لە کرداری ڕانەبردوی تێپەڕی بنەڕەتیدا جێناوی لکاوی بەرکاری دەچێتە دوایی ئەسپێکتی (ئە)وە، ڕستە کورتکراوەکەش لە قاڵبی (ئە + جێناوی بەرکاری + کردار + جێناوی بکەری)دا دەردەکەوێت، وەك پێشتر بە نموونەوە باسمانکردن، بەڵام ئەگەر ڕۆنانی کردارەکان داڕێژراو یان لێکدراو بن، بڕوانە نموونەکانی (١-١ ب)و (٢-١ ب).




نموونەی (١-١)




نموونەی (١-ب)




**نمونەی** (٢-ا)




**نمونەی** (٢-ب)



لە نمونەکانی (١-١ ب)دا کرداری ڕستەکان ڕابردوی تێپەڕن، لە نمونەی (١-١) ڕۆنانی کردارەکە داڕێژراوە، کاتێ فرێزی بەرکاری بە جێناوێکی لکاو لە دەستەی یەکەم جێگیردەکرێت، ناچێتە کۆتایی کردارەکەوە، بەڵکو خۆیو جێناوە لکاوە بکەرییەکە دەچنە دوایی پێشگری کردارە داڕێژراوەکەوە، هەروەها لە نمونەی (١-ب)دا ڕۆنانی کردارەکە لێکدراوە، بە هەمان شێوە هەردو جێناوەکە دەچنە پاش بەشی یەکەمی کردارە لێکدراوەکەوە، بڕوانە یاسای ژمارە (٣).

پێشگری کرداری دارێژراو یان + جێناوی لکاوی + جێناوی لکاوی + کردار
بەشی یەکەمی کرداری لێکدراو بەرکاری بکەری

یاسای ژمارە ـ ٣ ـ

بەڵام لە نمونەکانی (٢-١ ب)دا کرداری ڕستەکان ڕانەبردوی تێپەڕن، لە نمونەی (٢-١) ڕۆنانی کردارەکە دارێژراوەو لە نمونەی (٢-ب) ڕۆنانی کردارەکە لێکدراوە، کاتێ فریزە بەرکارییەکان بە جێناوی لکاو لە دەستەی یەکەم جێگیردەکرێن، ئەوا دەچنە سەر پێشگری کردارە دارێژراوەکە یان بەشی یەکەمی کردارە لێکدراوەکە، بڕوانە یاسای ژمارە (٤).

پێشگری کرداری دارێژراو یان + جێناوی لکاوی + کردار + جێناوی لکاوی
بەشی یەکەمی کرداری لێکدراو بەرکاری بکەری

یاسای ژمارە ـ ٤ ـ

٤ ) **ئەرکگۆڕکێ و فۆرمگۆڕکێ و جێگۆڕکێی جێناوە لکاوەکان:**

لە دروستەی ڕستە مۆرفۆسینتاکسییەکاندا، کە جێکەوتەی بەرکار بە جێناوی لکاو جێگیرکرا، دەتوانرێت دروستەی ئەم ڕستانە لە بکەردیارەوە بۆ بکەرنادیار بگوێزرێنەوە، بڕوانە (١)و (٢).




**نمونەی** (١-١)




نمونەی (١-ب)




نمونەی (٢-١)




**نمونەی (٢-ب)**

لە ئەنجامی شیکردنەوەی ڕستەکانو گواستنەوەیان بۆ ڕستەی بکەرنادیار، ئەوا:

١- جێناوە لکاوە بکەرییەکان لادەبرێن.

٢- ڕەگی هەر کردارێك وەردەگیرێتو نیشانەی نادیاری (ر)و نیشانەی کات بۆ ڕابردو (یا)و بۆ ڕانەبردو (ێ) دەخرێنەسەر.

٣- جێناوە لکاوەکانی (ت)و (مان) کە ئەرکی بەرکاریان لە ڕستە بکەردیارەکاندا بینیوە، شوێنی بکەر دەگرنەوەو دەبنە جێناوی بکەری ڕستە بکەرنادیارەکان، بەلاّم چەمکی بەرکاریی خۆیان نادۆڕێنن، ئەم دیاردە ڕێزمانییە بە (ئەرکگۆڕکێ) ناودەبرێت، چونکە لەم میکانیزمەدا ئەرکی جێناوە لکاوەکان لە بەرکارەوە دەگۆڕێن بۆ بکەر، کە کرداری ڕستەکان ڕابردوی تێپەڕنو ڕانەبردوی تێپەڕن. هەروەها جێناوە لکاوەکانی (ت)و (مان) کە لە دەستەی یەکەمن (A)، بە جێناوێکی لکاوی بەرانبەر بە هەمان کەسو ژمارەی دەستەی دووەم (B) دەگۆڕدرێنو دەبنە (یت)و (ین)، ئەم دیاردەیەش بە (فۆرمگۆڕکێ) ناودەبرێت، چونکە جێناوە لکاوەکان هەمان کەسو ژمارەن، تەنها فۆرمەکەیان لە (ت)و (مان)ەوە دەگۆڕێن بۆ فۆرمی (یت)و (ین)، پاشان جێناوەکان شوێنی خۆیان دەگۆڕنو دەچنە کۆتایی کردارە بکەرنادیارەکانەوەو هەمان کەسو ژمارەی بکەرە دەرنەبڕاوەکان دەنوێنن، ئەم دیاردەیەش بە (جێگۆڕکێ) ناودەبرێت.

## سەرچاوەکان:

١- ئومێد بەرزان برزو (٢٠١٠)، مۆرفۆسینتاکس‌و دروستەکانی لە شێوەزاری خانەقیدا، تێزی دکتۆرا، کۆلێجی زمان - زانکۆی سلێمانی.

٢- ئومێد بەرزان برزو (٢٠١١)، دروستەی فرێزو ڕستە لە زمانی کوردیدا، چاپخانەی گەنج، سلێمانی.

٣- سەرکەوت عەبدوڵڵا حوسێن (٢٠٠٨)، شێوەزارەکانی شاری کەرکووك، نامەی ماستەر، کۆلێجی پەروەردە - زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر.

٤- وریا عومەر ئەمین (٢٠٠٤)، ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر.



# سیتی مارکی شاری کەلار وەکو پێویستییەکی هەنوکەیی

د.خالد پالآنی

لە سەرەتای درووستبوونی مرۆڤایەتییەوە تاکەکان وکۆمەڵگەکان چی لەڕێگای هەڵکردنی ئاڵا یان دانانی هێما تواناولێهاتویی خۆیانیان نیشانداوە، دواتر لەقۆناغی گواستنەوەی شارستانیەتی لە گوندەوە بۆ شارۆچکە, هەروەها بۆ شارو پارێزگا دواتر بەرەو وڵات بوون چەندین بابەت درووستکرا بۆ ناساندنی ئەو وڵاتانە. قورئانی پیرۆز باسی تواناکانی میللەتی(عاد)ی لەشاری یەمەن کردوە, کە تائێستا شوێنەوارەکانیان ماوە(وێنە١)، هەروەها فیرعەونیەکان بە درووستکردنی هەڕەمەکان سەرسوڕمانی خەڵکی ئەمسەدەوسەدەکانی ڕابردوویانکردووە(وێنە٢).

گەلی کورد لە هەر چوار پارچەی کوردستان گرنگی دا بە درووستکردنی تەپۆڵکەو قەڵاو ودەروازە کە لەکوردستانی باشوور لە هەولێر(وێنە٣) وکەرکوک وقەڵای شێروانەی شاری کەلار(وێنە٤) سێ نمونەی جیاواز لەخۆی دەگرێت.

لە مێژووی کۆنی ناوچەکە چەندین تەلارویەکەر درووستکراون، زەقورەی سۆمەریەکان(٣-٤ هەزار ساڵ پێش زایین) وتاوەری بابلیەکان(دوو هەزار ساڵ پێش زایین) و شاری سامەڕا ٨٣٥ز (وێنە٥) نمونەن لەسەر مێژووی ئەم وڵاتە، بەڵام بەهۆی درێژەنەدان بەو کاری بیناسازییەوە وگرنگینەدان بەو مێژووە لەڕێگای درووستکردنی چەند هێمایەکی نوێ لە دەوروبەری ئەو شارە بووە هۆی پشتگوێخستنی ئەو شارانە.



1



2



3



لەجیهانی نوێدا بیناسازی وتەلارسازی پەرەپێدانی بەخۆیەوە بینیوە بەشێوەیەک پێشبرکێیەکی خێرا ڕوویداوە بەتایبەتی بەئاستی ستونی، تاوەر وێنەیەکی حاشا هەڵنەگرە لەناسنامەی شارو شارۆچکەکانی وڵاتانی جیهاندا بۆ نمونە تاوەری بیزا لە ئیتالیا ١١٧٣-١٣٧٢ز ، تاوەری واشنتن ١٨٨٥زو تاوەری ئیفل لە پاریس ١٨٨٩ز (وێنە٦).بەهۆی تاوەرە مۆدێرنەکانی جیهانەوە پێشبرکێیەکی ناوازە ڕوویداوە لەنێوان وڵاتاندا (وێنەی ٦-٨).تاوەری لۆتس (وێنە٨) لە کۆلۆمبیا بەشێوەی گوڵی لۆتسە کە لە ڕابردوو بەگوڵی فیرعەونیەکان ناسراوە و لەکۆلۆمبیا گوڵێکی باوە لەسروشتی ئەو وڵاتە.

زۆربەی شارە بەناوبانگەکانی جیهان لەئێستادا تاوەرێکی تایبەتیان هەیە،هەروەها لە شارە بچووکەکان هەوڵ دراوە لە چوار ڕێیانەکان وبازنە ودەروازەکانی شار پەیکەروتاوەری بچووک دابنرێت کە پێویستە سەرجەمیان گوزارشت بکات لە هێما و یادەوەرییەکی تایبەت بەو شارو ناوچەیە.

کەلاریش لەماوەی ڕابردوودا بە چەند قۆناغێک گەشەی کردووە بەتایبەت لە ساڵانی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو, دواتر لە ڕاپەڕینەوە تا پاش پرۆسەی

ئازادکردنی عیراق فراوانتربووە وناوبانگی دیاری پەیداکردووەوپێشکەوتنی باشی بەخۆیەوە بینیوە لە بوارەکانی ئاوەدانکردنەوە وخزمەتگوزاری. بەڵام تائێستا هیچ هێمایەکی سەرنجڕاکێشی نییە, جگە لە قەڵای شێروانە واتا هیچ هێمایەکی مۆدێرن وسەردەمیانەی بۆ درووستنەکراوە,کە

ببێتە بەشێک لە ناسنامەی شاری کەلار و گوزارشت بکات لە فراوانبوونو گەشەسەندنی, بەتایبەت وەکو سەنتەری ئیدارەی گەرمیان کە دانیشتوانەکەی داخوازن لە ئایندە بە پارێزگا بناسرێت.





## تاوەری خونچەی شار

دیارە لەماوەی ڕابردوو پاش گەشەسەندنێکی باش لە ڕووی شارستانیەتیەوە و پێشکەوتنی ناوچەی گەرمیان توشی پاشەکشێ بووە, بەهۆی قەیرانی داراییەوە و بوونی وەکو سەنگەری ڕووبەڕووبونەوەی تیرۆرستانیداعش، هەروەها دووری لە سەنتەری پارێزگاوە، پاش کەڵەکەبوونی کێشەکانی ڕێگاوبان ودواکەوتنی پرۆژەکانی وەبەرهێنان هەروەها وەستانی دامەزراندنی دەرچووان وپسپۆران لەسەرجەم جومگەو دامودەزگاکانی کوردستان ئەبینرێت , پێشکەوتن لەشاری کەلار خاوبوەتەوەلەسەرجەم بوارەکان, بەتایبەت شارەوانی و گەشتوگوزار وژینگە، هەروەها نەبوونی بودجەیەکی گونجاو بۆ جوانکردنی شار, ئومێدی دروستکردنی تاوەرێکی تایبەت بە کەلار یان گەرمیان کەمدەکاتەوە، لێرەوە گرنگی پرۆژەی دروستکردنی تاوەری خونچەی شار دەرئەکەوێت بەتایبەت بەبەکارهێنانی پارچەیەکی لەکارکەوتوو بۆ دەیان ساڵ, هەروەها هیچ زەرورییەتێک نییە بۆ بەکارخستنی لە ئایندە و ئەگەری زیاتر تێکچوونی ئەو پارچەیە لە ئارادایە(وێنە٩).

تاوەری خونچەی شار پێشنیارکرا لە یەکەمین کۆنفرانسی گەشەپێدانی گەرمیان کە لە یادی ئەنفالی ناوچەکەدا ئەنجامدرا لەلایەن پەیمانگەی تەکنیکی تایبەت لەکەلار. ئەم پرۆژەیە بریتییە



12



13





له گواستنەوەی ئەو تانكییە بۆ شوێنێكی گونجاو وئەنجامدانی هەندێ گۆڕانكاری بەمەبەستی گۆڕینی دیمەنەكەی بۆ دیمەنی گوڵی (شەقائقی نوعمان)(وێنە١٠) كە بەچەندین ڕەنگ وەكو سپی،سور، مۆر، پیازی وپەمەیی بەهاری ناوچە شاخاوییەكانی كوردستان ئەڕازێنێتەوە, بەتایبەت بە بەكارهێنانی ڕۆشنایی (مۆدێلی پرۆژە وێنە١١)، ئەم ڕاستییە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت كەزۆربەی تاوەرەكانی جیهان بە شەو دیمەنێكی جیاوازودڵڕفێنیان هەیە, ئەبێتە جێگای سەرنجی دانیشتوانی شارەكەوئەبێتە هۆی ڕاكێشانی گەشتیار ودرووستكردنی چەندین پرۆژەو ودەستەبەركردنی دەیان هەلیكار ودەبێتە چەقی گەشتیاریی شاری كەلارو وەكو هێمایەكی شار ئەناسرێت..

## شوێنی پێشنیاركراو بۆ تاوەری خونچەی شار:

پاش گفتوگۆکردن و وەرگرتنی ڕای پسپۆران بەتایبەت شارەزایانی شارەوانی, پێشنیارکرا ئەم پرۆژەیە درووست بکرێت لەشاری کەلار-بەرزایی بەردەسور -تەنیشت زانکۆ - سەرەوەی فلکەی دەروازەی شار (وێنە١٦و١٧).

پێداویستی وتایبەتمەندییەکانی تاوەری خونچەی شار.

• گواستنەوەی تانکی ناوبراو بۆ شوێنی مەبەست پاش دەستنیشانکردنی ئەو شوێنەو وەرگرتنی ڕەزامەندی لایەنە پەیوەندیدارەکان ودرووستکردنی بناغەیەکی کۆنکرێتی.
• دانانی پارچە نوێیەکان لە شێوەی گەڵا و پەپولە، هەروەها بەشی سەرەوەی تاوەر کە ٦مەتر بەرزییە.
• بۆیاخکردنی تاوەرەکە.
• دانانی ڕووناکی بەشێوەیەکی ئەندازەیی ببێتە هۆی جوانکردنی تاوەرەکەو بەخشینی دیمەنی خونچەی گوڵ بە ڕەنگە جیاوازەکانی گوڵی (شەقائقی نوعمان).
• ڕێکخستنی باخچەیەک لە دەوروبەری تاوەرەکە کە لە ئاسمانەوە دیمەنێکی تایبەت پیشانبدات.
• تێچووی ئەم تاوەرە پاش سوود وەرگرتن لە تانکی ناوبراو بەڕێژەی ٩٠٪ کەم ئەبێتەوە بە بەراورد بە تێچووی گشتی.


15


14

## پەیکەری سەماوەر وەکو هێمای شار:

لەکەلتوری وڵاتانی عەرەبیدا بەهۆی خواستی ئەو نەتەوەیەوە بۆ خواردنی قاوە ئەبینرێت گرنگی ئەدرێت بە (دەلەی قاوە)، وچەندین پەیکەری بۆ درووستکراوە لەزۆربەی شارو شارۆچکە عەرەبیەکان(وێنە١٢و١٣).بەبەراورد لەگەڵا کەلتوری گەلەکەمان سەرەڕای جیاوازی ڕای مێژوونووسان لەسەر ئامێری سەماوەر, بەڵام دیارە کە مێژوویەکی هاوبەشی هەیە وپەسەندکراوە لەکۆمەڵگاکەمان هەرچەندە تا ئێستا پەیکەری بۆ نەکراوە, بەڵام لەسەرجەم مۆزەخانەکان نمایش ئەکرێت وگرنگی پێ دەدرێت.

سەماوەر هێمایە بۆ نوێبوونەوەو سپێدەیەکی نوێیمالاَنە، لە شارو شارۆچکەو دێهاتەکان سەرلەبەیانی ئاگری سەماوەرەکانیان دائەگیرسێنن وچای بەیانی ئامادە دەکەن وناومالّەکانیان شێدار دەکەن بە هەلّمەکەی.

## شوێنی پێشنیارکراو بۆ پەیکەری سەماوەر:

بەهۆی پەیوەندی لەنێوان سەماوەرو سپێدە، پێشنیار ئەکەم پەیکەری سەماوەر درووست بکرێت لەسەنتەری شاری کەلار لە گۆرەپانی تەنیشتی قائیمقامیەتی شاری کەلار .

تایبەتمەندییەکانی پرۆژەی پەیکەری سەماوەر:

- نمونەی ئەم سەماوەرە وچەندین پارچەی دیکە وەرئەگیرێت لە نمونە کۆنەکانی مۆزەخانەی قەلاَی شێروانە(وێنە ١٤و ١٥).
- پەیکەری سەماوەری برۆنزی بەرزی ٦ مەترەوپانییەکەی ڕێژەییە لەگەلاَ سەماوەرە ڕەسەنەکە درووست ئەکرێت.
- پەیکەرەکە دائەنرێت لەسەر سینییەکی کەلتوری لێواری گرنجگرنجە بە شێوەی شەپۆل,لەکاتی پڕبوونی سینیەکە ئاو ئەرژێتە خوارەوە لە ڕێگەی ئەوگرنجگرنجانەوە, بەوەش دیمەنێکی جوان ئەبەخشێتە پەیکەرەکە .
- کۆی پەیکەرەکەدادەنرێت لە حەوزێکی ئاو بازنەیی وەکو ئەوەی لە بازنەچوار ڕێیانەکان درووستکراوە.
- سینیەکان دائەنرێت لەسەر چەند بەردی شەش پالّۆ کە لەشاخەکانی سەرتەک دەهێنرێت،لەناوەڕاستی حەوزەکە دادەنرێت.
- لەناو سەماوەرەکە تانکییەکی ئاو دادەنرێت و ئاوەکەی گەرم ئەکرێت بە هیتەری گیزەری کارەبایی یان بە خەلّوز لە ڕێگای ئاگردانێک لە بەشی خوارەوەی وەکو ئەوەی لەخودی سەماوەرەکە بونی هەیە.
- بەدانانی گلّۆپی ڕەنگاوڕەنگ لە ژێر سینی پەیکەرەکە شەوان جوانی زیاتر دەبەخشێتە پەیکەرەکە.


16


17



# قولەکانی سنووری قەزای کەلار و دەوروبەری

محمد علی کریم

کۆمەڵە قولەیەکی شێوە لوولەیی و قەبارە بچووکن , بە کەنار ڕوباری سیروانەوە لە سنووری قەزای کەلار و دەور و بەری بنیادنراون. ئەم قولانە لەلایەن شوێنەوارناسان (گە باقر و فۆاد سفر) بە (مفاتیل) ناو براوە, هەروەها لە زمانی کوردیدا جگەلەوەی بەم جۆرە بینایانە دەوترێت (قولە), بەهەمان شێوە بە واتای (قەڵای بچوک)یش دێت.



وێنەی قولەی (سەید محمود)

## شوێنی جوگرافیای قولەکان و باردۆخ و نۆژەنکردنەوەکانیان:

بە هۆی ڕووخان و نەمانی هەندێکیانەوە , ژمارەی قولەکان بە شێوەیەکی دروست نازانرێت. بەڵام بە پێ دوایین گەران و ڕوپێویمان (١٤) قولە دۆزراونەتەوە. ئەمانە دوورو نزیک بە کەنار رووباری سیروانەوە بنیاد نراون.

گوندی بەرلووت کە تەنها (٧)کم لە سەنتەری شاری کەلارەوە دوورە, دوان لەم قولانەی تێدا دروستکراوە. قوولەی یەکەمیان دەکەوێتە کۆتا سنوری باشوری گوندی بەرلووت, لە رۆخی ڕوباری سیروان بەرامبەر بە گوندی بەردەسور. قولەکە لەساڵی (٢٠١٧)ز لە لایەن (بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان)ەوە نۆژەنکراوەتەوە و لە ساڵی (٢٠١٩)ز یش لەلایەن (بەرێوەبەرایەتی گشتی گەشتوگوزاری گەرمیان)ەوە کراوە بە شوێنێکی گەشتیاری. لە هەمانکاتدا لە بەری ئەو دیوی ڕووباری سیروان بەرامبەر بەم قولەیە, لە سنوری گوندی (بانزەمین) قولە (برنجی) هەیە, کە بە تەواوی ڕوخاوە. قوولەی دووەمی گوندی بەرلووت لە بەشی رۆژهەڵاتی گوندەکەوەیە, لە باردۆخیکی خراپدایە و بە تەواوی ڕوخاوە. پاشان هەردوو قولەی ( ڕازیانە و وەلی خنکاو) دێت لە گوندی (تازەدێ), بەهەمان شێوە بە تەواوی ڕوخاون و تەنها بەشێکی کەم لە دیوارەکانیان ماوەتەوە. لە سنوری گوندی (چاڵە رەش) لە رۆخی روباری سیروان قولەیەکی ترمان هەیە ناسراوە بە قولەی (مەلا), بەسەر نیمچەگردێکی سروشتیەوە بنیادنراوە و بە شێکی زۆری ڕوخاوە, بەڵام باردۆخی لە قولەکانی تازەدێ باشترە. بە ئاڕاستەی باکور دوو قولەی ترمان هەیە کە هەمان ناوی گوندەکانیان هەڵگرتووە, بە ناوەکانی (قولە سووتاو و سەی مەحموو) قولەکەی گوندی (سەید مەحمود) لە ساڵی (٢٠١٧)ز لە لایەن (بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان)ەوە نۆژەنکراوەتەوە.

لە سەنتەری شارەدێی (باوەنوور) قولەیەکی تەواو روخاوی تر هەیە بە ناوی قولە (ئحتیات), پاشان هەردوو قولەی (جنە و قاپشکێنە) دێت لە سنوری گوندی (ئەحمەد قادر). قوولە (جنە) لە باردۆخێکی باشدایە و تەنها بنمیچ و هەندێک لە بەشی ناوەوەی ڕوخاوە, قولەی (قاپشکێنە) لە کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠١٢)ز لە لایەن (بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان)ەوە نۆژەنکراوەتەوە. بەم شێوەیە قولەکان بە هەمان ڕێرەو بنیادنراون تاوەکوو دەگەینە گوندی (پاریۆڵەی خواروو) لە نزیک روباری سیروان (قولە لەواوان)مان هەیە و دواتریش قولەی (رێویلە) دێت, ئەمانە لە نهۆمی زەمینیان چەند بەشێکیان لێماوەتەوە. کۆتا قولەش کە نزیکەی (٥٠)کم لە باکوری شاری کەلارەوە دوورە, دەکەوێتە سنوری گوندی (پونگڵە) لەسەر گردێکی بەرزی سروشتی بنیادنراوە و بەشێکی زۆری ڕوخاوە, ئەم قولەیە لە ناوچەکە بە ناوی (نوقتەکەی باوکە شێخ سالەح) ناسراوە.

# نـــەخشـــەی قـــوڵەکـــان



## مێژووی قولەکان:

قولەکان لە لایەن عوسمانیەکانەوە بنیادنراون. مێژوویەکی تەواو دیاریکراویان نیە, ئەوەی دەستخراوە دۆزینەوەی دراوێکی عوسمانی لە قولەی (سەید مەحمود), ئەمەش لەکاتی نۆژەنکردنەوەکەیدا دۆزراوەتەوە لە ساڵی (٢٠١٧)ز. دراوەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (سوڵتان عەبدولمەجید یەکەم ١٢٥٥ کۆچی - ١٨٣٩ زایینی). ئەمەش وامان لێدەکات کۆنتر لەو مێژووە بکۆڵینەوە, بۆ گەیشتن بە ئەنجامێک لە بارەی مێژووی دروستکردنیانەوە. دراوەکە شێوەیەکی بازنەیی هەیە, کێشەکەی دەگاتە (٧,٥)گرام و تیرەکەشی یەکسانە بە (٢٧,٣)ملم, ئەو ماددیەی دراوەکەی لێدراوسکراوە (مسی سوور)ە , نرخەکەشی (١٠) بارەیە. ڕووی پێشەوە بە تەواوی ڕوشاوە, بەڵام لە ڕووی پشتەوەی نووسراوە (١٢٥٥/١٠/سنه/عره نصره ضرب في قسطنطينية )



وێنەی دراوەکە و هاوشێوەکەی

## مەبەست لە دروستکردنی قولەکان:

قولەکان بۆ چەند بەمەبەستیک دروستکراون وەک چاودێریی کردنی سنورەکانیان لە ناوچەی گەرمیان, لە لایەکی ترەوە چاودیری جموجۆڵی هۆزە کوردەکانی پیدەکرا بە تایبەت ئەو هۆزانەی کۆچەری بوون و ئەوانەش لە سەر سنورە دەستکردەکان نیشتەجێبوون, ئەم سیاسەتەش بەرامبەر بە کورد لە هەردوو ڕێکەوتنی (ئەرزڕوم)ی یەکەم و دووەمی نیوان (عوسمانی – قاجاری) بە تەواوی ڕەنگیداوەتەوە. لە هەمان کاتدا بوونی ئەم قولانە, ڕیگایەکی خیرا بووە لە پەیوەندی کردن بە بەرامبەرکەیانەوە لە ڕووی سیاسی و ئابوورییەوە.

لە سنوری نیوان ئەم قولانە و دەوروبەری سێ بنکەی سەرەکی هەبوون, ڕەنگە ئەمانە لەسەردەمانێک پەیوەندیەکی سەربازی و کارگێریان هەبوو بێت بە تەواوی قوولەکانەوە. یەکێک لە بنکەکان دەکەوێتە سنوری گوندی (بەرلووت), بنکەکە بینایەکی یەک نهۆمی بووە, کە تاوەکوو هەشتەکانی سەدەی بیستەم بە پێوە مابوو. بەڵام بەداخەوە دواتر بە تەواوی روخێنراوە و زەوییەکەی لە دروستکردنی بینای تر بەکارهێنراوە. هەروەها (باجگەی پەیکوڵی) لە گوندی (بەرکەل – شیخ تەویڵ) یەکێکی ترە لەو بنکانە, باجگەی پەیکوڵی لە کەلی پەیکوڵی بنیاد نراوە, ئەم کەلە شوێنێکی ستراتژی گرنگ بووە, چونکە ڕیگای سەرەکی بازرگان و کاروانەکانیان بووە, لەهەمانکاتدا ڕێگایەکی سەرەکی هۆزە کۆچەرییەکان بووە لە نێوان ناوچەکانی شارەزور و قەرەداغ بۆ ناوچەی گەرمیان. زۆر لە کۆنەوە ئەم ڕێگایە بەکارهێنراوە, ڕێگاکەش بەم شێوەیە بووە, پاش ئەوەی گەیشتوون بە (کەلی پەیکوڵی) دواتر لە گوندی (بەرکەل)ەوە بە ئاڕاستەی ڕۆژئاوا ڕۆیشتوون و پێش گەیشتنیان بە گوندی (چرچە قەڵا) بە ئاڕاستەی باشور ڕویان لەبەشێکی (تونی باوە عومرە) کردووە, لێرەشەوە شۆڕبوونەتەوە بەرەو دۆڵێک ئێستا بە دۆڵی (کارێزە) دەناسرێت, (کۆچەر)ەکان بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک لەم دۆڵە ماونەتەوە بۆ لەوەڕاندنی مێگەلەکانیان. لەم شوێنەوە توانراوە بە چەند ئاراستەیەک ڕوو لە ناوچەکانی تری ناوەڕاست و باشوری گەرمیان بکەن.



وێنەی بینای مەرکەز



(بینای-مەرکەز)یش لە (گوندی مەرکەز - قوورەتوو) یەکێکی ترە لە بنکە سەرەکیەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەم ناوچەیە، ئەم مەرکەزە بینایەکی دوو نهۆمیە و بە شێکی زۆری وەک خۆی ماوەتەوە، تاوەکوو جەنگی جیهانی یەکەم و کۆتایی فەرمانڕەوایی عوسمانیەکان بنکەیەکی کارا بووە. بەرێوەبەرەکەی ملازمێکی بەڕەگەز تورک بووە بە ناوی (سمایل حەقی) لە گەڵ چەند سەربازێکی تر لە ڕەگەزی کورد. سمایل حەقی هەر لەوێ کوژراوە، ئەمەش پاش ئەوەی شوانێکی بەڕەگەز کورد چەندجارێک سنوور دەبڕێت، واتە لە کوردستانی رۆژهەڵات (ئێرانی سەردەمی قاجار)ەوە دێتە ناوچەکە، دواجار حەقی فەرمانی تەقەکردن دەردەکات و شوانەکە دەکوژرێت. لە تۆڵەی کوشتنی شوانەکە، پاش چەند رۆژێک کۆمەڵێ چەکدار لە کەس و کاری ناوبراو سنور دەبڕن و (سمایل حەقی) و سیان لە پاسەوانەکانی دەکوژن. ئەمانە پێکەوە لە ئارامگایەک لە گوندی مەرکەز دەنێژرێن.

## شێوە و پێکهاتەی قولەکان:

قولەکان شێوەیەکی لوولەیی و قەبارەیەکی بچووکی دوو نهۆمیان هەیە، هەرچەندە قەبارەی هەموو قولەکان زۆر لەیەکترەوە نزیکە، بەڵام لێرەدا قولەی (قاپشکێنە) بە نموونە وەرگیراوە، کە پێوانەی بەرزیەکەی یەکسانە بە (٤،٦٠م)

نهۆمی زەمینی: شێوەیەکی لوولەیی و بنکە بازنەییە، یەک دەرگای سەرەکی هەیە. رووبەرەکەی تەنها (١٣،٩ م٢) یە، لەم ڕووبەرە بچووکە جێی ژورێکی گەورە و دوانی بچوکتر کراوەتەوە لە گەڵ پیلەکانەیەک بۆ نهۆمی سەرەوە. ئەم نهومە جگەلە ئاگردانێکی گەورە (١٠) مەتەرێزی (مزاغل) بۆ کراوە بەمەبەستی چاودێری و بەرگریکردن، مەتەرێزەکان بەشێوەیەکی ئەندازەیی و بە یەکسانی دابەشکراوە بەسەر هەموو ئاراستەکانی دەوروو بەر. بنمیچەکەی بەدار و حەسیر (دارەڕێ)ی بۆکراوە و بە قسڵ و بەردی ورد ڕوپۆشکراوە.




نەخشەی نهۆمی زەمینی، قولەی قاپشکێنە

نهۆمی یەکەم: بە هەمان شێوە لوولەییە ، بەڵام بە هۆی باریکی دیوارەکانی بە بەراورد بە نهۆمی یەکەم، ڕێڕەوێکی لێ دروستبووە بە دەوری تەواوی ئەم نهۆمە. بە هۆی دەروازەیەکی بچووکەوە دەگەینە سەر ڕێڕەوەکە. ئەم نهۆمە بنمێچی نیە و دەم واڵایە، جگە لە مانەش (١٠)

تاقی کراوەی لاکێشەیی بۆ کراوە بە مەبەستی بینینی  هەموو ئاراستەکانی دەورو بەر.




نەخشەی نهۆمی یەکەم, قولەی قاپشکێنە

## ئەو کەرەستە و ماددانەی لە قولەکاندا بەکارهاتوون:

ئەمانەش بریتین لە خڕەبەرد (bolder), قسڵ, دار, بەردی لمین (sandstone), بەردی گەچین (calcite) و خەڵوزی وردکراو, هەروەها خشتی سوورکراوەش لە هەندێ لە قوللەکان بەکار هاتووە.

قسڵ لە بەردێکی تایبەت لە پاش سووتانیان لە کوورە و وردکردنیان, وەک گێراوەیەک بۆ بەستنەوەی هەموو ئەو کەرستە و ماددانەی باسکراوە بەکارهێنراوە. خەڵوزی وردکراویش لە پێکهاتەی ئەم گیراوەیە بەکارهاتووە. بە شێکی زۆری  دیواری قوولەکان بە (خرە بەرد)ی زبر پێکەوە نراوەن, بەڵام هەندێکی تریان بە (بەردی لمین) تەواو کراون. بنمیچەکان هەمیشە لە داری ئاسایی (دارەڕێ)ی بۆ کراوە, هەندێکیان بە قسڵ و بەرد ڕیۆشکراون, بەڵام هەندێکی تریان بە قسڵ و خشت تەواوکراون. خشتەکان تەنها لە بنمیچەکان نابینرێن, بەڵکو لە دروستکردنی هەندێ لە (مەتەرێز)ەکانیش بەکارهێنراوە.

## سەرچاوەکان:


1- طه باقر,فوادسفر:المرشد الى مواطن الاثار والحضاره,رحله السادسه , بغداد -حلبجه, ل٦.

2- شێخ محمدی خاڵ : فەرهەنگی شێخ محمدی خاڵ : چ/دووەم , هەولێر ٢٠٠٥ز - ل٣٣٧.

3- محمد علی کریم, ئارام محمد مجید: قولەکانی نیوان کەلار-دەربەندیخان, گۆڤاری سۆبارتۆ, ژ/٤-٥, ٢٠١١ز.

4- ڕاپۆرتی بەشی پشکنینی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان: نۆژەنکردنەوەی قولەی سەید محمود: نەوزاد لەتیف, سەروەت حەمدان, صالح محمد, ٢٠١٧ز.

5- ڕاپۆرتی بەشی پشکنینی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان: (کارکردن لە شوێنەواری پەیکوڵی لە گەڵ دەستەی زانکۆی ساپێنزای ڕۆما/ وەرزی ٢٠١٩), محمدعلی کریم, زانا عبدالکریم قادر, ٢٠١٩ز.

6- محمد علی کریم: ڕێبەری شوینەوارەکانی گەرمیان, باجگەی پەیکوڵی, ٢٠١٠ز.

7- سەرتیب خورشید, چاوپێکەوتن, تەمەن ٥٠ساڵ, ٢٠١٩ز.

8- ڕوەیدا محمود عبدوللا: قوللەکانی سەردەمی عوسمانی لە ناوچەی گەرمیان, گۆڤاری سۆبارتۆ, ژ/٤-٥, ٢٠١١.

9- ڕاپۆرتی بەشی پشکنینی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان: نۆژەنکردنەوەی قولەی قاپشکێنە, محمد علی, سامان رشید,جمال محمد, ٢٠١٢ز.



# پرۆژەی ئاودێری کەلار و چەند نهێنییەکی شارستانی کۆنی ناوچەکە

ئا/ ساڵەح هەلاج

کۆتایی ساڵی ١٩٧٦ و سەرەتای ساڵی ١٩٧٧ ئەم شاری کەلارە تەنها ٣٠ – ٤٠ ماڵێکی لە قوڕدرووستکرابوو، بۆ خۆشی پێمان دەوت ( قەزا قوڕینە) شەقامی سەرەکی جەلەولا بۆ دەربەندیخان قیر ڕێژ بوو، لە فلکەکەی ناوبارزاڕیش بەرەو کەلاری کۆن ئەویش شەقامێکی یەک لایەنی قیر ڕێژکراو بوو.

ماڵەکانی ئەم شارە وەکو سێ کوچکەیەک لە ماڵە کۆنەکانی ڕووکاری ڕووباری سیروان، لە کۆندا دێیەک بووە لە بن قەڵای شێروانەد ، پاشتر بەرەو سەرەوە هاتوون لەم شوێنەی ئێستا ئاوەدانیان کردۆتەوە، حەوت ماڵێک دەبوون.

چەند ماڵێکی تریش لەم بەری ماڵەکانەوە بوون ئەوانیش نزیکەی هەر حەوت ماڵێک بوون، واتە ماڵی( ئەمین حاجی) تەنکییەکی ئاوی لێبوو، واتە تەنیشتی ئێستا (تەلاری شێخ جەعفەر) ئەم چەند ماڵە دوای ئەوەی ساڵانی پەنجاکان مستەفا بەگی جاف ئاوسەرخەرێکی( ناعور) لە ناو ماڵەکانی ئاوایی بنگرد دانابوو ئەو چەند ماڵە لەو بەری جادەکەوە ئاوەدانیانکردبوەوە، دوای ١٩٧٠/٢/٢٨ بە فەرمانی میری ئەو سەردەمە کەلار کرا بە قەزا، لە دواترا ژمارەیەکی کەم زەوی نیشتەجێ بوون بەسەر خەڵکیدا دابەشکران

بڕکە ماڵێکی تر بە چەند ماڵێکی قوڕین درێژ بوو بەرەو لای ئێستای تەلاری هاوچەرخ. بەشێکی نزیک مزگەوتی گەورەی ئێستای کەلار تا دەگەیشتە بەرانبەر تەلاری ئێستای بازاڕی زانکۆ.
کەلار شارێک بوو لە بێکاری و بێ بژێوی ژیان ، هەر لە سەر جادە گشتییەکەی جەلەولا –دەربەندیخان دوو ڕیزە دووکان هەبوون، چەند دووکانێکی لای پردەکۆنەکەی خوار پۆلیسخانەی ئێستای کەلار کە بە هۆی دوو سایدکردنی شەقامەکەوە، شوێنەواری نەماوە.
ڕیزی دووەم کەوتبووە سەر هەمان شەقام خوار گەراجی کۆنی کەلار – سلێمانی بەردەم گەڕەکی ئێستای( بنگرد) واتە, ماڵی حاجی مەحموی حاجی محی الدین، بەڵام لە پشتی دووکانەکانە تەنها ماڵی حاجی مەحموی لێبوو.
لە شوێنی ئێستای نەخۆشخانەی چاودێری شێروانە لە سێ ژووردا بنکەیەکی تەندرووستی هەبوو، بەرانبەرەکەی بنکەیەکی پۆلیس و پۆستە و گەیاندن تلیفۆنی هەبوو.
گەڕەکەکانی (حەمەی کەریم و عەلەو محە و حەمەی وەلی)ئەمانە هەر گوندە کۆنەکانی پێشتر بوون.
چەند جێبێک هەبوو خەڵکی گەڕەکی کەلاری کۆن, ڕۆژانە بۆ ناو شار هاتوچۆیان پێدەکرد وپێیان دەگوت: (جێبە ڕوبعە) چونکە کرێی هاتوو چۆ بە (ڕوبعە دینارێک) بوو.
لە شوێنی ئێستای دووکانی دۆلارەکان ماڵکی قوڕ هەبوو دوو ژووری تێدا بوو ئەوە بارەگای سەندیکای کرێکاران بوو، گەرچی هیچ پیشەیەکی کرێکاری لە کەلاردا نەبوو، بەڵام ڕژێم بۆ ئەوەی کرێکارە ڕۆژانەکان بکات بە بەعسی بە تایبەتی گەلی کورد تووشی نسکۆی شۆڕشی ١٤ ساڵەی ئەیلول هاتبوو، هیچ دەرچەیەکی ئومێد نەما بوو ڕژێم ئەو هەلەی قۆستبووەوە تا دەستبگرێت بە سەر خەڵکیدا و بە ناوی (بەتاڵەوە) خەڵکی بە موچەیەکی کەم بە تایبەتی لە دائیرەی کشتوکاڵ دامەزراندبوون.
من لە بەتاڵەی گرێبەست لە بەڕێوەبەرایەتی ( ئاودێری سلێمانی ) ناوم هاتبووەوە، چووم بەڕێوەبەرایەتییەکەم بینییەو و نزیکەی پانزە ڕۆژێک دەوامکرد، لەوێ پیاوێکم ناسی بە ناوی (عەباس ڕۆستەم) ئەندازیار بوو، پیاوێکی چاک و سەلار و ڕۆشنبیر و هێمن و دڵسۆز بوو.
ڕۆژێک وتی: لە کەلار پرۆژەیەکی ئاودێری دەرچووە من دەچم بۆ سەرپەرشتی و تۆش دەبەم. منیش زۆرم پێخۆشبوو, چونکە تازە ژنم هێنابوو بەڵام منداڵمان نەبوو، پرۆژەکە لەسەر ڕووباری سیروان بە ناو ماڵە کۆنەکانی گەڕەکی بنگردی کۆن دەستی پێدەکرد، کاکە عەباس وتی : ئەو (لێڤڵ)ەم بۆبێنن، ڕاستی نەمزانی لێڤڵ چییە بەڵام بۆنتی سەیارەکەم هەڵدایەوە سنوقێک و سێ پایەکەم بینی سەرەتا سێ پاکەم دەرهێناو لە سەر زەوی کردمەوە و قاچەکانیم توند کرد لە زەوی و پاشان جیهازەکەم لە سنوقەکە دەرهێنا و ئەویشم لە سەر سێپاکە دابەست و تەماشامکرد لەلاوە بۆ هاوکێشەی تەواوی لێڤڵەکە وەکوشاقولی ئاوی هەبوو. منیش

بە تەواوی کارەکەم جێبەجێکرد، کاکە عەباس هات تەماشای لێڤلەکەی کرد بینی هیچ لارییەکی نییە وتی: ئەمە کێ دایانەوە وتم من، وتی زۆر باشە هەندێ شیشی ئاسن لە سەیارەکەدایە دایبگرە، نێوان هەر شیشێک بۆ شیشێکی تر هەر سی مەترێک بچەقێنە زەوییەکەدا، دیسان هەر بە پێوانەی هەنگاو بە ئەژماری خۆم شیشەکانم چەقاندە زەویەکە، کاکە عەباس تەماشای کرد ئەویشی بە دڵ بوو وتی : بچۆ ئەمانەم بۆ بنووسە منیش بە جوانی وردی بۆم نووسی، کاکە عەباس تەماشایەکی نووسینەکە و خەت خۆشییەکەمی کرد وتی: تۆ خوێندەواریت تا چەندە وتم: تا شەشی سەرەتایم خوێندووە: دیسان وتی: تۆ لەم کاتەوە چاودێری (مراقب) کارەکان دەبیت.

ڕۆژی پێنج شەممە کاکە عەباس چووەوە بۆ سلێمانی و ڕۆژی شەممە نزیکەی کات ژمێر ١١ یانزەی پێش نیوەڕۆ هاتەوە بۆ کەلار، لە جانتاکەی دەستیدا فەرمانی دەستبەکار بوونەکە می پێشاندام وەک چاودێری کار و مانگانەی بە ٣٠ سی دینار و ڕۆژی دوو سەعاتیش (ئۆفەرتایم) واتە کاری زیادەی بۆ نووسیبووم، واتە مانگانەکەم دەبووە ٦٠ دینار .

ناوی کرێکارە گرێبەستەکانیشی پێنیشاندام کە ژمارەیان ١٥ کەس دەبوون بە کرێکاری گرێبەستی سێ مانگی دامەزرابوون، بە داخەوە ناوی تەواوی ئەو برادەرانەم لە بیر نەماوە تا لێرە ناوەکانیان بنووسم.

ماڵێکی قوڕ هەبوو لە شوێنی ئێستای بازاڕی هاوچەرخ حەوشەکە هی کاک (فەوزی عەبدولڕەحمان دەلۆ) بوو بەکرێمان گرت و کردمان بە شوێنی فەرمانگەکەمان، جگە لە کاک عەباس و من سایەق شۆڤەڵ و گرێ دەر و سایەقە تایبەتەکەی کاک عەباس و شوێنی پشووی کرێکارەکان دەبووەوە.

کارەکانمان بە جوانی و بە سەرکەوتوویی دەڕۆیشت، ڕۆژێک من و کاک عەباس بە سەر هێڵی کارەکەماندا چووین تا سەر چەمی (خرە شێت) ئەو چەمە وشکەی لە ناوچەی تیلەکۆ و گوندی زەرد و توران و کارێزەی حەمەکەیفەدا لە سەرووی گوندی سەیدەوە شۆڕدەبووە وە بەرە و گردەگۆزینە، لە ناو چەمەکە هەندێ شوێنەواری کۆنمان بینی لە بەرد و قسڵ درووستکرابوو، کاک عەباس وتی : ئەمانە چین؟.

ڕاستییەکەی من هیچ شارەزاییم نەبوو وتم: من ئەمانەم نەبینیوە و نەمزانی چین، کاک عەباس وەکو هەموو کاتەکان ڕۆژی پێنج شەممە گەڕایەوە بۆ سلێمانی، ڕۆژی یەک شەممە دەستەیەک شوێنەوارناسی لە سلێمانییەوە هێنا و کنە و بشکنینی ئەو دیوارە قسڵانە و پاشان بە شوێنی خۆیاندا گەڕانەوە وەکو ڕاستە هێڵێک تاگەیشتینە شوێنی ئێستای بەڕێوەرایەتی ژینگەی کەلار. لەوێشەوە بەرەو چەمی حەمەی کەریم هاتین، لە ناو چەمەکە دیسان جۆگەیەکی ئاودێریمان بینییەوە کە بە شێوەی دیواری سەرگیراو لە چەمەکە دەپەڕییەوە بەرەو گەرەکی گازینۆی

ئەمبەر و لەوێوە بە شێوەی پیتی ( L ) ی ئینگلیزی دەگەڕایەوە بەرەو جادەی گشتی و دیسان بۆ ناو گوندی ( حەمەی وەلی) و بە ڕووکاری سیرواندا بە شێوەی کون شاخەکەیان کون کردبوو بەرەو تەپۆڵەکەکانی سەروو تر، ئەوە دیار بوو بۆ بنەوانەی ئەو ئاودێرییە کونکرابوون. دوایی لیژنەکە بە ڕاپۆرتێک ئێمەیان ئاگادارکردەوە ئەوە جۆگەیەکی ئاودێری سەردەمی ساسانییەکانە و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ٢٥٠٠ ساڵ پێشتر.

ئەم جۆگە لای خەڵکی ناوچەکە بە جۆگەی( گاور) ناسرابوو*. تا کۆتایی نەوەدەکانی سەدەی ڕابووردوو بە تەواوی شوێنەواری دیاربوو.

ڕێکەوتی ٢٠٠١/٦/١ لە گوندی گردەگۆزینەی خوار شاری کەلار لە کاتێکدا (جەمال حوسێن) ناوێک, لە حەوشەکەی خۆیدا سەر قاڵی هەڵکەندنی بیری ئاو دەبێت, لە دوای هەڵکەندنی ٦ مەتر تونێلێکی دەستکرد دەبینێتەوە. لە پاش لێکۆڵینەوە دەرکەوتووە ئەو کارێزە لقێکی پرۆژەئاوەکەی جۆگەی گاورە. *

سەرەڕای جۆگەکە هەر لەوبەری جادەکەوە واتە جادەی کەلار، ڕزگاری، کفری واتە شوێنی ئێستای بورجی تەلەفزیۆنی ئاینده و بەرەو چەمی خرەشێت ئەو دەشتە کارمان تێدا دەکرد سەرەتا بە شۆڤڵ زەوییەکەمان تەخت دەکرد و پاشان بە حەفارە جۆگەکەمان هەڵدەکەند، ئەوەی سەیر بوو لە دوای مەترێک چاڵکەندن ئەو ناوچە بە شێوەی شارێک دەردەکەوت، بە سەدان تەنور و دیوار و پاشان کەرەستەی ماڵ وەکو گۆزە و کوپە شکاو و مورگی ( شیلانە) من بۆ خۆم ژمارەیەکی زۆری ئەو مورگانەم کۆکردەوە.

جگە لەمانە گرد و قەڵای شێروانە شوێنەوارێکی دیاری کۆن بوو، شوێنی ئێستای پارکی شار گۆڕستانێکی کۆن بوو، لە ناو چەقی بازاڕەکەیشدا کە بەم دواییە لە ئەنجامی دروستکردنی ژێر زەمین بە تایبەتی شوێنی دووکانەکەی ( خەلیلی موهەندیس) کە فرۆشیاری کۆمپیوتەرە لە دوای ٣ سێ مەتر چەند گۆڕێکی کۆن بە دەرکەوتن شێوەی ناشتنەکەیان دەگەڕایەوە بۆ پێش هاتنی ئاینی ئیسلام بۆ ناوچەکە.

هەرچەند من هیچ ئەزموونێکی شوێنەواریم نەبو و سەلیقەی بە دواچوونیشم نەبوو کە دوای چەندین ساڵ بیرم لەو شتانەکردەوە بەڵام کار لەکار ترازا بوو, کەلار فراوان و جۆگەکان پڕکرابوونەوە بە خانووی نیشتەجێ بوون و جادە و قیرڕێژ و کۆنکرێت و پارک، ئەو شوێنەوارانە تەنانەت ئەو پرۆژەیەیش کە ئەو سەردەمە دروستکرا لە هیچ شوێنێک شوێنەواری نەماوە تەنها بازاڕێک هەیە و ناوی سەرمەشروعەکەیە و کەسیش نازانی بۆ ناوی مەشروعەکەیە...!

* دەستەواژەی( گاوەر ) یان گەڤر ، یان( گەور) واتە ئاگرپەرست مەبەست لە مۆغەکانی ئاینی زەردەشتی بووە. عەرەبەکان کردیانە کافر...



# کەلار لەسەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونی عوسمانییدا لەساڵی ١٥٢٨ز

سەباح عەلی جاف

کەلار ناوەندی ئیدارەی گەرمیان ،یەکێکە لەقەزا گەورەکانی کوردستان ،تاحەفتاکانی سەدەی رابردوو گوزارشت بووە لە گوندێکی ئاوەدان ،بەپێی سەرچاوەکان و بۆچونی زۆرینەی توێژەران ئەم گوندە لەلایەن حوکمەتی عێراقەوە راستەوخۆ لەگوندەوە کراوەتە قەزا واتا ئەم قەزاییە بە ناحیەدا تێنەپەریوە ئەمەیش رەنگە لەڕووی ئیداریەوە جیاواز و سەیر بێت . بەقەزاکردنی کەلار لەسەردەمی ئەحمەد حەسەن بەکری سەرۆک کۆماردا لە ١٩٧٠/٢/٢٨ز بە مەرسومی کۆماری ژمارە (١٣٧)لەرۆژنامەی وەقایعی عێراقی لە ١٩٧٠/٣/١١ دا بڵاوکراوەتەوە ئەو رۆژەی بەیانی یازدەی ئازار راگەیەنرا دەلالەتە لەسەر ئەوەی بەقەزاکردنی کەلار رەهەندێکی سیاسی لەپشتەوە بووە ،کەلار لەسەدەی رابردوو و تا ئەمڕۆیش گرنگی خۆی هەبووە چ لە رووی سیاسیەوە چ لە رووی ئابوریەوە بەتایبەت لەپاش راگواستنی ژمارەیەکی زۆر لە کوردان چ لە ناوچەی خانەقین چ لە ناوەڕاست و خواری عێراق ،ئەمە جگە لە شاڵاوەکانی جینۆسایدی کورد لەژێر ناوی ئەنفال لەبەهاری ١٩٨٨ .

ئەوەی تائێستا لای ئێمە زانراوە ئەوەیە کەلار لەبواری مێژووی کۆندا مێژووەکەی بۆ سەردەمەکانی پێش زاین دەگەڕێتەوە لەم رووەوە زانیاریەکان بەردەستن بەتایبەت

دۆزینەوەی چەندین شوێنەواری دێرین لەسنورەکە ، سەبارەت بەمێژووی نوێ تائێستا زانیارییەکان بەو شێوەیە بوونە لەحەفتاکانی سەدەی نۆزدە کەلار ئاوەدان بووەتەوە و ناوی براوە ،لەلێکۆڵینەوەی تریشدا ئەوە خراوەتەڕوو ڕەنگە ناوی کەلار و ئاوەدان کردنەوەی بۆ بەرای ئەو سەدەییە بگەڕێتەوە ئەمەیش تائێستا لەلێکۆڵینەوە و لێ وردبوونەوەدایە ،بەگشتی دەکرێت بڵێین زۆرێک لەلێکۆڵینەوە و بۆچونەکان تائێستا لەمێژووی نوێدا پێیان وایە سەرەتای سەدەی نۆزدە یاخود لە چارەکی کۆتای ئەو سەدەیەدا کەلار ئاوەدان کراوەتەوە و ناوی هاتووە بەتایبەت نیشتەجێبوونی هۆزی جاف لە سنورەکە و بیناکردن یاخود نۆژەن کردنەوەی قەڵای شێروانە (١٨٦٦-١٨٧٤)ز کەئەمەیش تائێستا جێگەی مشتومڕە .

سەرچاوەکان کەلار و ئاوەدان کردنەوەی لەسەردەمی مێژووی نوێدا بۆ کۆنتر دەگەڕێننەوە کە ئەمە بۆ مێژووی کەلار و ناوچەکە تازەیە و بەدڵنیایەوە لەم ڕووە دەرگامان بۆ دەکاتەوە بۆ ئەوەی وردتر بدوێین ،هانی لێکۆڵەران و مێژوونوسانیش دەدات کاری باشتر لەم ڕووە بکەن ،دڵنیام هەوڵەکان لەم ڕووە چڕ بکرێنەوە لەسەر ئاستی دامەزراوە و دەزگا ئەکادیمیەکان بەتایبەت زانکۆی گەرمیان کار بکرێت و سەردانی شوێنە ئەرشیفیەکانی تورکیا بکرێت زۆر مێژووی شاراوەی ئەم ناوچەیە ڕوون دەبێتەوە و شتی نوێش دەخولقێنێ . شاری کەلار لەسەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونیدا دەیەمیین سوڵتانی دەوڵەتی عوسمانی کەلە ١٥٢٠ز هاتوتە حوکم تاساڵی ١٥٦٦ز فەرمانڕەوا بووە،سەردەمەکەی بەفراوانخوازی دادەنرێت توانی بەشی زۆری ئەوروپا و ئاسیا و ئەفەریقیا بگرێت بەتایبەت عێراق و کوردستان ،سەردەمی ئەم هاوسەردەمی تەهماسبی یەکەمی (١٥٢٤-١٥٧٦)ز شای ئێرانە کەلە ململانیەکی مەزهەبی و سیاسیدا بوونە ئەمەیش کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر کوردستان هەبووە .

ئەوەی لێرەدا دەیخەینەڕوو بۆ مێژووی کەلار و ناوچەکە تازەیە ئەویش ئەوەیە لەسەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونیدا کەلار ئاوەدان بووە لەساڵی ١٥٢٨ فەرمانڕەواکەی ناوی (زلفەقار) بووە ،ئەم زانیاریانە لە کتێبی (سليمان القانوني ،سلطان البرين والبحرين ،حقائق في ضوء المصادر)دا خراوەتەڕوو لە نوسینی پرۆفیسۆر دکتۆر فەرەیدون ئەمجان بە زمانی تورکی و لەلایەن دکتۆر جەمال فاروق و کەمال ئەحمەدەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و چاپی یەکەمی لەساڵی ٢٠١٤ لەقاهیرە بڵاوکراوەتەوە لەلایەن دەزگای نیل بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە . لەوەرگێڕدراوە عەرەبییەکەی کتێبی (سليمان القانوني ،سلطان البرين والبحرين ،حقائق في ضوء المصادر) دا باس لەوە دەکات شاری بەغدا لەپێشوودا لەلایەن شائیسماعیلی سەفەوییەوە گیراوە لەساڵی ١٥٠٨ز ،دواتر باس لەکەسایەتیەکی فەرمانڕەوا دەکات لەناوچەکە بەناوی (نهود عەلی سوڵتان ئۆغلۆ زولفەقار) کەبۆخۆی لە تورکمانەکانی موسڵ بووە (سەرچاوە مێژووییەکان کوردبونی ئەم کەسایەتیەکان سەلماندووە بەناوی زۆلفەقار کەلهور ،بەڵام لەم

سەرچاوەیەدا بەتورکمان ناوی هاتووە) ،خاوەن کەسایەتێکی بەهێز بووە لەناوچەکەدا و توانی بەغدا کۆنترۆڵ بکات لەسەردەمی شاتەهماسبی یەکەمدا ،هەرلەو لێکۆڵینەوەیەدا نوسراوە «زولفەقار» ئەو دەمە فەرمانڕەوای کەلار بووە لەساڵی ١٥٢٨ز ،دواتر لەپەراوێزدا نوسراوە کەلار : شارێکە دەکەوێتە باکوری عێراقەوە بە ووتەی وەرگێڕەکانی ئەم کتێبە ،فەرمانڕەوای کەلار هەڵدەسێت مامی خۆی دەکوژێت بەناوی «ئیبراهیم خان» کەلەلایەن سەفەویەوەکانەوە کرابوو بە فەرمانڕەوا (حاکم)ی بەغدا ،کوشتنەکەیشی لەلایەن زولفەقاری برازایەوە بەو شێوەیە دەبێت کە ئیبراهیم خان لەڕاوشکار بووە بە بێ پاسەوان و ئەویش فرسەت دێنێ و دەیکوژێت و دەچێتە جێگەکەی . هەر لەم لێکۆڵینەوەیدا ئەوە خراوەتەڕوو زولفەقار نازناوی (خلیفە الخلفاء) ی هەبووە دەزانێت شاتەهماسبی یەکەم بەم رووداوە پەست و نیگەران دەبێت و ئەمە قبوڵ ناکەن هەربۆیە بەغدای پەیوەستی عوسمانیەکان کردووە و کلیلی شارەکەی بۆناردون ،بەچەند رێگەیەک ویستویەتی دڵی عوسمانیەکان بۆ لای خۆی رابکێشێ ئەویش ووتاری هەینی بەناوی سوڵتان دەست پێکردووە تەنانەت پارەیشی بەناوی ئەوانەوە لێداوە ئەو دەمە کە زولفەقار ئەو کارانەی بۆ عوسمانیەکان کردووە ئەوان لەئەوروپا بە گەمارۆدانی شاری ڤییەناوە خەریک بوون لەساڵی ١٥٢٩ز ،

ئەو دوورەپەرێز و خۆخەریک کردنەیی عوسمانیەکان بەرۆژئاواوە وا لە شاتەهماسب دەکات بیر لەگەمارۆدان و گرتنی بەغدا بکاتەوە ،شا سوپای نارد بۆ گرتنی بەغدا و زولفەقار هەوڵی بەرگری دەدات تائەوکاتەی پاڵپشتی عوسمانیەکانی پێ بگات بەڵام لەلایەن کەسێکی نزیکیەوە خیانەتی لێ کراوە بەناوی عەلی بەگ ،هەر ئەمەیش وای کرد شاری بەغدا لەلایەن سەفەویەکانەوە بگیرێت و گرتنی ئەو شارەیش بوو بەهۆی گرتنی تەواوی عێراق . لەو دەقەی سەرەوە ئەوە روون دەبێتەوە شاری کەلار لەسەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونیدا ئاوەدان بووە لەساڵی ١٥٢٨ز ،تەنانە فەرمانڕەواکەی(حاکم)ی کەسێکی بەهێزی تورکمان بووە بەناوی زولفەقار ،ئەو فەرمانڕەوایە راستەوخۆ لەدوای کوشتنی مامی لەفەرمانڕەوای کەلارەوە دەبێتە حاکمی بەغدا کە ئەودەم شارێکی بەهێز و گرنگ بووە ،نوسەری ئەم کتێبە پرۆفیسۆر دکتۆر فەریدون ئەمجان feridun emcen خاوەن پێگەیەکی بەهێزە ،لەساڵی ١٩٧٩ بەشی مێژووی کۆلێژی ئاداب – زانکۆی ئەستەمبوڵی تەواو کردووە ،لەهەمان زانکۆ بڕوانامەی دکتۆرای بەدەست هێناوە لەساڵی ١٩٨٥ز ، خاوەنی چەندین ووتار و لێکۆڵینەوەیە لەسەر لایەنە جۆربەجۆرەکانی دەوڵەتی عوسمانی ،هەروەها خاوەنی شەش کتێبی ئەکادیمی ئاست بەرزە لەسەر عوسمانیەکان ،ئەو کەسانەی ئەم کتێبەیان وەرگێڕاوە بەهەمان شێوە خاوەنی ئاستی زانستی بەرزن تەنانەت لەلایەن لیژنەیەکی زانستی و هونەریەوە کاروبارەکانی وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبەیان کردووە .

بەم شێوەیە دەردەکەوێت مێژووی کەلار و ناوچەکە بۆ کۆنتر دەگەڕێتەوە وەک ئەوەی ئێمە پێشتر زانیاریمان هەبووە تەنانەت باس لەوە کراوە کەلار گوندێکی ئاوەدان بووە بەڵام بە پێی بەڵگەکانی نێو ئەم کتێبە دەردەکەوێت کەلار شارێکی ئاوەدان بووە و لەلایەن کەسایەتێکی بەهێزەوە حوکم کراوە کەڕاستەوخۆ دوای حوکمی کەلار چوەتە شاری بەغدا و لەو شارە فەرمانڕەوا بووە ،وەک وەرگێڕەکانی کتێبەکە لەپەراوێزدا نوسیویانە کەلار شارێکە لەباکوری عێراق ،وەک دەردەکەوێت هیچ شارێکی تر بەم ناوە لەعێراق و کوردستاندا نەبووە ،بە دەرکەوتنی ناوی شاری کەلار لەساڵی ١٥٢٨ز دەرگامان لەبەردەمدا دەکاتەوە زیاتر لەم رووە لێکۆڵینەوە بکەین و ووردتر هەوڵی دۆزینەوەی مێژووی ونی کەلار و ناوچەکە بدەین ،لێرەدا دەبێت ئەوەیش بڵێم دکتۆر عوسمان عەلی – مامۆستا لە بەشی مێژوو لە کۆلێجی ئاداب – زانکۆی سەلاحەدیین لەهەولێر کە بەندە وەک خوێندکاری ماستەر ئەمساڵ (٢٠١٩) وانەی دەولەتی عوسمانی پێ دەوتین بۆخۆی پسپۆڕی مێژووی نوێی کوردە و لەسەر ئەو مێژووە لەئەرشیفی عوسمانی کاری کردووە و شارەزای هەیە ،لەم رووەوە جەختی لەسەر هەمان راستیەکان کردووە و پێی وابوو ئەو زانیاریانە لەسەر مێژووی کەلار لەسەردەمی سوڵتان سلێمان لەساڵی ١٥٢٨ لەسەرچاوەی ئاماژە بۆکراو راست و دروستە و پاڵپشتی کرد .

# زمانی شیعریی شاعیرانی گەرمیان

(مینەجاف, شاکەلی, حاجی ئیبرایمی شاتری) بەنمونە

کۆسار عومەر ئەحمەد

ماستەر لە ئەدەبی کوردی



بەوپێیەی مرۆڤ [شاعیر] بونەوەرێکی داهێنەرە، بەتایبەتی لە هونەردا, چونکە توانای دروستکردنی وێنەی هەیە, بۆ بەرجەستەکردنی بیری, قەڵەمەکەی دەبێتە پردی پەڕینەوەی خەیاڵی و لە بیریەوە بۆ سەر کاغەز وێنەگەلی خەیاڵی دەربڕدراوی ڕەوانبێژی و خوازەی نایاب و سەرسوڕهێنەر دروستدەکات.

شیعری کوردی, جیا لە هەموو جۆر و شێوەی داڕشتن و بنیادی هونەری و ژانەرەکانی دی, خاوەنی چەندین هەل و مەرج و خەسڵەتی تایبەتییە، ئەو خەسڵەتانەشی سیمایەکی خودی تایبەتی و بەرگێکی هونەری پێ پۆشیوە، زمانەکەیشی [زمانی شیعری ] ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لای وێژەوان، هەروەها بووەتە بەشێک لە پێداویستیەکانی ڕۆژانەی مرۆڤ و لێی جیا نابێتەوە.

زمان, کە پەیرەوێکی دەنگییە بۆ لەیەکتر گەیشتن، بەهۆی ڕستەی جۆراوجۆر و گوتن و بیستنەوە، کە بە هۆی بەکارهێنانی، نیشانە و هێما، لە ڕۆناندا بۆ دروستکردنی وانەی واتایی بەرجەستە دەبێت، هەروەها لەنێو زمانیشدا جیاکارییەک هەیە، زمانی

شاعیران و کەسانی تری, لەیەکدی جیاوازن, بۆنمونە: زمانی زانست و تەکنەلۆجیا، لایەنی سۆزداری تێدا نیە و لەدەستی دەدات و نامێنی، بەڵام زمانی شیعری شێوەیەکی هەرە بەرزی زمانی سۆزە، شیعر و ئەدەبیاتیش لایەنێکی زیندوو و کاریگەریی ژیانی هەر میللەتێکن و لە ناویدا زمانەکەیش, ڕەگەزێکە لە ڕەگەزەکانی بنیاتی شیعری، بۆیە ئەو زمانە شیعرییەی شاعیر بەکاریدەهێنێ، زمانێکی گرانەو پێویستی بە دەسەڵاتو توانایەکی گەورە هەیە، جا لەبەر ئەوەی ئەم تواناو دەسەڵاتەیش لای هەموو کەسێک نییەو لە دەست هەموو کەسێک نایەت، کە بەم شێوە تایبەتییە زمان بەکاربهێنێت جگە لە شاعیران, بۆیە عارەبەکان بە شاعیران دەڵێت: (مرۆڤی جنۆکەدار).

گەرچی زمانی شیعری, زمانی دووەمی شاعیرانە و جیاوازە لە زمانی و قسەی ئاسایی ڕۆژانە و بە گرنگی نەدان بە زمانی شیعرە کە، ئەوە شیعرەکە لەگەڵا قسەی ئاسایی ڕۆژانە جیا نا بێتەوە، یاخود دەبێتە پەخشان و ڕاپۆرت.
گەرمیانیش بەو پێیەی شوێنی لەدایکبوونی چەندین قەڵەمی بە بڕشت و شاعیری توانا و ناوداری وەک (مینە جاف و شاکەلی و بێدار و حاجی برایمی شاتری و فەرهاد شاکەلی و لەتیف هەڵمەت و تادەگاتە ئەو شاعیرانەی کەتا ئێستا ماون, بە درێژایی سەدەکانی پێشوو لە بواری ئەدەبی شیعریدا بوونیان هەبووە, هەورەها بەشێکی دیاری ئەدەبی شیعری کوردی و کتێبخانەی کوردییان دەوڵەمەندکردووە, وە بەهۆی ئەوانەوە, شیعر لە گەرمیاندا لە جووڵە و پێشکەوتن و تازەگەریشدا بووە, هاوکات خاوەن زمانێکی شیعری بەرزبوون و جیا لەو زمانە سادەیی ڕۆژانە, خۆ گەر وشەیەکی سادەی ڕۆژانەیشیان بەکارهێنابێت, ئەوە لەچوارچێوەی داڕشتنێکی هونەری جوان دایانڕشتووە و بووە بەسەر دەستی لە شیعرەکانیان.

زمانی ئەدەبیاتی شیعری کلاسیکی کوردی, هەر لەسەرەتاوە تا جەنگی یەکەمی جیهانی, لای شاعیران زۆر باوبووە, گرنگیدان بە فەرهەنگی بیر و دەوڵەمەندکردنی, تایبەتمەندییەکی گرنگی شاعیران بووە, هەروەها هەوڵیانداوە, وشەکان لە قاڵبی تانها واتی فەرهەنگی بێننە دەرەوە و واتای نوێی پێ ببەخشن و یەک وشەیان بۆ زیاتر لە واتایەک بەکارهێناوە, بۆ نمونە (شێخ ئەحمەدی شاکەلی ١٩٠٤-١٩٨٢) دەڵێت:

ئیتر ناڵینی تۆ ئەحمەد بە تەئسیرە هەتا مردن
دەمت گەرم و دەمت پڕ دەم هەتا ئاخر دەمت وایە

(کاکەیی: دیوان و یاداشتی شاکەلی: چاپی پێنجەم:١٣٦)

ئەم بەیتەی سەرەوەی شاکەلی کە کۆتا بەیتی قەسیدەیەکییەتی و لە نیوە دێڕی دووەمیدا (سێ جار) وشەی (دەم)بەکار هاتووە و  هەرجارە و بۆ مەبەست و واتایەکی جودا بەکارهاتووە، بەشێوەیەک یەکەمجار بەواتای (هەناسە)ی شاعیر و دووەم بەواتای (دەم)ی عەرەبی (خوێن) و لە سێیەمدا بەتاوای (کات) دێت, یاخود:

لەرزین لەترسی سەرما ترسی نەما لەسەرما

برکی ئەدەم لەبەرما بەرگی گرانی سەرما

(کاکەیی: دیوان و یاداشتی شاکەلی:١٠٨)

ئەمەیش پایە بەرزی و ماندوێتی شاعیر بەدیار دەخات لەم شیعرەیدا کە چۆن گرنگی بەزمانی شیعری داوە لە شیعرەکانیدا، کە لەبەیتەکەدا دووجار وشەی (سەرما)ی بەکارهێناوە و هەرجارە و بۆمەبەستێک و جارێک مەبەستی لە کەش و هەوای ساردییە و جارێکیش مەبەست لە(سەر) ی خۆیەتی.

بەڕاستی ئەمەیە ئاست بەرزی زمانی شیعرییەکەی شاکەلی، سەرباری ئەوەی نیشانەی بەرزی زمان و فەرهەنگی شاکەلی نیشان دەدات، کە چۆن وشەکانی سازکردووە و بەرگێکی شیعری نوێی بەبەردا کردووە. کەواتە: شیعر تەنها مەودای پێوەندییەکی ڕووپێوی بە فەرهەنگی وشەوە نییە، یاخود تەنیا بەمەبەستی حاڵات بەکار ناهێندرێت، بەڵکو لەڕێگای بەکارهێنان و پێدانی واتای نوێوە دەبوژێندرێتەوە و دەبێتە سەرچاوەی واتا بەخش.

دیارە, ئەو زمانە شیعرییەی کە شوێنکەوتوانی شیعری کلاسیکی کوردی, شیعرییان پێ نوسیوە, هەتا کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم, وەک قۆناغی یەکەم، بە ڕوونی و باوی, زمانێکی تێکەڵبووە لە وشەی عەرەبی و فارسی و تورکی, لەژێر ئەم کارتێکەرییەدا شاعیرانی گەرمیان بێبەری نەبوون و لەگەڵ ئەوەشدا ڕوخسار و زمانەشیعرییەکەیان پێ دەوڵمەند کردووە, ئەو شێوازە زمانەیش, شۆڕبووەوە هەتا گەشتووەتە شاعیرانی گەرمیان و ئەمانیش سەرباری ئەوەی خوێندکار و دەرچووی حوجرەکان بوون, هاوکات لێهاتوویی خۆیان بەو زمانە شیعرییە تێکەڵەی ئەو سەردەمە دەرخستووە, ئەوتا (مینە جاف١٩٦٥-١٩١١ ) لە غەزەلێکدا, ئەمەی بەرجەستەکردووە و دەڵێت:

مەرحەبا ئەی شاهی دەوران ڕەحمەتەن لیلعالەمین

مەرجەبا ئەی شەهسواری مەحشەرو و سالاری دین...

(عەزیز گەردی: ڕابەری کێشی شیعری کلاسیکی کوردی:٥٨٩)

دەبینین زمانی شیعری شاعیر, تێکەڵ و پڕ لە وشەی فارسی و عەرەبییە, لەو بەیتەی سەرەوەدا بە جۆرێک هەریەک لە وشە عەرەبییەکانی: (مەرجەبا, دەوران, ڕەحمەتەن لیلعالەمین, مەحشەر, دین...) و هەروەها هەریەک لە وشە فارسییەکانی: (شاە, شەهسوار...)ی بەکارهێناوە.
لە بەیتێکی تریشدا دیسان ئەو توانا زمانییەی خۆی بەرجەستە دەکاتەوە و دەڵێت:

هات بەجارێ کاولی کرد چەرخی بەد گەردش بەقین

مەرجەعی زومرەی فەقیر و جێی هەتیو و موتتەقین...

(عەزیز گەردی: ڕابەری کێشی شیعری کلاسیکی کوردی:٥٩٢)

دیسان وشە عەرەبییەکانی: (قین, مەرجەع, فەقیر, موتتەقین...) و هەروەها هەریەک لە وشە فارسییەکانی: (چەرخی بەد, گەردش...)ی بەکارهێناوە و زمانی شیعری (مینەجاف)ی دەرخستووە کە هاوشێوە و لەسەر بنەمای نوسینی شیعری کلاسیکی کوردی نوسیونی و توانای شاعیرێتی خۆیشی پێ دەرخستووە.

دیارە کەزمانی شیعر زمانێکی بەرزو کاریگەرە و لە سەروی توانای ئادەمیزادی ئاساییدایە، بۆیە دەگەینە ئەو بڕوایەی کە شیعر جۆرە زمانێکە و هەموو کەسێک دەستی نایگاتێ، تەنها ئەوانە نەبێ کە جۆرە توانایەکی نموونەیی و تایبەتیان هەیە, زمانی شیعری لای شاعیرانی گەرمیان, هەروەک شاعیرانی تری, زمانێک بووە کە جیا بووە لە زمان و قسەی ئاسایی ڕۆژانە و مۆرک و تایبەتمەندییەکانی شیعری تێدا بەرجەستە کراوە، زمانێک بووە, پڕ بووە لە وشە وسەنعەت کاری، ئەمە جگەی لەوەی زمانی ڕەسەنیشیان بەکارهێناوە، بۆ نمونە, (حاجی برایمی شاتری ١٩١٩=٢٠٠٠) لە شیعرەکانیدا بایەخێکی زۆری بە زمانی شیعری داوە، هەرچەند لە کەش و هەوای گەرمیان و لە ناو جافەکانی گەرمیان و لە ژیانێکی سادەی گوند نشینی ژیاوە, لە نوسینی شیعرەکانی, بایەخێکی زۆی داوە بە زمانە شیعرییەکەی, زۆیک لە شیعرەکانی ناوەڕۆکەکەی کەوتوونەتە ژێر کاریگەری دین و پاڕانەوە و دووعای خێر و موناجات و وەسییەت و فێرکاری و...ین, لەگەڵ ئەوەیشدا لە نووسینی شیعرەکانی, زمان و تایبەتمەندی گەرمیانییانەی تێدا بەدیدەکرێت وشەی ڕەسەن و پەتی گەرمیانی بەکارهێناوە کە ئێژێ:

ڕۆژێ ئەگەڕیام لە هەردەوشاخێ

لە جێگەی ناخۆش پڕ ئاخ و داخێ...

***

سو خۆر بە ڕاسی دۆسی ڕاسمە

تەواو گوێگر و برای خاسمە...

***

گەڕیامە دواوە دڵتەنگ و ماتەم

عاجز وپەشێو دەرون پڕ لە خەم...

(شاتری: دیوانی جاف:٤٧-٤٩-٥٠)

شیعرەکانی (حاجی ئیبرایم) بەگشتی کێشی ڕەسەن(کێشی پەنجەی خۆماڵی)یان هەیە و سەرنج بدەینە ئەو بەیتانەی سەرەوە دەبینین, زمانی شیعر شاعیر, مۆرک و تایبەتمەندی گەرمیانیانەی پێوەی دیارە, کە لە شیعرەکانی بەکاری هێناوە, هەر لەو بەیتانەی سەرەوە کە قەسیدەیەکی شاعیرە و ناوەڕۆکێکی دینی و فێرکارکارییانەی هەیە بۆدین, وشەکانی: (ئەگەڕیام, برا خاس, گەڕیانی داوە...)ی بەکارهێناوە و لە وشە باوەکانی ناوچەی گەرمیان و کەلارن, بۆیە ئەمە, هەم زمانە شیعرییەکەی پێ دەوڵەمەند کردووە و هەمیش توانای شاعیرێتی خۆی پێ دەرحستووە.

بۆیە دەگەینە ئەو بڕوایەی کە:

زمانی شیعری, وەک زمانی دووەمی شاعیر و لەگەڵ زمانی ئاسایی ڕۆژانە, تێکەڵکردنی ئەم دوو زمانە, و دروستکردنی وێنەی هونەری جوان, لای شاعیرانی گەرمیان, ڕەنگی داوەتەوە, کە توانییویانە چ بە زمانە تێکەڵییەکەی کلاسیکی و چ بە بەکارهێنانی وشەی ئاسایی ڕۆژانە لە شیعرەکانیان, دەقی شیعری جوانی لێ چێ بکەن.

شاعیرانی گەرمیانیش, زیاتر لە زمانێکیان زانییوە, بەتایبەت زمانی عەرەبی و فارسی, ئەمەیش بووەتە بە هێزی زمانی شیعرییان و ڕووخساری شیعرەکانیان پێ ڕازاندووەتەوە.

هەروەها, ڕوویەکی تر, گرنگی شیعری شاعیرانی گەرمیان, هێندە خزمەتیان بە شیعر و ئەدەبیاتی و شیعری و کتێبخانەی کوردی کردووە, بەداخەوە هێندە لێکۆڵەران گرنگی و بابەخ و خزمەتیان بە شاعیران نەکردووە و بە باسی زانستی و کۆنفۆانس و لێکۆڵینەوە, لێهاتووی ئەم شاعیرانە و توانای شاعیرێتیانیان دەرنەخستووە.

## سەرچاوە سود لێ وەرگیراوەکان

١- ئومێد بەرزان برزۆ (د.)، زمانی شیعری لە شیعرەکانی شاعیر(شێخ ئەحمەدی شاکەلی)دا، پاشکۆیەکی ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ، ئابی ٢٠٠٧.

٢- ئەرەستۆ، هونەری(شیعر) ناسین، وەرگێڕانی لە ئینگیزببەوە (عەزیز گەردی)، چاپخانەی گەنج ، سلێمانی ٢٠٠٤.

٣- ئاسۆ عومەر مستەفا، بەها ئیستاتیکیەکانی شیعر، چاپخانەی خانی (دهۆک)، چاپی یەکەم،

ساڵی چاپ ٢٠٠٩.
٤- ئازاد ئەحمەد مەحمود، بونیاتی زمان لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، چاپخانەی حاجی هاشم (هەولێر)، چاپی دووەم، ساڵی چاپ ٢٠١٢.
٥- هیمداد حوسێن (د.)، دەروازەیەک بۆ ڕەخنەی ئەدەبی کوردی، چاپخانەی خانی(دهۆل)، چاپی یەکەم، ساڵی چاپ ٢٠٠٧.
٦- هاشم عاصی کاکەیی، دیوان و یاداشتی شێخ ئەحمەدی شاکەلی شاعیروخواناسی دەشتی گەرمیان، چاپی پێنجەم.
٧- محەمەد عەبدولکەریم ئیبراهیم، پێکهاتەی زمانی شیعری لە ڕوانگەی ڕەخنەی ئەدەبی نویوە ئەزموونی شاعیرانی هەشتاکانی هەولێر وەک نموونە، چاپخانەی موکریانی(هەولێر)، چاپی یەکەم، ساڵی چاپ ٢٠١٢.
٨- مەحەمەد ئەحمەد سەعید (کەساس جەباری) (د.)، کەرکوک و بزافی شیعری کوردی، چاپخانەی سەردەم، چاپی یەکەم، ساڵی چاپ ٢٠٠٨.
٩- عبدولقادر محەمەد ئەمین، وێنەی شیعر لە ڕێبازی ڕۆمانسیی کوردیدا، چاپخانەی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٢.
١٠- خانزاد عەلی قادر، زمانی شیعری حاجی قادری کۆیی و مەحوی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی، چاپخانەی حاجی هاشم (هەولێر)، ساڵی چاپ ٢٠١٢.
١١- حاجی ئیبراهیمی شاتری، دیوانی شاتری, چاپی یەکەم ١٩٨٩.
١٢- جمال حبیب الله (بێدار)، دەروازەی شیعر ناسین.
١٣- ڕێبوار محمد مەلازادە (د.), شێوازناسی لە ئەدەبدا, دەزگای ئاوێر, چاپی یەکەم, هەولێر٢٠١٩.



# ڕۆڵی سەنتەری چالاکیی گەنجانی کەلار، لە پێشخستنی کایە جیاوازەکانی ناوچەکەدا

سەردار نۆڕی

سەنتەری چالاکیی گەنجانی کەلار، سەربە ڕێکخراوی منداڵپارێزی کوردستانە، لە پرۆگرامی گەشەپێدانی تواناکانی گەنجان و ئامانجیان دەستەبەرکردنی دوارۆژێکی باشترە بۆ گەنجان، لە ڕێگەی دابینکردنی کەشێکی گونجاو بۆیان، تا بتوانن توانا و ئارەزووەکانیان دەربخەن و پەرەی پێبدەن. منداڵپارێزی کوردستان لە نۆ شار و شارۆچکەی کوردستان سەنتەری چالاکیی گەنجانیان کردووەتەوە، چونکە گرنگیی مامەڵەکردن لەگەڵ گەنجان، دایکان و باوکانی داهاتوو، لەپێناو داهاتوویەکی باشتر بۆیان، هەمیشە لە پێشەنگی کارەکانی منداڵپارێزی کوردستاندایە.

سەنتەری چالاکیی گەنجانی کەلار، وەک ناوەندێکی هونەری و وەرزشی و پەروەردەیی و ڕووناکبیری و مەدەنی و مرۆیی، لە هاوینی ساڵی ٢٠٠٢ دامەزراوە. دامەزراندنی ئەم سەنتەرە لەو کاتەدا، لەپای هەستکردن بە بۆشاییەک و وەک پێویستیەک لە بواری خزمەتکردن بە گەنجان لە هەردوو ڕەگەز؛ هاتووەتەدی و کردنەوەی وەک خەونێک بووە بۆ گەنجان. بۆیە هەر لەسەرەتای کرانەوەیەوە تا ئێستاش، هەمیشە ئامێزێک بوو بۆ دەیان هەزار گەنج، کە ڕۆژانە بۆ بەشداربوون و سوودمەندبوون، وەک فێرخوازی تامەزرۆ بۆ خول و بەشە جیاوازەکانی سەنتەرەکە، لە (شێوەکاری و میوزیک و وەرزش




«تۆپی سەرمێز و شەترەنج» و کۆمپیوتەر و کتێبخانە و ڕاهێنانی پیشەیی و زمانەوانییەکان و هۆشیاریی گشتی و وۆرکشۆپ و کۆڕ و سیمینارە جیاوازەکانی «لە ئەدەبی و سیاسی و فیکری و گەشەپێدانی مرۆیی و...هتد» و کاری خۆبەخشی و...هتد) ئەمانە و چەندان بەشی تریش؛ کە ساڵانی دواتر بەردەوام لە زیادکردن و پێشکەوتندا بوون، هەر لە سەرەتاوە ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبووە، لە پێگەیاندن و بەرەوپێشبردنی گەنجانی دەڤەرەکە و دروستکردنی کادیری زۆر باش و بەتوانا لە کایە جیاوازەکاندا، بۆ خزمەتکردن لە کەرتە جۆراوجۆرەکانی ناوچەکەدا.

لەسەرەتای دامەزراندنی سەنتەرەوە، ماوەی چەند مانگێک (خالید عەلی قادر- کە هەمان کات بەڕێوەبەری سەنتری چالاکیی گەنجانی دەربەندیخان بوو) ئیشوکارەکانی سەنتەرەکەی ڕایی دەکرد، تا ئەو کاتەی یەکەمین بەڕێوەبەری سەنتەر بەناوی (عەلی حسێن) وەک بەڕێوەبەری کاربەڕێکەر دەستبەکار بوو، لەگەڵ ستافەکەیدا کاری باشیان کرد و سەنتەرەکەیان خستەسەر پێ. دواتر (محمد سابیر کەمەر) بەشێوەی فەرمی بوو بە بەڕێوەبەر و ساڵانێک لەگەڵ ستافەکانیدا خزمەتی زۆر باش و بەرچاویان بە گەنجانی سەنتەرەکە و دەڤەرەکە کرد. لەدوای ئەویش (سامان عەزیز) وەک بەڕێوەبەری سەنتەر دەستبەکار بووە و ئەمیش لەگەڵ ستافەکانیدا خزمەتی گرنگ و بەرچاویان کردووە. پاشان (نەبەز حەمید) لەساڵی ٢٠١٠وە وەک بەڕێوەبەری سەنتەر «لەبینای نوێ و تایبەت بە سەنتەرەکەدا» دەستبەکار بووە و تا ئێستاش بەردەوامە، لەگەڵ ستافێکی کارامەدا «ناوەناوە هەندێ کارمەند دەگۆڕدرێ» بەردەوامن لە ئەنجامدانی کاروچالاکیی جۆراوجۆر، بۆ خزمەتی گەنجان.

لەسەرەتای دامەزراندنی ئەم سەنتەرەوە، بۆ ماوەی هەشت ساڵ لە گەڕەکە جیاوازەکانی کەلاردا لە خانووی کرێدا بووە، لەو ساڵانەشدا بەهۆی تەسکیی ڕووبەری بینا و کەمیی ژوورەکانیەوە، سەرەڕای کۆمەڵێک کاروچالاکیی باش و پێگەیاندنی هەزاران گەنج لە بواری جۆراوجۆردا، بەڵام بەپێی تمووحی ستاف و کارمەندانی نەبووە، چونکە هەمیشە خەونی کارکردنی زۆرتر و باشتریان هەبووە، لە ڕووبەرێکی فراوانتردا.

ماوەی دە ساڵە سەنتەری چالاکیی گەنجانی کەلار، لە بینایەکی دوو نهۆمیی تایبەت بەخۆی دایە، لەسەر ڕووبەرێکی زۆر باش و فراوان و شایستە بە گەنجانی دەڤەرەکە. گشت بەشەکانی سەنتەر، لەلایەن ستافی کارامە و پسپۆڕەوە کە هەموویان لە ماوەکانی ڕابردوودا فێرخواز و سوودمەندی بەشە جیاوازەکانی سەنتەر بوونە؛ سەرپەرشتی دەکرێن، و ڕۆژانە وانە و ڕاهێنانەکان لە خولەکاندا دەوترێنەوە و ئیشوکارەکان زۆر بەباشی لەخزمەتی گەنجاندا بەڕێوەدەچن. جێی ئاماژەپێدانیشە کە کارکردنی گشت کارمەندانی ستافی سەنتەرەکە، بەشێوەی گرێبەستە.

لەماوەی هەژدە ساڵی تەمەنی سەنتەردا، دەیان هەزار گەنج لەهەردوو ڕەگەز، بەهەموو شێوەیەکی ئەرێنی لەگشت بەشەکانی سەنتەر سوودمەند بوونە. کە لەهەندێ بەشیدا «هونەر و وەرزش» گەنجان بۆ ماوەی پێنج ساڵ و زیاتریش تێیدا وەک فێرخواز و سوودمەند ماونەتەوە و دەمێننەوە.

بەردەوام سەنتەری چالاکیی گەنجانی کەلار، لە کۆمەڵێک بەشی جیاواز پێکهاتووە و بێ ماندووبوون لەخزمەتکردن بە گەنجانی دەڤەرەکە بەردەوام بوونە.

## *بەشی شێوەکاری.

بەشی شێوەکاریی سەنتەر، هەر لە سەرەتای دامەزراندنی سەنتەرەوە هەیە، مامۆستا (سەرتیپ جەبار حەمەساڵەح) یەکەمین مامۆستای ئەم بەشە بووە و لەماوەی سێ ساڵی وانەوتنەوەیدا لەسەنتەر، ژمارەیەک فێرخوازی پێگەیاند، کە ژمارەیەکیان خوێندنی هونەریان هەڵبژارد و تا ئێستاش بیردەوامن. بەدوای ئەویشدا مامۆستایان (ئاراز فازڵ، کامەران نووری، شەیما وەلید، هەردی ئیبراهیم) لە بەشەکەدا خزمەتیان کردووە، هەروەها لەساڵی ٢٠١١ەوە مامۆستا (سەردار حەمید «نۆڕێ») تا ئێستاش بەردەوامە لە خزمەتکردن و پێگەیاندنی گەنجان.

کردنەوەی ئەم بەشە، بە بەردی بناغەی دروستکردنی هونەری شێوەکاری لە دەڤەرەکە دادەنرێت، بەهۆی نەبوونی پەیمانگە و کۆلێژی هونەرەوە لە شارەکە، لێرەوە سەدان گەنجی

شێوەکاری زۆر بەتوانا پێگەیشتوون.

ئەم بەشە، مانگانە بەردەوام خولی فێربوونی شێوەکاری- نیگارکێشان دەکاتەوە، بۆ ئاستی سەرەتایی و پێشکەوتوو، کە تێیدا فێرخوازان بەهەموو کەرەستە جیاوازەکانی وێنەکێشان تابلۆ دروست دەکەن. پاشان تابلۆ و نیگارەکانیان بەشێوەیەکی جوان ڕێکدەخرێن و لە پێشانگای هاوبەشی فێرخوازەکاندا، ساڵانە لە چەند پێشانگایەکدا نمایش دەکرێت. ساڵانە پێشانگای فێرخوازانی ئەم بەشە، دەبرێنە زانکۆ و پەیمانگاکان، هەروەها بۆ شار و شارۆچکەکانیش چەندان پێشانگایان بردووە، وەک: (دەربەندیخان، سلێمانی، کفری، ڕزگاری، خانەقین، هەڵەبجە، کۆیە، چەمچەماڵ)



ژمارەیەکی بەرچاو لەو فێرخوازانەی کە تامەزۆییانە دێنە بەشی شێوەکاریی سەنتەر، ساڵانێک تێیدا دەمێننەوە و ئارەزووەکانیان پەرەپێدەدەن و خەون و خولیاکانیان دەردەخەن. پاشان هەندێکیان بۆ درێژەدان بە خوێندن، خوێندنی هونەر هەڵدەبژێرن و ڕوودەکەنە پەیمانگای هونەرەجوانەکان و ئەکادیمیای هونەرەجوانەکان، لەگەڵ ئەوەشدا وەکوو فێرخوازی سەنتەرەکە هەر بەردەوام دەبن، زۆرێک لەمانەش لە هەرە خوێندکارە ئاستبەرزەکانی پەیمانگەکانیان دەبن. بۆیە دەکرێت بڵێین: لەم ڕووەوە ئەم سەنتەرە ڕۆڵی ناوەندێکی هونەریی گرنگی لەئاستی پەیمانگەیەکدا بینیوە و دەبینێت.

هەروەها ساڵانە بەشی شێوەکاریی سەنتەر، پێشانگای شێوەکاری بۆ شێوەکارانی تریش ڕێکدەخات و بینەران لەدەوری کاری جیاوازی شێوەکارەکان لە «تابلۆ و پەیکەر و گرافیک و

سیرامیک و هەڵکۆڵین و کاریکاتێر و...هتد» کۆدەکاتەوە.
هەروەها فێرخوازانی ئەم بەشە، کاری دیواربەندی ئەنجام دەدەن و ناوەناوەش گەشتی هونەری بۆ فێرخوازەکانی بەشەکە ڕێکدەخرێت و دەچنە دەرەوە «ناو سروشت» بۆ وێنەکێشان.

## *بەشی میوزیک و بەشی ئیقاع «دەف و زەرب»

هەرچەندە ئاستی میوزیک بەگشتی لە گەرمیان لاوازە و گرووپی میوزیک لەم دەڤەرە «بە کۆمەڵێک هۆکاری جیاواز» تەمەنی درێژی نابێت. مەگەر بۆ ماوەی کاتی بۆ چالاکییەک کۆبکرێنەوە، چونکە ئەو کۆمەڵە کەسەی کە شارەزا و ژەنیاری ئامێرە جیاوازەکانن، بڵاوەیان لێی کردووە و پێویستیان بە کۆکردنەوە و خزمەتکردنی باشتر هەیە، بۆئەوەی بتوانن کاری میوزیکی باش بکەن و ژیانێکی شایستە بژین.
بەڵام هەردوو بەشی میوزیک و بەشی ئیقاعی سەنتەری چالاکیی گەنجانی کەلار، بەردەوام خولی فێربوونی میوزیک بۆ گەنجانی دەڤەرەکە، بۆ فێربوونی ئامێرە جیاوازەکان دەکەنەوە، ناوەناوە هەندێ لە گەنجەکانی گەشەدەکەن و دەتوانن بەشداریی ئاهەنگەکان بکەن. سەرەڕای ئەنجامدانی چەندان ئاهەنگ و کۆنسێرتی گۆرانی و میوزیک، لەناو هۆڵ و باخچەی سەنتەر، لە زۆرێک لە یادەکانی سەری ساڵ و هەڵەبجە و ئەنفال و نەورۆز و یادی کەلار و ڕۆژی جیهانیی منداڵان و ژنان و یادی سەنتەرەکە و منداڵپارێزی کوردستان و...هتددا بەشداردەبن، هەروەها لە چەندان بەرنامەی تەلەفزیۆنیشدا؛ لە کەناڵە جیاوازەکاندا بەشدارییان کردووە و بەرهەمی جۆراوجۆریان «لە کلاسیک و نوێ» پێشکەش کردووە.



*بەشی وەرزش.

ئەم بەشەی سەنتەر، شانبەشانی یارییە بەردەوامەکانی وەک تۆپی سەرمێز و شەترەنج، کە هەمیشەییە و ساڵانە چەندان پاڵەوانێتیی بۆ یاریزانان و گەنجان ڕێکدەخەن و سەرکەوتووەکان خەڵات دەکەن. هەروەها ناوەناوە یارییەکانی (تۆپی پێ و تۆپی باڵە و تۆپی باسکە و تۆپی دەست و ماراسۆن و ڕمبازی و تیروکەوان و دروستکردنی گەشتی شاخەوانی «بۆیەکەمجار لەساڵی ٢٠١٧» و پێشبڕکێی پاسکیلسواری بۆ کوڕان و «بۆ کچان-بۆیەکەمین جار لە ناوچەکەدا» و... هتد) ڕێکدەخات، ئەمانەش ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە لە گەشەکردن و بەرەوپێشەوەبردنی ئاستی وەرزشی گەنجان و پێگەیاندن و دروستکردنی یاریزانی زۆر باش و پێویست، بۆ قوتابخانەکان و پاڵەوانێتیی پەروەردەکانی شارەکان. هەروەها ناساندنی هەندێ لەم جۆرە یارییە وەرزشییانە و و فێربوونی هەندێ لە یارییە نامۆکان بە دەڤەرەکە. ئەمانە و سەرەڕای ڕێکخستنی هەندێ پاڵەوانێتیی وەرزشی لەنێوان قوتابخانەکانی سنوورەکە و فەرمانگە میرییەکانی شارەکەدا. مامۆستا سەروەت فایەق لە ساڵی ٢٠١٣ تا ئێستا بەردەوامە لە خزمەتکردن.



*بەشی کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت

هەر لەسەرەتای دامەزراندنی سەنتەرەوە، ئەم بەشە کراوەتەوە و تا ئێستاش بەردەوامە، لە کردنەوەی خولی مانگانە بۆ بەرنامە جیاوازەکانی کۆمپیوتەر. دەکرێت بڵێین: لەماوەی ئەم هەژدە ساڵەی تەمەنی سەنتەرەکەدا، ژمارەیەکی ئێجگار زۆری گەنجان و خەڵکی ناوچەکە، لێرەوە فێری کۆمپیوتەر بوونە. لەگەڵ ئەوەشدا ساڵانە هەندێ لە فەرمانگەکان؛ بە شێوەی گرووپ فەرمانبەرەکانیان دەنێرن بۆ فێربوونی کۆمپیوتەر، لەو ڕووەوە لەم بەشەی سەنتەر،

زۆر بە باشی سوودمەند دەبن. سەرەڕای ئەوەی ڕۆژانە بۆ سوودوەرگرتن لە تۆڕی ئینتەرنێت، ژمارەیەک گەنج سەردانی دەکەن. مامۆستا (مەهدی فەتاح) لە ساڵی ٢٠٠٩ تا ئێستا لەم بەشەدا بەردەوامە لەخزمەت کردن.

## *بەشی کتێبخانە.

شایانی باسە، ڕۆڵی کتێبخانەی سەنتەری چالاکیی گەنجانی کەلار، لە ڕۆشنبیریی ناوچەکەدا بەرز دەنرخێندرێت، چونکە زیاتر لە نۆ هەزار کتێب و سەرچاوەی جیاواز لە هەموو بوارەکاندا بەردەستن، لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام سەرچاوەی نوێ کە بڵاودەبێتەوە، بۆی دابین دەکرێت. لەگەڵ دەستکەوتنی زۆربەی ژمارەکانی «گۆڤارە ئەدەبی و فیکری و زانستی و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی و...هتد»ەکاندا، کە مانگانە و وەرزانەن، هەروەها هەفتانە ڕۆژنامەکانیش دەگەنە کتێبخانەی سەنتەر. گەنجان و خوێنەرانی تریش لە هەموو تەمەنەکاندا، سەردانی کتێبخانە دەکەن. دادەنیشن بۆ خوێندنەوە، یان بەشێوەی خواستن (استعارە) کتێب و گۆڤارەکان دەبرێنە دەرەوە، کە زیاتر خوێندکارانی قۆناغە جیاوازەکانی خوێندن تا دەگاتە «ماستەر و دکتۆرا»ش؛ بەمەبەستی خوێندنەوە یان ئامادەکردنی ڕاپۆرت یان لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی خوێندکارانی خوێندنگا و زانکۆکان، یان خوێندکارانی ماستەر و دکتۆرا، سوودمەند دەبن لە گشت سەرچاوەکان.



هەروەها هۆڵی کتێبخانەی سەنتەر، شوێنێکە بۆ دانیشتن و ناساندن و گفتوگۆی کتێب و چەندان سیمینار و چالاکیی تری ڕووناکبیری. لەگەڵ دروستبوونی چەندان گرووپی خوێندنەوە لە هەردوو ڕەگەز، کە ماوەی جارێ هەر لەوێ گفتوگۆی کتێبخوێندنەوە ڕێکدەخرێت. ئاشکرایە، گشت ئەمانەش ڕۆڵی بەرچاویان هەیە، لە بەرەوپێشچوونی کایەی ڕۆشنبیریی ناوچەکەدا. مامۆستا (شەهلا کەریم) لە ساڵی ٢٠١٣ تا ئێستا لەم بەشەدا بەردەوامە و خزمەت دەکات.

## *بەشی فێربوونی زمان و بەهێزکردنی پرۆگرام

-زمانەکان:

بەردەوام خولی فێربوونی زمانەکانی ئینگلیزی و عەرەبی و فارسی «سەرەتایی و پێشکەوتوو» لەسەر خواستنی گەنجان دەکرێنەوە و سەدان فێرخواز، بەشێوەی گرووپ، مانگانە سوودمەند دەبن. مامۆستا (شاخەوان ڕۆبیتەن) ساڵانێکە لە بەشی خولەکانی زمانی ئینگلیزیی سەنتەرەکەدا بەردەوامەلە خزمەتکردن.

ب-بەهێزکردنی پرۆگرام.

وەک هاوکارییەک بۆ خوێندکارانی کەم دەرامەت، سەنتەر هەندێ خول دەکاتەوە، بۆ بەهێزکردنی پرۆگرامەکان.

## *ڕاهێنانی خولە پیشەییەکان:

-دەلاکی.

بەشی دەلاکیی سەنتەر، کە تایبەتە بە ڕەگەزی نێر، لەڕێگەی کردنەوەی خولەکانییەوە بەشێوەی مانگانە، لەماوەی تەمەنی سەنتەردا هەلی کارکردنی بۆ سەدان گەنجی بەشداربوو ڕەخساندووە، کە بوون بە خاوەنی کاری خۆیان و بەشێکی بژێویی خێزانەکانیان دابین دەکەن. چونکە لەکۆتایی ئەم خولەدا بڕوانامەی بەشداربوون بە فێرخوازانی سوودمەند دەدرێت، کە دەتوانن کاری پێوە بکەن. هەر لە درێژەی خولەکانیدا، چەندان جار هەڵمەتی سەرچاککردنی بۆ منداڵانی شاری کەلار و ئاوارەکانی کەمپەکانی دەڤەرەکە «تازەدێ و قۆرەتوو» ئەنجام داوە.

ب-بڕین و دروومان.

ئەم بەشەی سەنتەر تایبەتە بە ڕەگەزی مێ، بەشداربووانی بەزۆری تەمەنیان جیاوازە،

چونکە ئەوانەی دێن و فێردەبن، کەسانێکن پێویستیان بە هەلی کار و بژێوی هەیە و خێزان دەژێنن. لەکۆتاییدا پێشانگا بۆ بەرهەمی دروومانەکانیان دەکرێتەوە و بڕوانامەی بەشداربوونیان پێدەدرێت. ساڵانێکە هەزاران خاتوون لەم بەشە سوودمەند دەبن.

ج-ئارایشت بۆ خانمان.

لەم بەشەدا، چەندان خانم سوودمەند بوونە، کە دوای ئەوەی بڕوانامەی بەشداربوونیان پێ دراوە و بوون بە خاوەنی ئیشوکار.

د-هەروەها هەر لەدرێژەی خولە پیشەییەکاندا، خولی فێربوونی چاککردنەوەی مۆبایل و چاککردنەوەی سپلت و بەستی بۆ ماڵان کراوەتەوە و دەکرێتەوە.

*وۆرکشۆپ و کۆڕ و سیمینار و خولی تایبەت.

ژمارەی وۆرکشۆپ و کۆڕ و سیمینار و خولە تایبەتەکانی سەنتەر، هێندە زۆرن، بێ ژمارەن، چونکە لە چەندان بواری جیاوازدا، بەردەوام ساڵانە ئەم چالاکیانەی ڕێکخستووە و ڕێکدەخات، وەک (هۆشیاریی پەروەردەیی و تەندروستی و خێزانی و ژینگەیی و یاسایی و سیاسی و ژنان و ڕەگەزی و خولی فۆتۆگرافی و وێنەگرتنی دیکۆمێنتاری و خولی ڕاگەیاندن «بینراو، بیستراو، خوێندراو» و گەشەپێدانی مرۆیی و پەرەپێدانی خود و هۆشیارکردنەوەی گەنجان لە زیانەکانی جگەرەکێشان و ماددە کهوولییەکان و ماددە هۆشبەرەکان و سایکولۆجی و...هتد) کە هەریەک لەمانەش لەلایەن کەسانی پسپۆڕەوە وتراونەتەوە و گەیەندراون بە گەنجان و سوودمەندان و بەشداربووان.





*شانۆ

هەرچەندە ئەم بەشە بەشێوەی بەردەوام لە سەنتەردا نییە، بەڵام ناوەناوە لە بۆنە و یادەکاندا گرووپی شانۆیی دروستدەکرێت و نمایش ئامادە دەکرێت. چەندان کاری «شانۆیی ستەیج و شانۆیی شەقام» نمایش کراون، لەوانە (زەمەنی سوور، سەرابستانی ئەنفال، یاخیبوونی مەرگ، پارچەکانی دڵ لێرەن، دیرۆکی ئەم دەڤەرە، گوزەری خەیاڵێک بە بیاباندا و...هتد)

*چالاکیی ئەدەبی.

هەروەها لەمیانەی چالاکییە ئەدەبییەکانی سەنتەردا، وێڕای ڕێکخستنی چەندان کۆڕی شیعر و چیرۆک و گفتۆگۆی ئەدەبی و ناساندنی کتێب و بەرهەمی نووسەران و وەرگێڕەکان و ڕێکخستنی پێشبڕکێی ئەدەبیی گەنجان، لەماوەکانی ڕابردوودا، ئەم سەنتەرە هەڵساوە بە بانگهێشتکردن و ڕێکخستنی کۆڕی شیعری بۆ ژمارەیەک لە شاعیرە دیارەکانی کورد وەک (عەبدوڵا پەشێو، ئیسماعیل خورماڵی، جەمال غەمبار، ڕۆژ هەڵەبجەیی، ساڵەح بێچار، کەژاڵ ئەحمەد و...هتد)

هەمیشە سەنتەر بە ستافەکەیەوە هاوکار بوونە، شانبەشانی دامودەزگاکانی تر، لە چەندان ئیشوکاری تردا، لە دەرەوەی سەنتەرەوە، کە ئامانجیان خزمەتکردن بووبێت بە گەنجان و بە دەڤەرەکە، لە فیستیڤاڵ و کەرنەڤاڵ و لە چالاکییە خۆبەخشی و ژینگەییەکاندا. یان لە هەڵمەتەکاندا بۆ هاوکاری لێقەوماوان و ئاوارەکان و دابینکردنی کەرەستە و پێداویستییەکانیان و...هتد. یان بە پێدانی شوێن و کەرەستە و پێداویستییە لۆجستییەکان، بە ڕێکخراو و دەستە و گرووپەکانی گەنجان و ناوەندەکانی ترش.



# ناوەندی ڕۆشنبیری ئەدیبان و نوسەرانی کەلار، چۆن و بۆ دروست بوو؟

ئەحمەد محەمەد قادر

ناوەندی ڕۆشنبیری و ئەدیبان و نووسەرانی کەلار
2019 دامەزراوە

ڕۆژێ لە ڕۆژانی مانگی یەکی ساڵی ٢٠١٩ی زاینی، بەڕێز(ساڵەح هەلاج) شاعیر و نوسەری گەرمیان پەیوەندی پێوە کردم، وتی: بیرۆکەیەکم هەیە، پێمخۆشە( من و تۆ و د.دارا و م.مستەفا سەعید) پێکەوە دانیشین و تاوتوێی بکەین. عەسری هەمان ڕۆژ بۆ پرسەیەک دەچووین پێکەوە، هەر لە نێو ئۆتۆمبێلەکەی مندا بیرۆکەکەی باس کرد، بێدوو دڵی بە دڵمان بوو..

کەمتر لە هەفتەیەک لە ماڵی هەلاج و لە ژووری کتێبخانەکەی ئەم بەڕێزانە:( هەلاج،

د.دارا حەمید، مامۆستا مستەفا سەعید، مامۆستا ڕزگار حاجی حەمید، ئەحمەد محەمەد) کۆ بوینەوە، بیروڕامان گۆڕییەوە، گرفت و ئاستەنگەکانمان باسکرد کە ئەگەری هەیە بێنەڕێمان، بە تایبەت گرفتی دارایی و شوێن و ناو و شێوازی کارکردن، بە جۆرێک لەگەڵ ناوەند و ڕێکخراو و کۆمەڵەکانی دیکە لە ڕووی سروشتی کارکردنەوە بەرکەوتە و هاوشێوە(دووبارە) نەبن...

هەموو ئەمانە نەبوونە گرفت، چونکە باوەڕمان بە خۆمان و هاوکاری و بە دەنگەوە هاتنی نووسەر و ئەدیبانی ناوچەکە هەبوو، پشت ئەستور بووین بە ئیدارەی ناوچەکە، بەتایبەت سەرپەرشتیاری ئیدارەی گەرمیان جەنابی(سەلاخ کوێخا)، لە هەمان کاتدا بۆشاییەکی فراوانی ئەدەبی و ڕوناکبیری لە شارەکەدا(کەلار) هەبوو، بێ لانە و بێ ناونیشان بوون شاعیر و ئەدیبان...

بیرۆکەکە بریتی بوو لە دامەزراندنی ئەنجوومەنێک بۆ نووسەران و ئەدیبانی ناوچەکە سەرجەم ڕەنگ و دەنگ و ئایدیا و بیروباوەڕە جیاوازەکان بە ئایین و ئاینزاکانیشەوە لە ژێر چەتری خۆیدا جێبکاتەوە.

دوای گفتوگۆ ناوی(ئەنجومەنی ئەدیبان و نوسەرانی کەلار)مان وەک سەرەتا پەسەند کرد..



### * ئەم ئەنجومەنە بۆ...؟

- جێگایەکی گونجاو و ناوەندێکی ئەدەبی ئەوتۆ نەبوون کە نوسەران و ئەدیبانی ناوچەکە کۆبکاتەوە، سوود لە توانا و زانستیان وەرگرێ.

هەرچەند( کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەلایەتی کەرکوک و سەنتەری چالاکی گەنجان وماڵی گەنجانی کەلار هەبوون، پێشتریش(بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیری گەلاوێژ) و کاک(بەرزان فەرەج



و ستافێ)، ئاوەها کارێکیان دەکرد، بەڵام ئەمانە لە ئاستی خواستی نووسەر و شاعیر و قەڵەمەکانی ناوچەکەدا نەبوون...

- لە زۆربەی وڵاتان و شارە گەورەکاندا ئاوەها ئەنجوومەنێک هەن بۆ ئەوەی کلتورو قەڵەمەکان بە یەکدی ئاشنا بکات و میوان و پێشکەشکارانی ئەم جۆرە ژانرانە لە ئامێزی گەرمی ئەدەبی خۆی بگرێ و پێداویستیەکانی بۆ دابین و دەستەبەر بکات.

- بۆ ئەوەی گەشەی ئیدارەی گەمیان و ناوچەکە لە بوارە جیاوازەکاندا، (ئەدەبی، کۆمەڵایەتی، سیاسی، فەرهەنگی، کلتوری...) لە ڕێی میوانە بانگهێشت کراوەکانەوە بگەیەنینە دەرەوەی سنووری خۆمان.

- لە پێناو پێشخستنی ئەدەبیاتی کوردیدا، ببێتە ڕایەڵەیەک بۆ لە یەکتر نزیک کردنەوەی ئەدیب و نوسەرانی گەرمیان و هەریم و هەرچوار پارچەکەی کوردستان.

پاش چەند ڕۆژێک لە تۆڕەکۆمەڵایەتیەکانمانەوە بانگەوازێکمان بڵاوکردەوە، تیایدا بیرۆکەکەمان خستە ڕوو، داوامانکرد بیرو ڕای خۆتان بنوسن؟ وەڵامدانەوەیەکی باش هەبوون و ڕەزامەندی زۆری لە سەر بوون.
ڕۆژی(٨ی ١٢ی ٢٠١٨)مان دیاریکرد بۆ کۆبوونەوەیەکی فراوان لە کتێبخانەی گشتی کەلار، نزیکەی(٣٠)کەس کۆبوینەوە، بیرۆکەکە لەلایەن بەڕێز (هەلاج)ەوە خرایە ڕوو، وەک دەستپێک بە دڵی هەموو لایەک بوو، لەسەر ناونیشان و چۆنیەتی کارکردن، هەیکەلێکی کاتی بۆ بەگڕخستن و ئامادەکاری... ستافێک لە هەردوو ڕەگەز بەگەنج و بەتەمەنەوە پێکهێنرا، ئەوەی پێویستە باسبکرێت بەڕێوەبەری کتێبخانە گشتیەکانی گەرمیان(خاتوو جیهان محەمەد) ئامادەیی دەربڕی کە لە کتێبخانە جێگامان بۆ بکاتەوە، لەبەر دووری لە ناوەندی شارەوە و بچوکی شوێنەکە نەکرا بمێنینەوە...
دامەزراندنی ئەم ئەنجوومەنە هێندە بەلامانەوە مەبەست و گرنگ بوو، هەرکە یەکترمان دیبا، بەتایبەت چوارکەسی یەکەم، قسەمان لەبارەوە دەکرد.
(هەلاج)مان ڕاسپارد بە سوود بین لە پەیڕەوی ڕێکخراوەکانی لەمجۆرە بژاردەیەک بکات، بە پێی سەردەم و سروشتی ناوچەکە لەگەڵ گۆڕانکاریەکاندا ڕەشنوسێ بنوسێ.
ڕەشنوس ئامادە بوو، دیسانەوة لەماڵ(هەلاج) کۆبووینەوە، بە پێی پێویست بژار وپوخت وشەن وکەومان کرد.

هەمان شەو ژمارەیەکی بەرچاوی نووسەر وئەدیبانی کەلارمان ناو نوسکرد. تەنانەت ئەوانەشی کە لە کەناڵە جیاجیاکانی شارەکانی دیکە کاریان دەکرد.

## * مەرجی بوون بەئەندام لەم ئەنجوومەنەدا: ـ

هەرچەند لە پەیڕەوەکەدا بە وردتر و زانستیانەتر مەرجەکان دانراون، ئەوەی وەک سەرەتا بڕیارمان لە بارەوە وەرگرت:

- پێویستە نوسەر یان ئەدیب(٢ -٣) کتێبی چاپکراو یان زیاتری هەبێت.
- لە ڕۆژنامە و گۆڤار و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکاندا هێندە بابەتی هەبێت کە مافی ئەوەی بداتێ وەک نوسەرێک وەربگیرێت.
- خاوەن قەڵەمێکی پاک و بە هەڵوێست بێت و لەگەڵ پیشەکەیدا ڕاستگۆ و پیشەییانە کاریکردبێ و لە کاری دژ بەگەل و نەتەوە نەگلابێ.
- باوەڕی بە پەیڕەو و پرۆگرامی ئەنجوومەن هەبێ و دڵسۆزانە و پیشەییانە ئەرکەکانی جێ بەجێ بکات.
- لە چوارچێوەی ئەم ئەنجوومەنەدا پێویستە نوسەر بێ لایەنیی خۆی بسەلمێنێ و ڕێز لە بیروباوەڕ و ئایین و ڕەگەزەکانی بەرامبەری بگرێت.



## * سەردانەکانمان

پاش کەمتر لە هەفتەیەک ئەم ستافە(هەلاج، د.دارا حەمید، م.مستەفا سەعید، خالیدە مەجید، جیهان محەمەد، ئەحمەد محەمەد) سەردانی هەریەک لە ئیدارەی گەرمیان بەڕێز کاک(سەلاح کوێخا) و قایمقامیەتی قەزای کەلار کاک(شەهابی حاجی ئەحمەد)مان کرد، بۆ ئاگاداربوون لەم هەنگاوە ئەدەبییەی کە ناومانە، پاش گەیاندنی پەیام و ئامانج و مەبەستمان، کاک(سەلاح) خۆشحاڵی خۆی دەربری و گوتی: لە ڕووی(مادی و مەعنەوی)یەوە هاوکار وپشتیوانتانم، ئێوە کارێکی پیرۆز و گرنگ دەکەن بۆیە من سوپاسی ئێوە دەکەم، لە ئێستاشەوە بڕۆن خانوویەکی شیاو بە کارەکەتان بگرن و وەک ئیدارە هەتا من هەبم(ئیجار)ی خانووەکەتان بۆ دەدەم و هەر پێویستیەکی کار وچالاکیتان هەبوو من دەستم بۆتان کراوە دەبێ، هەر لەو سەردانەدا پەیوەندی بە چەند دەوڵەمەندێکەوە کرد و بەشێکی باشی پۆشاک و پێداویستیەکانمانی دابین کرد...

کاک(شەهاب) خۆشحاڵی خۆی دەربڕی، پێی ڕاگەیاندین بە هەموو جۆرێک هاوکار وپشتیوانتانم. بەدەنگەوە هاتن وپشتگیریکردنی ئیدارەی ناوچەکە هێندەی دیکە موکوڕ وسووریکردین لە سەر هەنگاونان و سەرخستنی ئەم بیرۆکەیە. ڕۆژانە هاوپیشە و ئەدیب و نوسەرانمان لە هەنگا و سەردان و گۆڕانکارییەکان لە ڕێی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکانەوە ئاگادار دەکردەوە، هەستمان دەکرد دڵگەرمیەکی ئێجگار بۆ کارەکەمان لەگۆڕێدایە و ئاسۆی سەرکەوتنمان ڕونتر لە دەم کەل بەدەرکەوت...

ڕێکەوتی ٢٢ی ١٢ی ٢٠١٨ بە ئامادە بوونی(٧٨) نوسەر وئەدیبی ناوچەکە و دەرەوە لە کتێبخانەی گشتی کەلار کۆنفرانسێکمان ڕێکخست، دوای زیاتر لە(٢) سەعات گفتوگۆی چڕ وپڕ و بابەتیانە، بیرەکە و ئامانج و خواست و داواکارییەکانمان لەگەڵ هەڵوێستی ئیدارەی ناوچەکە خستە بەردەم ئامادەبوان، گفتوگۆیەکی جدی و بونیاتنەرانە بەڕێوەچوو، بە دەستکارییەکی لۆژیکیانەوە کە بگونجێ لەگەڵ بارودۆخی سەردەم و بە لەبەرچاوگرتنی خەسڵەتی تایبەتی ناوچەکە، پەیڕەوەکە پەسەند کرا , دەستەیەکی کاتی دانرا، ئەوەی زیاتر لەسەری وەستاین ئەوە بوو، کە ئەم ئەنجوومەنە تایبەت بێت بە گەرمیان یان کەلار، بە زۆرینەی دەنگ(کەلار) پەسەند کرا...

## * لەنێوان(گەرمیان و کەلار) بۆچی کەلار پەسەند کرا؟

ـ دەستەی دامەزرێنەری ئەم ئەنجوومەنە ئەزموونێکی تاڵمان لەگەڵ ئەو ڕێکخراو کۆمەڵە و ئەنجوومەنانەدا هەبوون کە لە سەر ئاستی گەرمیان کاریان دەکرد.

١ـ لەکاتی پێویستدا کۆکردنەوەی ئەندامان لە ئاستی گەرمیان(قەزا وناحیە و شارۆچکە)کاندا

زەحمەت بوون.
٢- ناوچەگەریتی لە هەندێ باردا دەهاتە گۆڕێ و، هەر شوێنێ خۆی بە مەغدور دەزانی، هەر ئەندامێ پەلی ڕێکخراو یان ئەنجوومەنەکەی بۆ شار وشارۆچکەی خۆی ڕادەکێشا بە بێ لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی و ئامانجی گشتی ئەنجوومەن یان کۆمەڵەکە.
٣- لەکاتی هەڵبژاردن و کۆنفرانسەکاندا پێویست بوو لەسەر ئاستی ناوچە و شارەکان ئەندام یان دەستەی باڵا هەڵبژێرین نەک کەسی شیاو وئیستحقاقی هەڵبژاردن، ئەمەش پێشێلی بنەماکانی دیموکراسی و پیشەیی کاری ڕۆژنامەگەری بوون.

ـ کەلار ناوەندی ئیدارەی گەرمیانە وبەشی هەرە زۆری ناوەندی کارگێڕی ئیداری و حکوومی و ڕێکخراوەی لەم شارەدان. دەتوانرێ لە هەر بۆنە ویادێکدا ژمارەیەکی زیاتری خەڵک ئامادەی بۆنە ویادەکان بکرێن.

ـ هەڵبژاردنی(کەلار) تەنها ئەوەندە بوو کە بە یاسای خۆمان نەیخەینە ژێر باریکەوە بە ئەستەم و کەموکورپیەوە کارەکانمان بەڕێوە بەرین، دەنا نەک گەرمیان بەڵکو لەسەر ئاستی کوردستانی گەورە خۆمان بۆ کار و چالاکی و بەشداری پێکردنی پارێزگا و شار و شارۆچکەکانی دیکەی هەرێمی کوردستان ئامادە کردبوو. چونکە ئەو مەبدەئەی کە لە سەری ڕێکەوتبووین تێپەڕاندنی کارە تەقلیدیەکانی پێشووتر و شکاندنی تەلیسمەکانی ناوچەگەریتی و ئاشتەوایی و قبوڵکردنی ڕەنگ و دەنگ و ئایدیا و ئایین و مەزهەبەکان بوون.

ـ هاوڕاین لەسەر ئەوەی ئەگەر ئەم ئەزموونەمان سەری گرت و پەلوپۆی زیاتر وفراوانتری بۆ قەڵەمڕەویەکی تری زیاتر کێشا لە کۆنفرانس و هەڵبژاردنی داهاتوودا چاککاری و هەمواری برگە و خاڵەکانی پەیرە و بکەین بەتایبەت گۆڕینی دەستەی دامەزرێنەر.

ڕۆژی پاش کۆنفرانس ئەم دەستەیە(هەلاج، د.دارا حەمید، م.مستەفا سەعید، خالیدە مەجید، جیهان محەمەد، موشیر عارف، فەتاح تەنیا، ئەحمەد محەمەد)، لە کتێبخانەی گشتی کەلار کۆبوینەوە بۆ دانانی لیژنەکانی کاری بەڕێوەبردنی ئەنجوومەن، بۆ ڕۆژی دواتر سەردانی ئیدارەی گەرمیانمان کرد بۆ ئاگادار کردنیان لە دوا گۆڕانکارییەکان، بۆ مەبەستی مۆڵەت وەرگرتن، دەستمان بە کارە ئیدارییەکان کرد، لە ڕێی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری گەرمیان(ئاکۆ هۆرێنی)ەوە، کە چوینە سەردانی پەیڕە و ناوی دەستەی دامەزرێنەرانمان ڕادەستی کرد و گوتی: خۆم چاودێری دەکەم...
بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ وەڵاممان نەبوو، تومەز ئێمە بە ڕێچکەی دروستی خۆیدا کاری مۆڵەتەکەمان دەستپێنەکردوە... پاش سەردانیمان بۆ ئیدارەی گەرمیان و بینینی مقدەم(حوسێن

شێرزاد) و ڕێنوێنی و چاوساغیکردین. جگە لە ڕۆتیناتی ئیداری لە ڕێی دۆست و هاوڕێکانمانەوە دنەی کارەکانمان دەدا، دوای زیاتر لە سێ مانگ لە وەزارەتەوە ئاگادار کراین کە هەڵە لە پەیڕە و ناوی دامەزراوەکەماندا هەیە، بۆیە داوایان لێکردین بۆ خۆمان سەردانی هەولێر بکەین و کارەکانمان بخەینە سەر شارێگای دروستی خۆی و هەڵە و چەوتی و گرێکۆرەکان بکەینەوە، بە چاوساغی زۆر بەڕێز(نەوزاد حەمید ـ کفری).

هەریەک لە(هەلاج، د.دارا، جیهان محەمەد، ئومێد سەعدولا، ئەحمەد محەمەد) لە ڕێکەوتی ١٧ی ٧ی ٢٠١٩ سەردانی شاری هەولێر(وەزارەتی ناوخۆمان) کرد، ئەو کەس و بەشانەمان بەسەرکردەوە کە ئیشی ئەنجوومەنەکەیان لابوو، کۆمەڵێ چاککردنەوەیان لە پەیڕەوەکەدا کردبوو، کە زۆربەیان ئیداری و هونەری بوون، داواشیان کرد ناونیشانەکەی کە ئەنجوومەن بوو بگۆڕین، ئێمەش(ناوەندی ڕۆشنبیری ئەدیبان و نوسەرانی کەلار)مان پەسەند کرد.

دوای نزیکەی چوار مانگ لە چاوەڕوانی... بەڕێز کاک(عەلی حەمە ساڵەح) لە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گەرمیانەوە ئاگاداریکردین ,کە نوسراوەکەمان گەڕاوەتەوە ئاسایشی کەلار و پێویستە ئەندامەکانمان، بە تایبەت ئەو ژمارەیەی کە لەگەڵ پەیڕە و داواکاریەکەدا ناردبوومان بۆ هەولێر سەردانی ئاسایشی کەلار بکەین و فۆرمی زانیاری پڕبکەینەوە، پاش ئامادە بوونمان دیسانەوە فایلمان گەڕایەوە ئاسایشی گەرمیان و دواتر بۆ سلێمانی و پاشتر بۆ وەزارەتی ناوخۆی هەولێر.

لە ڕێکەوتی ٢٨ی ١٠ی ٢٠١٩ بە (ژمارە: ١٩٠٤٨) مۆڵەتەکەمان بۆ هاتەوە بەڕێوەبەرایەتی گشتی ئاسایشی گەرمیان.

دوای چەند ڕۆژێک بۆ ئاگادار کردنەوە لە وەرگرتنی مۆڵەتی ناوەندەکە سەردانی هەریەک لە ئیدارەی گەرمیان و قایمقامیەتی کەلارمان کرد، نوسەر و ئەدیبانمان لە ڕێی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکانەوە ئاگادارکردەوە، هەمان ڕۆژ سەردانی بەڕێوەبەرایەتی شارەوانیمان کرد، بە سوپاسەوە کاک(بەرزان کریم مەحمود) دەستخۆشی لێکردین و گوتی: هاوکار وپشتیوانتانم، ئەوەی داوامان کرد باخچەی شارەوانی کەلار بوو، لە بەرامبەر قوتابخانەی(لیلی قاسم)، تەنها کۆشکێکی بچوکیان داینێ، شوێنی(٤) کەسی تیا دەبویەوە، چونکە هۆڵ و ژوورەکانی دیکە درابوونە ڕێکخراو سەندیکاکانی دیکە، هەرچەند چەند ڕۆژێک(هەلاج و د.دارا و بەندە) خۆمان سەرقاڵی پاککردنەوە و ئاو وکارەبای کرد، سوودی نەبوو چونکە زۆر نەگونجاو بوو بۆ ئێمە... دوای کەمتر لە هەفتەیەک هەریەک لە(هەلاج و د.دارا و مستەفا سەعید و ئەحمەد محەمەد) سەردانی کاک(ئەکرەم ساڵەح) سەرۆکی شارەوانی کەلارمان کرد، ئاگادارمان کردنەوە کە مۆڵەتەکەمان وەرگرتووە، ئەو شوێنەی پێتان داین بچوکە و کەڵکی ئێمە ناخوات، ئەگەر بکرێ هۆڵی باخچەکەشمان بدەنێ، کاک(ئەکرەم) گوتی: بۆ ئێوە سوودی نەماوە چونکە دراوەتە



تەندەر و دەرِوخێنرێ و دەکرێتە شتی تر، پێشنیاریکرد کە داواکاریەک پێشکەش بکەین بۆ پارچە زەویەک دواتر هەوڵبدەین بۆمان بکەنە بینا، بەڵکو سەربەخۆ بین، ئەمە لە کاتێکدا ڕۆژانە بە و بە سەعات لە تۆرە کۆمەڵایەتیەکانەوە شاعیر و نوسەرانی ناوچەکە سۆراغ و پرسیاری شوێن و جێگا وچارەنوسی ناوەندەکەیان دەکرد...

هەر لەو سەر وبەندەدا چەند میوانێک لە دیوانی کاک(ئەکرەم) دانیشتبوون، یەکێک لەوانە کاک(جەزا محەمەد سەمین)بوو، کەوتینە ڕاوێژ و گفتوگۆ بۆ دەستەبەرکردنی شوێنێکی گونجاو، زۆر وترا، ئەو بۆ چۆنەمان بە لاوە پەسەند بوو کە شوقەیەک لە بینای(تەلاری زانکۆ) بگرین بە کرێ، کاک جەزا گوتی: من ئامادەم وەک نوسینگەی کاک(قوباد) کرێی(٦) مانگتان بۆ دابین بکەم لە گەڵ تاقمی قەنەفەدا، نەختێ ڕەنگ بە ڕووماندا هات و سوپاسمان کرد و ئەویش خاوەنی قسەی خۆی بوو.

ڕۆژی دواتر کەوتینە پاککردنەوەی ژوری(٧)، نهۆمی(٢) لە بینای زانکۆ بەرامبەر بینای(ئەحمەدی فاتم)، ئەوەی کە پێویست بوو بۆ ناوەندەکە داوامان لە بەرپرسانی ئیدارەی شار وچەند بازرگان و دەوڵەمەند و کەسایەتی و ڕێکخراو کرد(سواڵ و سەدەقە) ناوەندەکەمان پۆشتە کرد، دەستی هەموویان خۆش بێ و هەموو ئەوانە بە قەبارەی خۆیان هاوکاریان کردووین، ناو و هاوکاریەکەیان لە ئەرشیفی ناوەندەکەماندا پارێزراوە، سوپاسیان دەکەین و نمونەیان زۆر بێ.

* دیداری وەزیری ڕۆشنبیری و لاوانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە کەلار.
ڕۆژی ٢٦ی ١ی ٢٠٢٠ لە کۆبونەوەیەکی گشتی ڕۆشنبیران و هونەرمەندان و وەرزشکاراندا لەگەڵ بەڕێز(حەمەی حەمە ساڵەح) وەزیری ڕۆشنبیری و لاوان لە بینای نوێی بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری گەرمیان کۆبوینەو...
پاش کۆبونەوەکە بە نوێنەرایەتی ناوەندی ڕۆشنبیری ئەدیبان و نووسەرانی کەلار(هەلاج، جیهان محەمەد، خالیدە مەجید، کاروان عوسمان، ئەحمەد محەمەد) لەبارەی ناوەندەکەوە گفتوگۆیەکی کورت و پوختمان کرد و لە نیو(A٤)دا داواکاریەکانمان خستە بەردەستی بەڕێزیان، پاش خوێندنەوەیان ئەم خاڵانەی پێراگەیاندین:
١ـ لە بەرەی کرێی ناوەندەکەوە ڕەزامەندی دەربڕی.
٢ـ بۆ چاپکردنی کتێبی نووسەران گوتی: هەر کتێبێ بۆ کتێبخانەی کوردی گرنگ و شیاوبێ و لەلایەن ناوەندەکەتانەوە پەسەند بکرێ، دەستی بە سینگەوە گرت و گوتی: من بۆتان چاپ دەکەم.
٣ـ بۆ خەرجیەکی تایبەتی مانگانە بۆ ناوەندەکە گوتی: لە هەوڵداین وەکو وەزارەت شەن و کەوی کاری ڕێکخراو ناوەند و کۆمەڵەکان بکەین، ئەوەی لەکار کەوتووە کەناربخرێن و ئەوانەشی کاران هاوکارییان بکەین، ئەو کات هاوکارتانم.
٤ـ سەبارەت بە لینکێ لە نێوان ناوەند و وەزارەتدا گوتی: با پەیوەندیتان بە کاک(ئەیوب ڕۆستەم) ەوە هەبێ، (دیاربوو نوێنەریەتی).
سوپاسیمان کرد و وێنەیەکمان چرکاند.

لە ئێستادا ڕۆژانە کات ژمێر(٣)ی دوا نیوەڕۆ تا دەمی خۆرئاوا جگە لە ڕۆژانی هەینی ئامادەییمان لە ناوەندەکە هەیە و ڕۆژانە شاعیر و ئەدیب و نوسەران سەردانمان دەکەن، هەست دەکەین لەم سەر زەمینە فراوانەی گەرمیاندا، لە نێو کەرەستەی خاوی هەزاران دەق و چیرۆک و ڕۆمان و بەسەرهاتدا ئێمە باخچەیەک، سێبەری گەزە ئاسمانێکمان بۆ قەڵەمەکان چێکردووە...
وا پێویست دەکات ئەم چیرۆکەی من لە بیرۆکەی دامەزراندنی ئەم ناوەندەوە تاکو ئێرە درێژ دادڕی تێدا بکەم، (وە خالق زیاتر مانوبووین و خاترم گرتوون). چونکە هێندە بەرچاومان ڕوونە...
دوا قسەشم لێرەدا هەر ئەوەیە پێویستمان بە هاوکاری و هەماهەنگی هەموو ڕەنگ و دەنگ و ئایدیا و بیرو باوەڕەکان بێ جیاوازی هەیە، بۆ گەشە و برەودان بە بزاوتی ڕۆشنبیری گەرمیان...
لە ئێستادا بە هاوکاری ئیدارەی گەرمیان، ڕۆشنبیری گەرمیان بەڕێز(سەربەست ئەحمەد) سەرقاڵی خۆئامادە کردنین بۆ(دیداری شێروانە) لەسەر ئاستی کوردستانی گەورە، من دییەم ئێشاندن و دانیشن وە خەیر.

به هیوای دیدارێکی سەرکەوتوو.

هەرێمی کوردستان - عێراق
ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی ناوخۆ
بەڕێوەبەرایەتی گشتی ناوخۆ
بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵەکان

إقليم كوردستان - العراق
مجلس الوزراء
وزارة الداخلية
المديرية العامة للداخلية
مديرية الجمعيات

ژمارە / العدد : ١٩٠٤٨ ‏ ‏ ‏ ‏ ڕێکەوت / التاریخ : ٢٨ / ١٠ / ٢٠١٩

## فەرمانی وەزاری

بەپێی ئەو دەسەڵاتەی کە پێمان دراوە ، بە پێی هەردوو ماددەی (٧ ، ٨) لە یاسای ژمارە (١٨)ی ساڵی (١٩٩٣)ی کۆمەڵەکان وە بەبوونی مەرجەکانی یاسایی لەداواکاری دامەزراندنی ، بۆیە بڕیارماندا :-
بە پێدانی مۆڵەتی دامەزراندن بە (ئاوەندی ڕۆشنبیری ئەدیبان و نووسەرانی کەلار) کەبارەگای سەرەکی لە شاری کەلار دەبێت لە ڕێکەوتی دەرچوونی ئەم فەرمانە .

ڕێبەر احمد
وەزیری ناوخۆ

**وێنەیەک:-**

- دیوانی چاودێری دارایی بۆ زانین لەگەڵ ڕێزدا.
- گشت پارێزگاکانی هەرێمی کوردستان (هەولێر - سلێمانی - دهۆک - هەڵەبجە - ئیدارەی گەرمیان - ئیدارەی ڕاپەڕین) بۆ جێ بەجێ کردنی کاری پێویست
- گشت بەڕێوەبەرایەتیە گشتیەکانی هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ ( ) بۆ جێ بەجێ کردنی کاری پێویست .
- دەزگای ئاسایشی هەرێم نووسراوتان ژمارە ([illegible]) لە ٢٠١٩/٩/٢٢ بۆ زانین لەگەڵ ڕێزدا.
- بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵەکان.
- ئاوەندی ڕۆشنبیری ئەدیبان و نووسەرانی کەلار.
- دۆسیەی تایبەت.
- خولاو.

Kurdistan Regional _ Erbil _ Nr. 5do
٢٠١٩/١٠/٢٠



# هێنانی یەکەم بەداله بۆ کەلار لە ساڵی ١٩٥٣

مستەفا سەعید عەلی

هێنانی بەداله لە ساڵی ١٩٥٣ بۆ گوندی کەلاری کۆن، بەر لە ٦٧ساڵ ڕوداوێکی گەورە بووە. بۆیە نابێ لە سەری نەوەستین و هەروا بە سادەیی بە سەریدا تێپەڕین بە تایبەت لەو سەردەمەدا لە زۆربەی گوندەکانی کوردستان قوتابخانەش نەبووە چ جای دانانی ئامێرێکی گرنگی وەک بەداله.

بۆ ئەو مەبەستە لە شەوی ٢٨ لە سەر ٢٩/١/٢٠١٣ سەردانی شێخ محەمەد سەعیدشێخ حەسەنم کرد، کە خۆی فەرمانبەری هێڵ بووە لەسەر ئەو بەدالەیە، بەمجۆرە باسی هێنانی یەکەم بەدالەی کرد بۆ کەلار:

ساڵی ١٩٥٣ ڕۆژێکیان ئەحمەد بەگی جەمیل بەگی بابان، میوانی داودبەگی جاف دەبێت لەکەلاری کۆن، داود بەگ ئەوکاتە نائب واتە(ئەندامی پارلەمانی عێراق دەبێت.

لە کاتی قسەکردنیاندا داودبەگ پێی دەڵێت: ئەحمەد بەگ دەمەوێت بەدالەیەك بهێنم بۆکەلار. ئەحمەد بەگ دەڵێت: ناتوانیت.

داود بەگ دەڵێت: ئەگەر هێنام؟.

ئەحمەد بەگ دەڵێت: بەشاهیدی هەرچی لەم دیوەخانەیە میوانداری تۆ و موتەسەڕیف( پارێزگار)ی کەرکوک و قایمقامی کفری هەرچی لەم مەجلیسەدایە دەکەم.

بەڵام ئەگەر نەتهێنا دەبێت تۆ میوانی هەمووومان بکەیت.
دوای ئەوە داود بەگ دەچێت بۆ بەغداد یەکسەر دەچێتە لای( شێخ باباعەلی کوڕی شێخ مەحموودی حەفید)ی وەزیری پۆستە و گەیاندن و مەسەلەکەی بۆ باس دەکات، شێخ بابەعەلی پێی دەڵێت: داودبەگ هەرچیم لە دەست بێت قوسورت لەگەڵ ناکەم، بۆیە پێکەوە هەردووکیان دەچنە لای(سەعید قەزاز) وەزیری ناوخۆ، ئەویش ڕەزامەندی لەسەر دەردەبڕێت و دوای ئەوە دەچنە لای(نوری ئەلسەعید)ی سەرۆک وەزیران، شێخ باباعەلی بە(نوری ئەلسەعید) دەڵێت: قوربان ئیمکانیاتی ئەوەمان هەیە بەدالەیەک بدرێتە کەلار. (نوری ئەلسەعید)یش یەکسەر ڕەزامەندی لەسەر دەردەبڕێت. بەو جۆرە فەرمانبەرانی فەرمانگەی بەدالەی کفری و کەرکوك دەخرێنەکار بۆ ڕاکێشانی هێڵی تەلەفون لە کفرییەوە بۆ کەلار.
لە کۆتایی مانگی ١٠ی ساڵی ١٩٥٣ کارکردن لە ڕاکێشانی هێڵەکە و دانانی بەدالەکە و ڕاکێشانی هێڵ بۆ ماڵەکان تەواو دەبێت، یەکەم قسەیەک پێی دەکرێت داودبەگ دەڵێت: ماڵی ئەحمەد بەگم بۆ وەرگرن(ئەو کات ماڵی ئەحمەدبەگ لە گوندی قنگربانی کفری دەبێت) کە قسەی لەگەڵ دەکات دوای چاک و چۆنی ئەحمەدبەگ دەڵێت: داودبەگ لە کوێوە قسە دەکەیت؟
داودبەگ دەڵێت: وەڵا لە کەلارەوە.
وتی: چۆن؟!
داودبەگ دەڵێت: بەدالەمان هێنا و دامانمەزراند و واقسەشی پێدەکەین و تۆش دەعوەتەکە قەرزدار بوویت.

لە وەڵامی ئەو پرسیارەی بەدالەکە چەند هێڵ بووە و کێ یەکەمجار کاری لە سەر کردووە.
وتی: بەدالەکە یەکەمجار کە هێنرا تەنها(١٤) هێڵ بوو، یەکەم کەس کاری لە سەر کرد کوڕێکی خەڵکی کفری بوو بە ناوی(عەباس) زۆرکەم مایەوە، دوای ئەو کوڕێکی تریان لە کفرییەوە هێنا ناوی( نەجاتی کەریم ئاغا) بوو، ئەمیش تەنها(٥ بۆ ٦) مانگێک مایەوە و ڕۆیشت دوای ئەوان(ئەکرەم عەلی بەکرئەلخالدی)یان هێنا کە لە(١٩٥٤)وە تا(١٩٥٨) ئەو کاتەی کۆچی دوایی کرد لەسەر بەدالەکە مایەوە. لەکەلاریش ئەمانە دامەزراون:(محەمەد غەریب حەمە ساڵح، فەتاح عەزیز سەید موراد، محەمەد ئەمینی نەریمان).

له وەڵامی ئەو پرسیارەی ئەی تۆ چۆن دامەزرایت وتی: داودبەگ داوای لێکردم له سەر بەداڵەکە کاربکەم، بۆیە لەگەڵ خۆیدا بردمی بۆ بەغداد و چوینە لای(ئەحمەد عەدنان ئەلحافز) بەڕێوەبەری پۆستە و گەیاندنی عێراق و داود بەگ داوای لێ کرد دامبمەزرێنێت، ئەویش عەریزەکەی لێ وەرگرتین و

وتی خۆم بۆتانی تەواو دەکەم، هەرواش بوو، دوای سێ، چوار ڕۆژ فەرمانی دەرچونم بۆ دەرچوو بە ڕۆژی(٣٠٠)فلس.
هەموو ماڵێک توانیویەتی هێڵی تەلەفون ڕابکێشێت بەو مەرجەی توانای دادایی یاریدەدەر بوو بێت و هێڵی تەلەفون تایبەت نەبووە بە ماڵە بەگزادەکانەوە. بە بەڵگەی ئەوەی هەردوو ماڵی(عوسمانی حەسەن خدر و عومەری حەسەن خدر) بەگزادە نەبوونە و هێڵی تەلەفونیان هەبووە.
سەرەتا بەداڵەکە تەنها پەیوەست بووە بە کفری و جەلەولا و باوەنورەوە، بەڵام دواتر پەیوەست کراوە بە دەربەندیخانەوە، چونکە لەوکاتەدا دەربەندیخان ڕاستەوخۆی لەگەڵ بەغداد دا هەبووە. توانراوە لە ڕێگەی هێڵی دەربەندیخانەوە لە گەڵ بەغداد دا قسە بکەن.
بەداڵەی کەلار لە ساڵی(١٩٥٣) تا ساڵی(١٩٦١) لە خانویەکی قوڕدا بوە لە کەلاری کۆن، بەڵام بە هۆی نائارامی دۆخی ناوچەکەوە لە ساڵی(١٩٦١)وە حوکمەت بەداڵەکە لە کەلارەوە دەگوازێتەوە بۆ کفری بەداڵەکە. کەلار لە ساڵی(١٩٧٠) دەکرێتە قەزا و دام و دەزگا ئیدارییەکانی لێدادەمەزرێت، بەداڵەکە لە ساڵی(١٩٧٢) لە کەلاری کۆنەوە دەگوێزرێتەوە بۆ خانویەکی(حەمید بایز) لە نێو سەنتەری شار. ماوەیەکیش لەوێ دەبێت تا لە ساڵی(١٩٧٣) لە تەنیشت بنکەی پۆلیس، کە ئێستا فەرمانگەی پۆستە وگەیاندنی کەلارە، بە خشت و قوڕ دوو خانو هەیوانێکی بۆ دروستدەکەن و بەداڵەکە دەهێننە ئەو خانووە تا ساڵی(١٩٨١) تا ئەو کاتەی بینایەکی تازە بۆ پۆستە وگەیاندنی کەلار دروست دەکەن هەر لەو خانووە قوڕەدا مایەوە. بەڵام پاشان هێڵەکانی بەداڵەکە فراوانتر کراو کرایە زیاتر لە(١٢٠) هێڵ، وە هێڵی ژمارە یەکیش درایە فەرمانگەی قایمقامیەت.

ناوی مەئمور بەدالەکانی کەلار لە ساڵی ١٩٥٣ وە:

١ـ عەباس ١٩٥٣
٢ـ نەجات کەریم ئاغا ١٩٥٤
٣ـ ئەکرەم عەلی بەکر ئەلخالدی ١٩٥٤ ـ ١٩٥٨
٤ـ لطفی عبدالقادر ١٩٥٨ ـ ١٩٦١ (١٩٦١ ـ ١٩٧٣ براوە بۆ کفری)
٥ـ علی عبدالحسن زویر -١٩٧٣ ١٩٧٦
٦- فائق مدحت حسن ١٩٧٦ – ١٩٧٧٧
٧ـ کریم رحیم کریم ١٩٧٨ ـ ١٩٧٨
٨- یاسین محمد علی ١٩٧٩ ـ ١٩٨٣
٩- فائق مدحت حسن ١٩٨٣ ـ ١٩٨٩
١٠- سامیە حسین محمد ١٩٨٩ ـ ١٩٩٤
١١ـ حمید محمد علی ١٩٩٤ ـ ١٩٩٧
١٢ـ کریم رحیم کریم ١٩٩٨ ـ ١٩٩٨
١٣ـ یوسف غفور خضر ١٩٩٨ ـ ٢٠٢٠

# گەشەی شارنشینی لە کەلار بە پێی تیۆری دانێل لێرنەر



مەجیدساڵح

پێشەکی:

گەشە و پەرەسەندنی شارنشینی و ئەو دیاردانەی کە لە ژیانی شارنشینیەوە سەرهەڵدەدەن، بابەتێکی گرنگن بۆ لێکۆڵینەوە. ئەوەش وای کردوە فەیلەسۆف و بیرمەندان چەندین پێناسە بۆ شار و شارنشینی بخەنەڕوو. شار وەک شوێنی نیشتەجێ بوونی کەسانێک کە کاری کشتوکاڵی ناکەن و سەرقاڵی کاری دیکەی خزمەتگوزاری و پیشەسازی جیاجیان دروست بوون.

رەنگە لە نێو ئەو پێناسانەی بۆ شار کرابێ کەس وەک ئەنگلس و مارکس وەک دوو فەیلەسۆفی گەورەی کۆمەڵناس بە وردی پێناسەیان نەکردبێ، ئەوان پێیان وایە «شار شوێنی گردبوونەوەی خەڵک، کەرەستەی بەرهەمهێنان، سەرمایە، نیاز و پێداویستییەکانە و تێیدا دابەش بوونی کاری کۆمەڵایەتی ڕوودەدات».

جوگرافیزانەکانیش شاریان بە دیمەنێکی دەستکرد لەقەڵەم داوە کە تێدا شەقام، بینا، دامودەزگاکان و ئاپارتمان ژیانی شارنشینی بۆ خەڵک فەراهەم دەکەن. مێژوو نووسانیش بە پێی کۆنی و دێرینی دەڕواننە شارەکان و ئابورینا سەکانیش پێیان وایە

شار ئەو جێگەیە کە خەڵکەکەی سەرقاڵی کشتوکاڵ نین، شارەزایانی بواری دانیشتوانیش زۆری ژمارەی دانیشتوان بە پێوەر دەزانن بۆ شار.

شارنشینی رەوتێکە تێیدا گۆڕان لە پەیکەری کۆمەڵایەتی خەڵک و شوێنی نیشتەجێبوونیان روودەدات، ئەو گۆڕانەش بەرهەمی زۆری دانیشتوان و کەڵکە بوونیانە لە جێگەیەک. بەشێوەیەکی گشتی شارنشینی دوو خەسڵەتی تێدایە:

یەکەم: کۆچی خەڵک لە گوندەوە بۆ شار لە پێناوی دۆزینەوەی کار و چالاکییەک کە کشتوکاڵی نییە.

دووەم: گۆڕانکاری لە ستایلی ژیانی خەڵک لە گوندییەوە بۆ شاری، ئەوەش دەبێتە گۆڕان لە بەهاکان و رەفتار و دیدگاکان.

لە چەند سەدەی رابردودا، لەسەر ئاستی جیهان توێژەران، جوگرافیزانان، کۆمەڵناس و ئابوریناس و ئەوانەی گرنگی بە دانیشتوان دەدەن، بەهەزاران توێژینەوەیان لەسەر شار و شارنشینی ئەنجامداوە. بەڵام لە ناوەندە ئەکادیمی و زانستییەکانی کوردستاندا کەمترین ئاوڕیان لێدراوەتەوە.

ئەم بابەتە هەوڵێکی سەرەتاییە تاوەکو لە روانگەی ‹دانێل لێرنەر›ەوە ئەو هۆکارانە بخاتەڕوو کە وایان کردوە کەلار و خەڵکەکەی هەنگاوی باش بنێن بۆ شار و شارنشینی.

## تیورەکەی دانێل لێرنەر:

دانێل لێرنەر (١٩١٧-١٩٨٠) زانا و کۆمەڵناسی ئەمریکییە، خاوەنی تیۆری مۆدێرنیزە. لە تێورییەکانیدا جەختی لەسەر دۆزینەوەی ئەو پرسیارە دەکردەوە «ئەو هۆکارانە چین وا دەکەن کۆمەڵگایەک لە کۆمەڵگایەکی دیکە زیاتر ئامادەیی تێدایە بۆ گۆڕان بەرەو مۆدێرنە؟» هەر لەو پرسیارەشەوە دەستی کرد بە گەڕان بەدوای جیاوازییە زیهنی و فەردی و کۆمەڵییەکانی کۆمەڵگاکان؛ لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانیدا گەیشتە ئەو دەرئەنجامەی کە جیاوازیەکە لەو بەهایەدایە کە کولتوورە کۆمەڵایەتییەکان دەیبەخشنە راوێژ و دانوسان لە بەرامبەر کەلەڕەقی و سوربوون لە سەر بیرورا.

دانێل لێرنەر، ساڵی ١٩٥٨بە نووسینی کتێبی «گوزەر لە کۆمەڵگای تەقلیدی»، یەکەمین کەسە کە لێکۆڵینەوەیەکی وردی سەبارەت بە تێپەڕبوونی کۆمەڵگا تەقلیدییەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەرەو کۆمەڵگای مۆدێرن ئەنجامدا. هەرکەسێک لەوە بەدوا لەوبارەوە لێکۆڵینەوەی کردبێ شوێن پێی ئەوی هەڵگرتووە.

بەبۆچوونی لێرنەر، پێشمەرجی مۆدێرنە کردنی ئابوری و کۆمەڵایەتی، نەهێشتنی نەخوێنەواری و بەرزکردنەوەی ئاستی فێرکردن و بڵاوبوونەوەی کەناڵەکانی راگەیاندنە. ئەو پێی وایە

کۆمەڵگایەک کە زۆرترین ژمارەی دانیشتوانەکە خوینەوار بێت و کەڵک لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن وەرگرن، حەتمەن بە هۆی کەڵەکە بوونی زانیاری جۆراوجۆر جیهانبینی خەڵکەکەی دەگۆڕێت. بە ئاسانی، بەسەر ژیانی گشتیدا دەکرێنەوە، بەرامبەر یەکتر لێبوردەییان زیاتر دەبێ، چالاکی سیاسی و کولتووری و کۆمەڵایەتییان فراوان دەبێ. بە پێی تیۆرییەکەی لێرنەر، پێشکەوتنی ئابوری و کۆمەڵایەتی، خەڵک لە توندڕەوی و چەقبەستن دوور دەخاتەوە و پشت بەستن بە ئەقڵانیەت لە لایان بەهێز دەکات.

لێرنەر قۆناغەکانی مۆدێرنیزە کردنی کۆمەڵگاکانی کردوە بە چوار قۆناغەوە:

١. جوڵەی جوگرافیایی: هەموو کۆمەڵگایەک گەر بیەوێ بەرەو مۆدێرنە بچێت دەبێ ڕێژەیەکی دیاریکراوی خەڵکەکەی ببنە شارنشین. بەڕای ئەو هەر کۆمەڵگایەک گەر ١٠٪ ی دانیشتوانەکەی بکات بەشارنشین و لە هەر شارێک ٥٠ هەزار کەس بژی، ئەوا ڕەوتی مۆدێرنیزەکردن بە خاوی دەچێتە پێش، بەڵام ئەگەر ڕێژەکە لە ٢٥٪ تێپەڕێت، ڕەوتی مۆدێرنیزەکردن بە ڕادیەکی یەکسان پێشکەوتن بە خۆیەوە دەبینێ و خوێندن و فێرکردن تێدا گەشە دەسێنێ و دەچێتە قۆناغی دووەمەوە.


دانیل لێرنەر

٢. گەشەسەندنی خوێندن و زۆری ژمارەی خوێنەوارەکان. کۆچ کردن بۆ شارەکان دەبێتە هۆی گۆڕان، خواست لەسەر کاری نوێ و سەرهەڵدانی بۆنەی نوێی کۆمەڵایەتی و نیاز بۆ فێربوونی زانست لای شارنشینەکان زیاد دەکات.

٣. کەڵک وەرگرتن لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن: زۆربوونی ئاستی زانیارییەکانی خەڵک، ئەگەری کەڵک وەرگرتنی خەڵک لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن زیاتر دەکات. لە ڕێگەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنیشەوە هاودەردی و هاودڵی و وەک یەک بوون و چاولێکەری و لاسایی کردنەوەی کۆمەڵگا پێشکەوتووەکانی لەلای خەڵک دەوروژێنێ.

٤. بەشداری ئابوری و سیاسی: بە کەڵک وەرگرتن لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، تێگەیشتن و ناسینەوەی کۆمەڵگا و هۆشیاری سیاسی لە لای مرۆڤەکان زیاتر دەبێ و بەشداری کردن لە

چارەنووسی سیاسی لە لای تاکەکان دەکات بە پێداویستی.

بەباوەڕی لێرنەر، مرۆڤەکان پێیان خۆشە ژیانیان لە شێوەی ڕۆژئاواییەکان بگۆڕن. ئەو لە تویژینەوەکەیدا گەیشتوەتە ئەو دەرئەنجامەی کە ئەوانەی حەزیان لە مۆدێرنیزەکردنی کۆمەڵگاکانیان هەیە، زۆرترن لەوانەی سونەتی و تەقلیدیانە بیردەکەنەوە.

## کەلار، گوزەر بەرەو مۆدێرنیزە:

ئەگەر ئەم قۆناغانە بەسەر (کەلار) وەک یەکەیەکی جوگرافیدا جێبەجێ بکەین، کۆمەڵێک دەرئەنجامان بۆ دەردەچێ کە ڕادەی گوزەری ئەو شارەمان بەرەو مۆدێرنیزیە بۆ دەردەخات. لە خوارەوە بە کورتی دەیخەمەڕوو:

یەکەم. جوڵەی جوگرافیایی: بە واتای گواستنەوە لە گوندەوە بۆ شار، لێرنەر پێی وایە سەرەتای بەشاری بوون لەو ساتەوە دەست پێدەکات  کە خەڵک لە گوندەکانی دەوروبەرەوە بەرەو شارەکان کۆچ دەکەن.

لە ئاسەوارەکانی دەوروبەری کەلار ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئەم جێگەیە لە ڕابردوویەکی دووردا جێگەی شارستانییەتێکی دیار بووە، ئەو کەناڵە ئاودێرییە مێژوویەی کە لە ‹بەردەسور›ەوە بەرەو دێبنە دەچێت بەسە بۆ سەلماندنی بوونی شارستانیەتێکی گەورە لەم جوگرافیایەدا هەبووە. بەڵام بە تێپەڕبوونی زەمەن، بەهۆی شەڕوشۆڕ و نەخۆشی و پەتای کوشندەوە ناوچەکە بە تەواوەتی پاشەکشەی کردوە، گەرمیان بە کۆمەڵێک گوندی پەرشوبڵاو و چەند خێڵێکی کۆچەرییەوە هاتووەتە ناو سەدەی بیستەم، ئەو دۆخەش تاوەکو حەفتاکانی سەدەی ڕابردو گۆڕانێکی بەرچاوی لە شێوەی ژیانی خەڵک بەخۆوە نەدیوە.

بەڵام لە شوباتی ساڵی ١٩٧٠ لەچوارچێوەی ڕێکخستنەوەی ئیدارەی عێراق و بۆ زەمینە خۆشکردنی دابڕانی بەشێکی زۆری قەزا و ناحییەکانی کەرکوک، حزبی بەعس (گوندی کەلاری کۆن)ی کرد بە قەزایەکی سەربەخۆ، لە تشرینی دووەمی ١٩٧٥ لە کەرکوکی دابڕی و خستیە سەر سلێمانی. ژمارەی دانیشتوانی ئەو دەمەی کەلار تەنیا (١٣٢٤) کەس بوو. بەڵام بەچەندین هۆکار، لەوانە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و لە باری ژینگە و ئاووهەوای ناوچەکە، ساڵ لە دوای ساڵ ژمارەی دانیشتوانی زیاتر بووە؛ بەڕادەیەک لە هەندێ کاتدا بە تایبەتی دوای ڕاگواستنی گوندەکانی خانەقین لە ١٩٧٨ و پرۆسەی ئەنفالەکان لە ساڵی ١٩٨٨ گەشەی دانیشتوانەکەی گەیشتوەتە ٣٢.٥٪. بە گوێرەی ئاماری ساڵی ٢٠١٢ ژمارەی دانیشتوانی قەزاکە ١٨٤٩٧٣ کەسە.

بەپێی تیورییەکەی دانیێل لێرنەر بێت، زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان ئەگەرەکانی بوون بە شاری لە کەلار زیاتر دەکرد. بە تایبەتی گەر بزانین جۆری بەرهەمهێنان و کار لەو قەزایەدا لە جوتیاری و مەڕدارییەوە گۆڕا بۆ کرێکاری و بازرگانی و دوکانداری و کارمەندی لە دامودەزگاکانی حکومەت. بەمە رۆژ لەدوای رۆژ دانیشتوانەکەی لە کولتووری گوندییەوە دادەبڕان. خەڵک کە راهاتبوون لە گوندێکدا بژین هەمووی خزم و کەس و کار و عەشیرەتی یەکتر بن و ژن و ژنخوازیشیان تەنیا لە گەڵ یەکتردا دەکرد، بە کۆبوونەوەیان لە چوارچێوەی شارێکدا، کە چەندین عەشیرەت و بنەماڵە و تیرە و تایفە و تەنانەت ئاین و مەزهەب و لەهجەی جیاجیای تێدا بوو، جۆری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان گۆڕانی ریشەیی بەسەردا هات. بەمەش کەلار و کەلارییەکان قۆناغێک لە قۆناغەکانی چوونە ناو مۆدێرنەی بڕی و زەمینەی سەرهەڵدانی قۆناغی دووەم سەری هەڵدا کە هۆشیاری و ئاگایی و گۆڕانی دنیا بینییانە بۆ خۆیان و دەوروبەریان.
دووەم: گەشەسەندنی خوێندن و زۆری ژمارەی خوێنەوارەکان: دانیێل لێرنەر پێی وایە زۆر بوونی ژمارەی دانیشتوانی شارەکان، دەبێتە هۆی زۆری ژمارەی خوێنەوارەکان، کاتێک رێژەی خوێنەوارەکان ٢٥٪ تێدەپەڕێنێت پشت بەستن بە کەناڵەکانی راگەیاندن بۆ وەرگرتنی هەواڵ و زانیاری زیاتر دەبێ.
شارنشینی خەڵکی ناچار کرد دەستبەرداری ئاژەڵداری و جوتیاری ببن، بۆیە چیتر ناچار نەبوون لە پێناوی بژێوی ژیانیان منداڵەکانیان لە قوتابخانەکان دەربهێنن. دەبینین ساڵ لە دوای ساڵ ژمارەی قوتابیان زیاتر بووە و قوتابخانە ئامادەییەکان زۆرتر بوون. ئەوە جگە لەوەی بەسەدان قوتابی بۆ تەواوکردنی خوێندن لە بەشەکانی خانەی مامۆستایان، بازرگانی، پیشەسازی، کشتوکاڵ و تەنانەت هونەرە جوانەکانیش روویان لە شارە جیاجیاکانی عێراق و کوردستان کرد.
سەرەتای هەشتاکان ژمارەی مامۆستایانی خەڵکی کەلار لە پەنجەکانی دەست تێنەدەپەڕین و حکومەت بۆ پڕکردنەوەی میلاکی قوتابخانەکان بە ناچاری لە پارێزگاکانی دیکەی عێراق (بەسرە و نەینەوا و دیالە..) و تەنانەت لە وڵاتی میسرەوە مامۆستای دەهێنا بۆ کەلار. بەڵام بە گوێرەی دواین ئاماری یەکێتی مامۆستایان ژمارەی مامۆستایان لەو قەزایەدا (٦) هەزار مامۆستای تێپەڕاندوە. هەروەها ژمارەی قوتابخانەکانیش ٣٣ ئامادەیی و ١٢ باخچەی ساوایان، ٢١٥ قوتابخانەی بنەڕەتی هەیە. ژمارەی قوتابیانیش ٦٣ هەزار قوتابییە. هەروەها پەیمانگای تەکنیکی کەلار کە ٣٥ مامۆستای هەڵگری ماستەر و دکتۆرا و ١٦٢٨ خوێندکار و زانکۆی گەرمیان ٣٦٥ هەڵگری بڕوانامەی ماستەر و دکتۆرا و ٥٠٤٥ خوێندکار لەخۆ دەگرێ، هەموو ئەوانە رۆڵیان بینیوە لەوەی ژمارەی خوێنەوارەکان لەو شارە بەشێوەیەکی زۆر بەرچاو زیاد بکات.

بەرزبوونەوەی ئاستی خوێنەواری و وەرگرتنی پسپۆری و شارەزایی لە پیشە جیاجیاکان وای کردوە گۆڕانێکی ریشەیی لە جۆری پیشە و کەسپوکاری نەوەی دووەمی کەلارییەکاندا دروست بێ. بەراوردکردنی پیشەی کوڕەکان لە گەڵ پیشەی باوکەکانیان ئەوە دەردەخات کە گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی گەورە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە روویداوە، بێ دوو دڵی دەتوانین بڵێن ٪۷۰ کوڕەکان ئەو ئیشانە ناکەن کە پێشتر باوکیان کردویانە. بەسەدان جۆر پیشەی جیاجیای تێدا دروست بووە، هەر لە پزیشکییەوە بگرە تا دەگاتە مامۆستایی و ئەندازیاری و سەرافی و زەڕنگەری و پۆلیسی و قەسابی و دەلالی.. تەنانەت میوزیک ژەن و گۆرانیبێژی ئاهەنگێڕان ...
سێیەم: کەلک وەرگرتن لە کەناڵەکانی راگەیاندن: زۆربوونی ئاستی هۆشیاری و زانیاری خەڵک، وا دەکات خەڵک بۆ وەرگرتنی مەعریفەی زیاتر روو لە کەناڵەکانی راگەیاندن بکەن. بێگومان گەشە سەندنی تەکنەلۆژیای پەیوەندییەکان (بینرا و نوسراو و بیستراو) و لەبەردەست بوونیان بە نرخێکی هەرزان و ئاسانی بەکارهێنانیان، وای کردوە نەک هەر خەڵکی خوێنەوار دەتوانن بۆ وەرگرتنی هەواڵ و زانیاری کەڵکیان لێوەرگرن، بەڵکو خەڵکی سادەش لێی سودمەند بوون. لەمەشدا کەلارییەکان وەک هەموو شارەکانی دیکەی کوردستان لەبەهەرە وەرگرتن لەم دەستکەوتەی مرۆڤایەتی دانەبراون. دەگمەن ماڵێک هەیە سەتەلایتی نەبێ یان گرێ نەدرابێتەوە بە تۆڕی ئەنتەرنێتەوە، جگە لەوەی لە کەلار کۆمەڵێک ئێستگەی رادیۆی و تەلەفزیۆنی و تەنانەت گۆڤار و رۆژنامەی لۆکاڵیش هەن کە رۆژانە هەواڵ و زانیاری ناوچەکە دەگەیەنن بە خەڵک. بەمەش دانیشتوانی کەلار قۆناغی سێیەم تێپەڕاندوە و بە ئاسانی دەتوانێ بچێتە قۆناغی سێیەمەوە.
لیرنەر لای وایە تایبەتمەندیەکی سایکۆلۆژی هەیە هاوتەریبە لەگەڵ پرۆسەی گەشەی کۆمەڵایەتی، ئەویش توانای کەسەکان بۆ خەیاڵ کردنەوە و وێناکردنی خۆیان لەو دۆخەی خەڵکانی دیکەی تێدا دەژین، ئەوەی ناوناوە «تەقەموسی ویژدانی». ئەو کاتەی دەرکەوت لە کۆمەڵگایەکدا ژمارەیەکی زۆر خەڵک «تەقەموسی ویژدانی» دەکەن، ئەوا بزانە ئەو کۆمەڵگایە بەرەو پێشکەوتنێکی خێرا دەچێت. تەقەموسی ویژدانی تایبەتمەندییەکی ئەو کەس و کۆمەڵگایانەیە کە زۆر چالاکن، ئەویش شارەزاییەکی پێویستە بۆ ئەو گەلانەی دەیانەوێ لە ژیانێکی تەقلیدی و سونەتەییەوە بەرەو مۆدێرنیتە هەنگاو بنێن. لە ناو نەوەی دووەمی کەلارییەکاندا ئەو دیاردەیە زۆر باوە، لە لە گۆڕینی مۆدێلی جلوبەرگەوە بگرە تاوەکو شێوازی بیناسازی لە کەلاردا زۆر بەخێرایی گۆڕانی بەسەردا هاتووە.
هەرچەندە لەبەرامبەر ئەم پێشکەوتنەدا، هێز گەلێکی موحافەزەکاری بەتواناش هەیە کار دەکات بۆ راگرتنی دۆخەکە و گەڕانەوەی بۆ دواوە، بەڵام لە ئەمڕۆدا بە هۆی ئەوەی میدیاکان چەندین نمونەی جیاجیا لە ستایلی ژیان دەخەنە بەردەم خەڵک بۆ ئەوەی لێیان هەڵبژێرێت، هەروەها بەهۆی زۆری ژمارە و جۆری کەناڵەکانی راگەیاندن پرۆسەی «تەقەموسی ویژدانی» خێراتر بووە ئەو هێزانە نەیانتوانیوە ببنە لەمپەر لەبەردەم پرۆسەی مۆدێرنیزە بوونی کەلار.

چوارەم. بەشداری ئابوری و سیاسی: بۆچوونی لێرنەر وایە خەڵک لە ڕێگەی وەرگرتنی زانیاری لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە، تێڕوانینیان بۆ گۆڕانکارییە ئابوری و سیاسییەکان دەگۆڕێ و هەوڵ دەدەن بەشداری کردنیان لە دیاری کردنی چارەنووسی ئابوری و سیاسی گەشە پێ بدەن.

لە دوای ساڵی ١٩٨٠ کەلار لە ڕووی ئابورییەوە تاڕادەیەک گەشەیەکی سەرەتایی بەخۆیەوە بینی. سەدان کارگەی بچوکی دروستکردنی بلۆک لە چەمی سیروان وەک قارچک هەڵتۆقین، بەرهەمی ئەم کارگانە ڕاستەوخۆ دەبران بۆ شارەکانی خوارووی عێراق کە پرۆسەیەکی گەورەی ئاوەدانی تیایاندا دەستی پێکردبوو. بە ماوەیەک دوای ئەوە، بەهۆی بوونی کەرەستەی خاوی وەک لم و چەو، چەندین کارگەی ئۆتۆماتیکی بەرهەم هێنانی بلۆک دروستکراو خەڵکێکی زۆر بەهۆیانەوە بوون بە خاوەنکار.

جگە لەوە هەر لەو ماوەیەدا کەلار بوو بە سەنتەری بازرگانی قاچاغی کاڵای ئێرانی بۆ بەغدا و دیالە و سەلاحەدین و تەنانەت لە ئەنباریشەوە خەڵک بۆ کڕینی کاڵای پێویست ڕوویان لە کەلار دەکرد. ژمارەی دوکان و بازاڕەکانی کەلار لە ماوەیەکی کەمدا یەکجار زۆر زیادیان کرد. ئەمانە بوونە هۆی بوژانەوەی ئابوری بەشێکی زۆری خەڵکی کەلار و سەرمایەیەکی باش لەو شارەدا کەڵەکەی کرد. ئەو پێشکەوتنە ئابوریەی کەلار لە هەشتاکانەوە بە خۆییەوە بینی، بوو بە بناغەیەکی باش بۆ ئەوەی کەلار ببێتە سەنتەرێکی گەورەی ئاڵوگۆڕی کاڵا لە نێون هەموو شارەکانی عێراق و کوردستان، کەلار ئێستا یەکێکە لە شارە دەوڵەمەندەکانی کوردستان.

بەبۆچوونی کۆمەڵناسی ناوداری ئەمریکی (سیمور لیپست ١٩٢٢ – ٢٠٠٦)، کەڵەکە بوونی سەرمایە لە جێگەیەکدا دەبێتە هۆی گۆڕانکاری لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا، سەرمایە دەبێتە هۆی گۆڕینی ئاستی خواست و ئارەزووەکانی خەڵک، خواست لە سەر هەموو شتێک، بەتایبەتی خواست لەسەر خوێندن و بەدەست هێنانی بڕوانامە لە بوارە جیاجیاکاندا. بەرزبوونەوەی ئاستی خوێندەواری و بەدەستهێنانی بڕوانامەش دەبێتە هۆی هۆشیاری تاکەکان لە بوارەکانی دیکەی وەک بەشداری سیاسی و گەڕان بە دوای ئایدۆلۆژیا. بوونی ئایدۆلۆژیای جیاوازیش دەبێتە هۆی ململانێ و سەرهەڵدانی بزاوتی جەماوەری. لەوەش زیاتر کەڵەکە بوونی سەرمایە وردەوردە چین و توێژەکان لە یەک جیا دەکاتەوە. بە مانایەکی دیکە پەرەپێدانی ئابوری، دەبێتە هۆی پەرەپێدانی پەروەردەیی و لەوێشەوە دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی هۆشیاری سیاسی.

باش بوونی دۆخی ئابوری کەلارییەکان و گۆڕان لە شێوەی کارکردنی پێشوویان و زۆربوونی ژمارەی خوێندکار و بەرزبوونەوەی ئاستی خوێندەواری، هۆشیاری سیاسیان بەشێوەیەکی بەرچاو زیاد کرد. چەدنین تیپی شانۆیی و مۆسیقا سەری هەڵدا، کتێبخانەی گشتی کەلار بوو بە ناوەندێکی باش بۆ ئاڵوگۆڕی بیروڕا و یەکتر بینینی ئەوانەی دەیانخوێندەوە. لە ساڵانی هەشتاکاندا کەلار شارێکی پێشەنگ بوو لە خەباتی سیاسی و ڕووبەڕووبوونەوەی ڕژێمی بەعس،

له دوای ڕاپەڕینیشەوە ململانێ و بزاوت و بەشداری سیاسی خەڵکەکەی لە پێشەوەی شارەکانی دیکەی کوردستان بووە.
ئەمەش ئەو پێشمەرجەی لێرنەر دەسەلمێنێ کە پێی وایە کۆمەڵگای مۆدێرن ئەو کۆمەڵگایەیە کە خەڵکەکەی بتوانن ڕۆڵ ببینن لە پێشخستنی سیاسی و ئابووری وڵاتەکەیاندا. ئەو پێی وایە یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای تەقلیدی خۆ پەراوێزخستنی تاکەکانی کۆمەڵگایە و سەرقاڵ بوونیانە بەو شتانەی کە پەیوەندیان هەیە بە ژیانی تایبەتی خۆیانەوە.

## دەرئەنجام:

گەرچی کەلار بەشێوەیەکی سروشتی و بەرنامە بۆ داڕێژراو لە لایەن دەوڵەتەوە گەشەی نەکرد، بەڵام هەلومەرجی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوری، پێگەی جوگرافی ناوچەکە و ئاوێتەبوونی خەڵکانی جیاجیا لە شوێن و جوگرافیای جیاوازەوە وای کرد ڕەوتی پێشەوەچوونی کەلار بەرەو مۆدێرنیزە بوون بە پێی تیۆرییەکەی دانێل لێرنەر، بەشێوەیەکی بەرچاوە بچێتە پێشەوە. ئەو ڕەوتە تا ئێستایش بەردەوامە. بۆ ئەوەی ئەو پرۆسەی مۆدێرنیزە کردنی کەلار شێوەیەکی زانستی و پلەبەپلە بگرێتە خۆی، پێویستە کاربەدەستانی ئەو شارە بە پشت بەستن بە خەڵکانی پسپۆر لەبواری کۆمەڵناسی و ئابوری و سیاسی و کولتوریی بەشێوەیەکی بەرنامەبۆداڕێژراو درێژە بەو گەشەیە بدەن کە کەلار بەخۆییەوە دەیبینێ، چونکە کەلارییەکان هەڵگری وزە و ئیمکانیاتی زۆر باشن.



## سەرچاوەکان:

١. دانێل لرنر، گذر جامعە سنتی: نوسازی خاورمیانە، ترجمە غلامرضا خواجەسروی، پژوهشکدە مطالعات راهبردی، تهران ١٣٨٣.
٢. ڕزگار حاجی حەمید، کەلار مێژوویەکی دێرین و جوگرافیای شارێکی زیندوو، چاپخانەی یاد، ٢٠١٥.
٣. وینسنت فرانس کاستللو، شهر نشینی در خاوەمیانە، ترجمە پرویز پیران و عبدالعلی رصایی، نشر نی، تهران، چاپ سوم ١٣٨٣.
٤. د. علی گرانمایەپور، نگاهی بە آراء و اندیشەهای دانێل لرنر، مطالعات رسانەای، سال پنجم شمارە هشتم ، بهار ١٣٨٩.
٥. حسین سلطانزادە، مقدمەای بر تاریخ شهر و شهرنشینی در ایران



# کەلار شارێکی بێئەرشیفخانە

کاروان عوسمان خەیات (ڕێبین)/ تاران

ئەگەر چاوێک بە مێژووی کتێبخانە و ئەرشیفخانەدا بگێڕین، دەبینین هەر لە کۆنەوە شارەکان و ناوەندەکان جێگایەکی تایبەتییان بۆ کتێبخانە و ئەرشیفی تایبەتی هەبووە. لێرەدا مەبەستم لە ئەرشیفی تاکەکەسی نییە، مەبەستم لە ئەرشیفی ناوەندییە، ئەرشیفخانەی نیشتمانییە.

لە مێژووی شارستانیەتی کۆندا هەموو شارێک ناوەندێکی ئەرشیفی تایبەت بە خۆی هەبووە، هەر نووسراوێک لە کۆشک و ناوەندی ئەو شارەوە دەرچووبێت، نوسخەیەکی لێ نێردراوە بۆ ئەو ناوەندە و لەوێدا پارێزگاریی لێکراوە. ڕاستە لە ئێستادا هەر وەزارەتێک ژووری فایلات و ئەرشیفی تایبەتی خۆی هەیە، نوسخەیەکیش بۆ سەرەوەی خۆیان دەنێرن، بەڵام لە وڵاتانی پێشکەوتوو هەر شارێک ناوەندێکی تایبەتی ئەرشیفی خۆی هەیە و هەموو وەزارەتەکان یەک نوسخە لە نووسراوەکانیان دەنێرن بۆ ئەو جێگایە و لەوێدا پارێزراو دەبێت، لەوێیشدا هەموو نووسراوەکان سکان دەکرێن و لە جێگایەکی تایبەتدا هەڵدەگیرێن.

لە وڵاتانی پێشکەوتوو، هەموو زانکۆکان یەک کتێبخانەی تایبەتیان هەیە، بە ناوی

کتێبخانەی زانکۆ، جگە لەم کتێبخانە؛ هەموو بەشەکانیش کتێبخانەی تایبەتی خۆیان هەیە. ئەم کتێبخانانەیش لە چەند بەشێک پێکهاتوون، بەشی کتێبی دانسقە، بەڵگەنامە، دەستنووس، کتێبی چاپی کۆن، کتێبی تازە چاپکراو و ڕۆژنامە و گۆڤارە تایبەت و زانستییەکان... بەڵام لە کوردستاندا ئەگەر تەماشا بکەیت دەبینی ئەم جێگایانە نییە، نەک هەر نییە بەڵکو بیریشی لێ ناکرێتەوە.

## مۆزەخانە

لە وڵاتانی پێشکەوتوو چەند شێوە مۆزەخانە هەیە: مۆزەخانەی نیشتمانی، ئیسلامی، ئازاد، هونەری، تەلارسازی و تاکەکەسی... ئەم مۆزەخانانە هەر یەکەیان بە پێی توانایی و جۆری خۆیان، ئاوڕیان لەم کارە داوەتەوە و کاری تایبەتییان لەسەر کردووە. ناکرێت مۆزەخانەکان ئاوڕ لەم کارە نەدەنەوە، خەمیان نەبێت، پارەی بۆ تەرخان نەکەن و جێگای تایبەتی بۆ دانەنێن. یەکێک لە گرفتی مۆزەخانەکانی کوردستان و کەلار بەتایبەتی، نەگەڕاون بزانن کێ ئەو ئەرشیفانەی هەیە بە هەر جۆر و قیمەتێک بووبێت لێیان وەربگیرێت و لە مۆزەخانەی گشتیی نیشتمانیدا دابنرێت. ئەرکی سەرەکیی مۆزەخانەی گشتیی نیشتمانییە بەو کارە هەستێت و ئەوانە کۆ بکاتەوە. وڵاتانی پێشکەوتوو مۆزەخانەی تایبەتییان هەیە بۆ دەستنووس و پارە و کەرەستەکانی پەیوەست بەوانە... بەشی تایبەتییان بۆ دەستنووس هەیە، دیدەنی تایبەتی بۆ ئەو بەشە هەیە، خەرج و داهاتی هەیە. لێکۆڵەران سوودی لێ وەردەگرن. هەمیشە بیریان لە بەرفراونبوونیدا هەیە و فراوان دەکرێت، بۆیە پێویستە مۆزەخانەی کەلاریش ئەو شێوازە کارە لە بەرچاو بگرێت و هەوڵی تایبەتی بۆ بدات و بەشی تایبەتی بۆ بکاتەوە و جێگا تایبەت و گشتییەکان بگەڕێت و ئەو دەستنووسانە کۆ بکاتەوە و سکانیان بکات و لە جێگای تایبەتیدا بیانپارێزێت.

پێویستە ئەم مۆزەخانانە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ مۆزەخانەکانی دەرەوەدا هەبێت و ئاڵوگۆڕی زانیاری و کاریان هەبێت، پێویستە گەڕانی جدی لە دەرەوە بکرێت و بە جدی ئەم کارانە ئەنجام بدرێت، لەسەر ئاستی باڵاتریش دەبێ ئەم کارانە بکرێت.

## کتێبخانەی گشتیی نیشتمانی

کتێبخانەی گشتیی نیشتمانی، ئەم کتێبخانە لە هەموو شارێکی وڵاتدا هەیە، ڕێسا و یاسای تایبەتی هەیە، بودجەی تایبەتی هەیە، سەر بە دامودەزگاکانی حوکوومەتە، کارمەندی تایبەتی هەیە.

ئەم کتێبخانانە لە هەموو شارەکاندا دەتوانن نوسخە و بەڵگەنامە بکڕنەوە، ئەرشیفی بکەن، ساغی بکەنەوە، فەهرەستی بکەن، دەوراتی جۆراوجۆر بکەنەوە، نوسخەی سکانکراوی لێ بفرۆشنەوە، داهاتی باشیان لەم بابەتەدا هەبێت و کاری تری پێ ئەنجام بدەن.

لەم کتێبخانانەدا کارمەندی شارەزا دانراوە و هەیە، کارمەندگەلێک لێرەدا کار دەکەن کاتێک هەر کتێب و نوسخەیەکت بووێت، زانیاری وردیان لەسەری هەیە، هەم فەهرست بە شێوەی کۆمپیوتەری لە خزمەتی خوێندکاران و لێکۆڵەراندا هەیە، هەم ئەوانەی سەردانی ئەو جێگایە دەکەن، ئەگەر شارەزاییان نەبێت ئەوا کارمەندێک ڕێگای بۆ ڕۆشن دەکات و زانیاریی پێویستی دەخاتە خزمەتی. کارمەند دەوراتی زانستیی دەبینێت و شارەزایە لەو بوارەدا، فەهرەست بە شێوەی کتێبی چاپی لە بەردەستیدا هەیە و دەتوانێت فەهرەستی هەموو نوسخەکانی وڵات ببینێت، بۆ خوێندکاران و لێکۆڵەرانیش بە هەمان شێوەیە. نرخی وەرگرتنی کۆپی هەر دەستنووسێک بۆ خوێندکار و مامۆستای زانکۆ جیاوازە و کەمترین پارەی لێ وەردەگیرێت، بۆ خوێندکاری ئازاد نرخێکە و بۆ لێکۆڵەری ئازادیش نرخێکە، بەڵام هاوکاری کردن هەمیشە هەیە و ئاسانکاری بۆ هەموو لایەک دەکرێت.

ئەم کتێبخانانە لە سەرجەم شارەکان هەم ژمارەی سپاردن بە کتێب دەدەن، هەم گرووپی لێکۆڵینەوەییان هەیە، هەمیش دەوراتی تایبەتییان هەیە. هەروەها ئەرکی نوسخە کۆکردنەوەییشیان لە ئەستۆدا هەیە، هەمیش هەر کتێبێک و کتابێکی ڕەسمی لە دام و دەزگاکانی ئەو شارەدا ئەنجام بدرێت، نوسخەیەکی بۆ ئەم کتێبخانە دەڕوات و لەوێ ڕا دەپارێزرێت و دوای چەند ساڵێک ئەم بەڵگانەیش دەخرێتە خزمەتی لێکۆڵەران....

## کتێبخانەی تایبەتی

مەبەست لەم کتێبخانانە، کتێبخانەی تاکەکەسییە، لە وڵاتانی پێشکەوتوو و خاوەن فەرهەنگ و ئەوانەی هەوڵیان بۆ پێشخستنی فەرهەنگ و کەلتوورە... کەسانی بیرفراوان و کەسانی دەوڵەمەند و ڕۆشنبیر، هەستاون بە کڕینی شتی کەلتووری و فەرهەنگی کۆن، لە پاڵ ئەوەیشدا کەسانێک هەبوون تەنیا دەستنووسیان کڕیوە، سەروەتێکی زۆریان لەو پێناوەدا خەرج کردووە و ئێستا بووەتە سەروەتێکی گرانبەهای ئەو وڵاتە، بەهۆی گرنگی بابەتەکە و خۆسەلماندنی کەسەکە و جێگاکە، حوکوومەت خۆی پاڵپشتی ئەو جێگایە دەکات و بودجە و کارمەند و دەزگا... بۆ کڕیوە و کارئاسانی بۆ دەکات.

لە وڵاتی ئێران چەندین جێگای لەم شوێنە هەیە، بە هۆی گرنگی بابەتەکە و کتێبخانەکە، چەندین کارمەندی هەیە، جێگای تایبەتی هەیە، حوکوومەتیش پاڵپشتی دەکات و گرنگی پێ دەدات. ئەم کتێبخانانە بێجیاوازی زمان و کەلتوور، کتێبی کڕیوە و کۆی کردووەتەوە و هەموو نوسخەکانی سکان کردووە، ڕێسا و یاسای تایبەتی خۆی هەیە، کارمەند و دەزگا و بودجەی خۆی هەیە، ئەگەریش نەبێت، چون ناوەندەکە هێند گرنگە و نوسخەی تێدایە و سەردانی هەیە، ئەو دەستکەوتەی هەیەتی بەشی ئەو کارەی بۆ دەکات کە خۆی خۆی ڕاپەڕێنێت. ئەم کتێبخانانە هیچیان لە کتێبخانەی گشتیی زانکۆ و کتێبخانەی گشتیی نیشتمانی کەمتر نییە، سەردانیکردنیشیان بە هەمان شێوەیە. ئەم کتێبخانانە کاتێک کەسێک کتێبێکی دەستنووسیان لێ وەردەگرێت، ئەگەر بۆ چاپیان بێت، ئەوا داوا دەکەن دوای چاپکردنی نوسخەیەکیان بۆ بنێرن و ئاماژەیش بە کتێبخانەکە بکرێت، ئەگەر ببینن کارەکە شێوەی نایاسایی تێدایە ئەوا دەتوانن سکاڵای لەسەر بکەن.

## کتێبخانەکانی زانکۆ

زانکۆکان ناوەندێکی ئەکادیمین، ناوەندی ئەکادیمی ئەرکی زیاتری لەسەر شانە و دەبێ زیاتر کار لەم بابەتەدا بکات. لە وڵاتانی دەرەوەدا، زانکۆکان لە دوو ڕووەوە ئەرکیان لەسەرە، یەکەمیان دەبێ لە کتێبخانەی گشتیی زانکۆ و بەش و ناوەندی زانکۆدا کۆ بکرێتەوە و گرنگی

پێ بدرێت. له وڵاتانی وەکو ئێران دەبینیت بەشەکانی وەکو ئەدەبیات و یاسا و... بەشێکی تایبەتییان له کتێبخانەی بەشەکەیان بە ناوی بەشی دەستنووس و چاپی کۆن کە پێی دەوترێت چاپی سەنگی، ئەم چاپەیش هیچی کەمتر نییە لە دەستنووس، کۆ دەکرێنەوە و سکان دەکرێن، بۆ ئەم مەبەستەیش لە دەرس و جۆری وانەوتنەوەدا باس لەم کارانە دەکرێن و خوێندکاری پێ ئاشنا دەکرێت.

لەم زانکۆیانەدا کتێبخانەی گشتیی زانکۆ و کتێبخانەی بەش هەماهەنگی و پەیوەندیی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆیان پێکەوە هەیە. ڕاستەوخۆ مەبەست لەوەیە لە ڕێگەی نامەی داواکراوەوە ڕاستەوخۆ نوسخەکە ئەگەر سکان نەکرابێت، ئەوا لە ڕێگەی نامەی داواکراوەکەوە ئەو نوسخە وەردەگیرێت و سکان دەکرێت. ئەگەر ئەو نوسخەیش سکان کرابێت، ئەوا لە ڕێگەی بەرنامەی تایبەتەوە ئەو نوسخە وەردەگیرێت و بە داواکراو دەدرێت. هەندێ جار بۆ ئاسانکاریی نوسخەکان لە بەشەکانەوە کۆپییەکی دەدرێتە کتێبخانەی گشتیی زانکۆ، هەر بە ناوی یەکەمەوە دەنووسرێن و فەهرست دەکرێن، کاتێک پێویستت بەو نوسخە هەبێت، لە دوو جێگادا هەیە و لە هەرکامیاندا بتەوێت، نوسخەیەکی جوان و بە دیققەتی لەسەر سیدی یان فلاش لێ وەردەگریت.

ئەم کتێبخانە بودجەی تایبەتی هەیە، هەمیشە نوسخەی تازەی بۆ پەیدا دەکرێت، دوای تەواوبوونی لە ڕێکارە یاساییەکان، لە فەهرەست و تۆمارکردن و شەنوکەوکردنی لە لایەن کارمەندانی ئەو کتێبخانەوە، لە پێشانگایەکی تایبەتی و لەناو شووسەدا هەموو ئەو نوسخانەی پەیدا کراوە، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو نمایش دەکرێن. دوای ئەوە هەموو کەسێک دەتوانێت سوود لەم نوسخانە وەربگرێت، هەر کەسێکیش گرفتێکی لە کۆپی ئەم نوسخانە هەبێت، دەتوانێت بۆ ماوەیەکی کاتی ئەو نوسخە لەو جێگایەدا ببینێت. کارێکی تر ئەوەیە کە بەشە تایبەتەکانی وەکو بەشی مێژوو و ئەدەبیات و باستانناسی و... دەتوانن سەردانی ئەم جێگایانە بکەن و ئەو نوسخانە لە نزیکەوە ببینن، هەر ئەم جێگایە دەوراتی نوسخەناسی و فەهرەستکردن و شێوەی لێکۆڵینەوە لە نوسخە ئەنجام دەدرێت.

## ئەنجامێک

ئەوەی لێرەدا باس کرا، زانیاری گەلێکن کە بەندە لە ڕێگەی کارمەندان و سەردانیکردنم بۆ ئەو جێگایانە، پرسیارم کردوون و زانیاری تەواوم لێیان وەرگرتووە و ڕۆژانە سەردانیانم کردووە. لە تەواوی کوردستاندا بە داخەوە ئەتوانم بڵێم نەوەد لە سەدی (٩٠٪)ی ئەم کارانە کە لێرەدا باسم کردن، لە ناوەند و زانکۆ و کتێبخانە گشتییەکانی کوردستان و زانکۆیشدا نییە و ئەنجام نادرێت. کەلاریش دەتوانم بڵێم لە هەموو ناوچەکانی کوردستان بۆ ئەم بابەتە لە دوای دواوەیە و هیچ بیرێکی لەم کارە نەکردووەتەوە.

دامەزراوەکانی کەلار هەم خۆیان لەو بابەتەدا دواکەوتوون و هەمیش حوکومەت ئاوڕی لێ نەداونەتەوە. لێرەدا دەتوانم بڵێم کەلار لە هەموو شارەکانی تری دواخراوترە و بێسەروبەرترە، مۆزەخانەکانیش بە هەمان شێوەیە، بۆیە دەبێ ئەم کارانە هەوڵێکی جدی بۆ بدرێت و ڕێکبخرێت و پەرەی پێ بدرێت. ئەگەرنا هەموو شوێنەوارەکان لەناو دەچن و دەبێ لە کۆتاییدا بۆ مێژووی کوردستان و کەلاریش، فاتیحا و سەلاواتی بۆ بخوێنیت.



# گەڕەکی حەمەی کەریم (سیروان)

مستەفا سەعید عەلی

گەڕەکی حەمەی کەریم(سیروان) بەرلەوەی ببێتە گەڕەکێک لە گەڕەکەکانی شاری کەلار، گوندێک بووە سەر بەناحیەی شێروانەی، قەزای کفری، پارێزگای کەرکوك. زۆرن ئەو گوندانەی لە کوردستاندا کە بەناوی ئەو کەسانەوە ناونران کە یەکەم کەس ئاوەدانیان کردۆتەوە، گوندی حەمەی کەریمیش بە ناوی ئەو پیاوەوە ناونراوە کە یەکەمجار ئاوەدانی کردۆتەوە.

## حەمەی کەریم کێیە؟

ناوی تەواوی(محەمەد کەریم قوباد یەعقوب قازی)یە، لە هۆزی گڵاڵی ناوی دایکی(فاتمە کاکە جانە) لە هۆزی سۆفی وەند، وەک لە ناسنامەکەیدا هاتووە لە دایکبوی ساڵی(١٨٩٧) سەرقەڵا، کفری، کەلارە.

ئەسڵیان دەگەڕێتەوە بۆ گڵاڵییەکانی ناوچەی پشدەر، بۆیە لە نێو هۆزی گڵاڵیدا بە(پشدەری) ناسراون. بەڵام بەهۆی کێشەی عەشایەری لە باپیرانییەوە، ناوچەی پشدەریان جێهێشتووە و هاتونەتە ناوچەی بەرزنجە. لە ساڵی(١٩٣٤) هاتونەتە گوندی( شێخە سورە)ی ناوچەی سەنگاو لەبەر کۆچەر بونیان لە نێوان گەرمیان و کوێستاندا( سنوری کۆچەرییان کە لە ناوچەی چیمەنی ئیبراهیم سەمین بووە تاناوچەی شلێر) ناوچە گەلێکی زۆر گەڕاون. بۆ یەکەمجار لە ٨ی ٤ی ١٩٣٤ ئەوکاتەی

له گوندی(شێخە سورە)ی ناحیەی سەنگاو بوونە بۆ یەکەمجار ناسنامەی عێراقی دراوەتێ.
لە دووەم ناسنامەیدا ئەم دەستەواژەیە بە زمانی عەرەبی نوسراوە( ان محمد بن كريم، لكونه حائز على الجنسية العراقية وسجل في سجل النفوس قد اعطي له هذا الدفتر في ٣١/٨/١٩٣٧) بەڵام لەم تۆمارەیدا ساڵی لە دایکبونی(١٨٩٥) نوسراوە. لە گەڵ ئەم زانیاریانە



حەمەی کریم قباد گڵاڵی

الاسم و الشهرة: محمد
تأريخ و محل: الولادة: سيار ، ٨٩٥ هشتصد و نودوپنج
اسم الأب: كريم
اسم الأم: فاطمه
الدين: مسلم
المهنة وهل يقرأ ويكتب: لا
هل متزوج: نعم

المحل الذي سجل فيه
اللواء: السليمانية
القضاء: حلبجة
الناحية: وارماوا المحلة اوالقرية: خيلى كريم قباد گلالى
رقم المسكن: رشمال
نوع المسكن: رشمال



ئەم زانیاریانە پێمان دەڵێن:
١ـ لە ساڵی ١٩٣٧ ماڵیان لە ناوچەی وارماوای شارەزور بووە.
٢ـ ئەو کاتە ژنی هەبووە، ڕەنگە منداڵیشی هەبووبێت بەو پێیەی تەمەنی ٤٠ ساڵ زیاتر بووە.
٣ـ ئەو کاتە باوکی ماوە، چونکە لە باسی گەڕەک و گوند دا نوسراوە: خیلی کریم قباد گڵاڵی.
٤ـ بەڵام کە باسی شوێنی لە دایکبونی دەکات دەنوسێت(سیار، گەڕۆک)
لە تەسکەرەی ساڵی ١٩٦٠یدا ١ی ٧ی ١٨٩٧ بە ساڵی لە دایکبونی دیاریکراوە.
لە گوندی گۆبان نیشتەجێ دەبێت و لەوێش بە هۆی ناکۆکی عەشایەرییەوە، گوندی گۆبان جێدەهێڵێت و دێتە ئەم شوێنەی ئێستا کەپێی دەوترێت گەڕەکی حەمەی کەریم و ئاوەدانی دەکاتەوە.



## سەرەتای ئاوەدان کردنەوەی گوندی حەمەی کەریم:

(نامیق)ی کوڕی کە لە دایکبوی (١٩٤٩)یە، بەڵام پێدەچێت تەمەنی چەند ساڵێک لەوە گەورەتر بێت، باسی چۆنیەتی هاتنیان بۆ ئەم شوێنەی ئێستا گەڕەکی حەمەی کەریمە بەمجۆرە بۆ کردم...

تەمەنم(١٠ بۆ ١٢) ساڵ دەبوو، کە بە بۆچوونی من دەکاتە نێوان ساڵانی(١٩٥١ ـ ١٩٥٣)، ڕۆژێکی بەهاری باوکم لە پشکەی خۆی سواری ئەسپەکەی کردم و پێکەوە هاتین بۆ ئەم شوێنەی ئێستا، نزیک یەک کاتژمێر لێی ماینەوە و باوکم هەمووی گەڕا، وتی: دەمەوێت باربکەم بێم ئەم شوێنە ئاوەدان بکەمەوە.

وتی شوێنی گوندەکە چەند کەلاوەیەکی لێ بوو.

دەربارەی ئەو کەلاوانە پرسیارم کرد لە(ئیبراهیم فەرەج کەریم گڵاڵی) لەدایکبوی (١٩٤٢) وە و لە ساڵی(١٩٥٨)وە نیشتەجێی گوندی حەمەی کەریمە وتی: وەک بیستومە بەر لە هاتنی حەمەی کەریم پیاوێک ئێرەی ئاوەدانکردۆتەوە، ناوی(مەلا مستەفا) بووە، بەڵام دواتر ئێرەیان بەجێهشتووە و ڕۆشتونە، کە پرسیم(مەلا مستەفا)کێ بووە؟

وتی: نازانم.

سەرەتا(حەمەی کەریم) بە تەنیا ماڵە دێتە ئەو شوێنە و ئاوەدانی دەکاتەوە، پاشان سێ ماڵ دێن بۆ لای کە ماڵی(سەید عەبدوڵڵا و کەریم ڕەیحان و محەمەد فەرەج فەتاح) بوونە، ماڵی چوارەمیش کە دێتە لایان ماڵی(فەرەج کەریم عەلی خان گڵاڵی) بووە، لە ساڵی ١٩٥٨ لە گوندی تۆپ عەسکەری ناوچەی بنکورەوە باریان کردووە.

لە ساڵی(١٩٦١) حەوت ماڵی خزمی لە گوندی(مچەشەل)ەوە باردەکەن بۆلای کە ئەم ماڵانە بوونە:

١ـ ئەمین محەمەد قارەمان قازی
٢ـ عەلی قادربەول
٣ـ عەبدوڵڵا مام قادر
٤ـ حەسەن عەبدوڵڵا مام قادر
٥ـ عەلی عەبدوڵڵا مام قادر
٦ـ سلێمان عەبدوڵڵا مام قادر
٧ـ ڕەشید فەرەج عەلی یارە.
سەرەتای ئاوەدانکردنەوەی گوندەکە بە ڕەشماڵ و زنج بووە، پاشان کردویانەتە لە خشت و قوڕ دروست کراو.

## قۆناغەکانی گەورە بوونی گەڕەکی حەمەی کەریم:ـ

★ سەرەتای ئاوەدانکردنەوە بە تاقە ماڵی.
★ هاتنی سێ ماڵ بۆ لای.
★ پاشان هاتنی حەوت ماڵی خزمی بۆ لای.
★ ئیتر تا هاتووە خەڵکی لە گوندەکانی ترەوە هاتوون بۆی.
★ ساڵی(١٩٧٥) بە هۆی ڕاگواستنیان ماڵانێکی زۆر لە ناوچەکانی بنکورە و ساڵەح ئاغا و گوندەکانی دەوروبەریان، باریان کردووە بۆ شاری کەلار و لە گوندی حەمەی کەریم نیشتەجێ بوونە، بە مەش گوندی حەمەی کەریم گەورە بۆتەوە.
★ لە ساڵی(١٩٧٨)، کە کوردە ڕاگواستراوەکان بۆ باشوری عێراق دەگەڕێندرێنەوە بۆ کوردستان زۆریان دێن لە شاری کەلار و لە گوندی حەمەی کەریم نیشتەجێ دەبن، سەرەتا بە کەپر و سابات و بە شێوەیەکی ناڕێک وپێک ماڵەکانیان دروست دەکەن، ئەم قۆناغە بە گەورەترین قۆناغی گەورە بوونی گوندەکە دادەنرێت. زۆربەی زۆری ماڵە کۆنەکانی گوندەکە بوون بە پشت و پەنا وجێگەی ماڵێک یان زیاتریان کردەوە، تا ئەو کاتەی خەڵکەکە هۆشێکیان کردەوە وئاهێکیان بە بەردا هاتەوە و جێگەو ڕێگەیەکیان بۆ خۆیان چێکرد.
حەمەی کەریم کەسێکی نزیکی شێخ مەحمودی حەفید و یەکێک لە چەکدارەکانی بووە و لە زۆربەی شەڕەکاندا لە گەڵیدا بەشداریکردووە، تەنانەت ماوەیەکیش شێخ لە ساڵی ( ١٩٢٢ (لە بەغداد ژیاوە، حەمەی کەریم یەکێک لەوانە بووە لەگەڵیدا ماوەتەوە. پاشان لە گەڵیدا هاتۆتەوە بۆ ناوچەی سیتەک تا ئەو کاتەی شێخ ئیزنی داوە بگەڕێتەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆی و ژیانی ئاسایی خۆی بکات. لەو شەڕانەی لەگەڵ شێخ مەحمود دا بەشداری کردوە گەلێک

ئازایەتی نواندوە و چەندین یادگاری ئەو سەردەمەی هێشتا ماون و لای نەوەکانی پارێزراون، لەوانە(تەپلێکی سەرکەوتن) کە لە جەنگی شوعەیبە لە هێزەکانی ئینگلیزی گرتووە.
حەمەی کەریم لە بەر ئازایەتی لای بەگزادەکانی جافیش کەسێکی خۆشەویست و جێگەی متمانە و ڕێزیان بووە.

## حەمەی کەریم لە ژیانیدا چوار ژنی هێناوە

١ـ ئەمنە ئەحمەد بەیخان لە عەشیرەتی گلاڵی(بە مارەبڕاوی کۆچی دوایی کردووە)
٢ـ ڕابیعە عەبدوڵلا حەسەن لە عەشیرەتی تەرخانی، ئەم منداڵانەی لێبووە: نامیق، ئەحمەد(بە گەنجی کۆچی دوایی کردووە)، جەیران، جیهان.
٣ـ ئاڵتون محەمەد قادر لە عەشیرەتی شاتری، ئەم منداڵانەی لێبووە: یونس، مەحمود(کۆچی دوایی کردوە)، خەدیجە(کۆچی دوایی کردوە).
٤ـ تەمینە براخاس لە عەشیرەتی عەمەڵە، هیچ منداڵێکی لێنەبووە.
جگە لە ناوی(کەلاوەکانی مەلا مستەفا) بەو شوێنەی ئێستای گەڕەکی حەمەی کەریم وتراوە(بانە برسی).
پرسیارم لە مەحمود ئەمین محەمەد قارەمان کرد کە دەبێتە ئامۆزای حەمەی کەریم تەمەنی لە ٧٣ ساڵدایە وتی بۆیە پێیان وتوە بانە برسی، چونکە زەوییەکەی بە پیت نەبووە بۆ دەغڵ ودان.
گوندی حەمەی کەریم لە ساڵی(١٩٦٠) تەنها(٩) ماڵ بووە کە بریتی بوونە لە:
١ـ محەمەد کەریم ٢ـ فەرەج کەریم ٣ـ یونس محەمەد ٤ـ مەحمود محەمەد ٥ـ قادر محەمەد ٦ـ ئیبراهیم فەرەج ٧ـ ڕەشید فەرەج ٨ـ محەمەد عەزیز ٩ـ حەسەن محەمەد.

## سنوری گەڕەکی حەمەی کەریم

بۆ یەکەمجار لە ٢٤ی مایسی ١٩٥٦ لەلایەن حوکمەتی عێراقەوە نەخشەی گوندی حەمەی کەریم کێشراوە و ئەو کاتە سنورەکانی بەم جۆرە دیاریکراوە:ـ
لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕوباری سیروان جیای دەکاتەوە لە سنوری ناحیەی قۆرەتو.
★ لە باکوری ڕۆژهەڵاتەوە گوندی بەردەسور بووە.
★ لە باکورەوە گوندی کەلاری کۆن بووە.
★ لە ڕۆژئاواوە هەردوو گوندی شێروانە وبنگرد بوونە.
★ لە باشوریشەوە دیسان ڕوباری سیروان بووە.
بەڵام دوای بوونی بە یەکێک لە گەڕەکەکانی شاری کەلار لە ئێستادا هاوسنورە لە گەڵ
★ ڕوباری سیروان لە ڕۆژهەڵات

★ گەڕەکی ئازادی(گازینۆ) لە باکوری ڕۆژهەڵات.
★ سەرکەوتن لە باکور.
★ گەڕەکی شێروانە و بنگرد لە ڕۆژئاوا.
★ ڕووباری سیروان لە باشور.
لە تۆمارەکانی دەوڵەتی عێراقدا لە پاڵ ناوی حەمەی کەریم ناوی(حەمە گەورەش) نوسراوە. کە پرسیاری ئەم ناوەم کرد جوامێرحەسەن محەمەدکەریم، کوڕەزای حەمەی کەریم بەمجۆرە وەڵامی دامەوە: کاتێک ساڵی(١٩٥٦) ڕوپێو دێتە گوندی حەمەی کەریم و پرسیار دەکات کێ دەڕاستی ئەم گوندەیە یەکێک پێی دەڵێت(حەمە گەورەیە)، ئەویش دەنوسێت(حەمە گەورە). بەو جۆرە ئەم ناوە لە تۆمارەکانی دەوڵەتی عێراقدا جێگیردووە.

بۆ یەکەمجار لەساڵی(١٩٧٧ ـ١٩٧٨) قوتابخانە لەم گوندەدا کراوەتەوە، کە بریتی بوە لە قوتابخانەیەکی شەش پۆلی.
ئەم فەرمانگە حوکمیانە لە ئێستادا دەکەونە سنوری گەڕەکی حەمەی کەریمەوە...
١ـ بنکەی پۆلیسی کەلار.
٢ـ بنکەی پۆلیسی هاتوچۆی ناوشار.
٣ـ فەرمانگەی پۆستە وگەیاندنی کەلار.
٤ـ فەرمانگەی ئاوی کەلار
٥ـ بانکی کەلار
٦ـ فەرمانگەی کشتوکاڵی کەلار
٧ـ فەرمانگەی ئاماری گەرمیان.
٨ـ سەندیکای ئەندازیارانی کەلار .

حەمەی کەریم لەساڵی(١٩٩١) لە تەمەنی (٩٤)ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات و لە گۆڕستانی کەلاری کۆن بە خاک دەسپێردرێت، لە دوای ڕاپەڕینی ساڵی(١٩٩١) لەبەر ئەوەی ڕوباری سیروان بە تەنیشت ئەم گەڕەکەدا دەڕوات ناوی گەڕەکەکە لە حەمەی کەریمەوە دەگۆڕدرێت بۆ گەڕەکی سیروان.

ئەنجام:
لەم توێژینەوەوە بۆمان دەردەکەوێت:
قسەکانی کاک نامیقی کوڕی حەمەی کەریم ڕاستن کە دەڵێت حەمەی کەریم لە نێوان

ساڵانی(١٩٥١ ـ ١٩٥٣) ئاوەدانکراوەتەوە بە بەڵگەی:
١ـ ساڵی(١٩٥٦) ڕووپێوی بۆکراوە و نەخشەی بۆکێشراوە.
٢ـ لە ساڵی(١٩٦٠) ژمارەی ماڵەکانی تەنها (٩)ماڵ بوونە.

## ئامارەکانی گەڕەکی حەمەی کەریم

| ساڵ | خێزان | سەر |
|---|---|---|
| ٢٠٠٩ | ١٢٢٨ | ٥٨٦٦ |
| ٢٠١٠ | ١٢٦٣ | ٦٠٣١ |
| ٢٠١١ | ١٢٩٨ | ٦٢٠٠ |
| ٢٠١٢ | ١٣٣٤ | ٦٣٧٥ |
| ٢٠١٣ | ١٣٧٢ | ٦٥٥٣ |
| ٢٠١٤ | ١٤١١ | ٦٧٣٨ |
| ٢٠١٥ | ١٤٥٠ | ٦٩٢٧ |
| ٢٠١٦ | ١٤٩١ | ٧١٢١ |
| ٢٠١٧ | ١٥٣٣ | ٧٣٢٢ |
| ٢٠١٨ | ١٥٧٦ | ٧٥٢٧ |
| ٢٠١٩ | ١٦٢٠ | ٧٧٢٩ |

زۆر سوپاس بۆ کاک جەلالی حاجی مەحمودی حاجی شریف کە هاوکارم بوو.
سوپاس بۆ حاجی مەحمودی حاجی شریف گڵاڵی.



# کاری ڕێکخراوەیی لە کەلار : بینینێک لەناوەوە

بێستون ژاڵەیی

لەسەرەتای ئەم وتارەدا دەبێت تێگەیشتنی خۆمان بۆ ئەو چەمکانە دیاری بکەین کە کۆڵەکەکانی وتارەکەن و سەربانەکەی ڕادەگرن :

کاری خۆبەخشی : ئەو کارە بێ بەرامبەرەیە کە تاک بێ بەرامبەر بۆ چاککردنی واقیعی ژیانی خۆی و دەوروبەری لەناو گرووپێکدا ئەنجامی ئەدات

کۆمەڵی مەدەنی : کۆمەڵێک بنەمای سیاسی وئابوری و کۆمەڵایەتی وروناکبیری و یاساییە کە لەچوارچێوەیدا تۆڕێکی ئاڵۆزی پەیوەندی وموومارەسە لەنێوان هێز وپێکهاتە کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگا ڕێکدەخرێت ، ئەمەش لەشێوەیەکی دینامیکی بەردەوامدا دەبێت و لەڕێی کۆمەڵێک دامەزراوەی خۆبەخشیەوە کە دادەمەزرێن و بە جیا وسەربەخۆیانە لە دەوڵەت کار دەکەن .

ڕێکخراوەکان : گرووپێکن بەیەکەوە کار دەکەن وئامانجی هاوبەشیان هەیە وچاودێری وئاراستەی کاروباری چاکەی گشتی دەکەن لەڕێی هەڵوێست و داکۆکی و هەڵمەت وکەمپینەکانی فشار وچاکەخوازیەوە .

یا گرووپێکی فشارن کاری ڕێنمایی وئاراستەکردن و ئامۆژگاری دەکەن و هەندێکیان گەورە دەبن و دەبنە دامەزراوەیەکی تەواو کە ئیدارەی ڕاستەقینە و بودجەی زەبەلاحیان

دەویت ، هەندێک لەمانە دەبنە هی سەرتاسەری وڵات یا هەرێمی و نێودەوڵەتی .
میسداقیەتی ئەم ڕێکخراوانە بەڕێژەی قازانجیان بۆ کۆمەڵگاکانیان دەپێورێ ، بۆیە گەشەی ئەم ریکخراوانەش بەستراوەتە ڕێژەی کارلێکیان لەگەڵ پێداویستی وکێشەکانی کۆمەڵگاکەیان .
ڕێکخراوەکان کاریگەری گەورەیان لەسەر گەشەپێدانی لۆکاڵی هەیە و ئەڵقەی پەیوەندی نێوان دەوڵەت وهاولاتین ، نەک ببنە پاشکۆی دەسەلات وجەمسەرەکانی هێز ، وەک بیرمەندی ڕوسی سێرگی کۆفالیفا دەڵێت «کۆمەڵگای مەدەنی ئەو کۆمەڵگایەیە کە بەشێک نیە لە دەوڵەت ،بەڵکو دەوڵەت بەشێکە لە کۆمەڵی مەدەنی

## ڕۆڵ وکاری ڕێکخراوەکان :

ئەرکی لەپێشینەی ڕێکخراوەکان پێدانی هۆشیاری و بەرزکردنەوەی گیانی مەعنەوی و سازاندنی پەیژەی بەهاکانە بۆ هاتوچۆی عمومی لە کۆمەڵگادا ، ڕێکخراوەکان دەبێت کەشێک فەراهەم بکەن کە خەڵک ئازادانە ئینتیما وئەندامێتی بکەن لە ریزەکانیاندا و بەرپرسانی ئەم ڕێکخراوانەش ئیلتیزامی تەواو بە پەیرەوی ناوخۆیەکی دیموکراسیانەوە کە هەیانە بکەن و پرەنسیبەکانی مرۆڤبوون و هاولاتی بوون تۆخ بکەنەوە .



## ڕێکخراوەکان کار و ڕۆڵی تری گرنگیان هەیە :

١.پێشکەشکردنی کۆمەکی مرۆیی وخزمەتگوزاری بۆ قوربانیانی جەنگ وتەندوتیژی وقەیران و کارەساتەکان و کەسانی کەمدەرامەت .
٢. پاڵپشتی یاسایی بۆ چین وتوێژە بەلەنگاز وپەراوێزخراوەکان و کار لەسەر چەسپاندنی یاسا و پێکەوە گونجان.
٣.قوڵکردنەوەی پرەنسیبەکانی ئاشتی ، پێکەوەژیان ، گەشەپێدانی سیاسی و کۆمەلایەتی ، لێبوردەیی ، کەلتوری مافەکانی مرۆڤ ، یەکسانی ، تەمکینی چین وتوێژ و ڕەگەزە ماف پامالکراوەکان ،ڕووبەڕوو بوونەوەی گەندەڵی ، بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری بە ماف وئەرک .
٤.چاودێری هەڵبژاردن وهاندانی مومارەسەی دیموکراسی .
٥.سازاندنی کەشی ئازاد ودیموکراسی وکرانەوەی کۆمەڵگا .
٦.کار بۆ یەکسانی وبالانسی چین و ڕەگەز بە پاراستنی مافەکان وبەدەکەوەچوونی پێداویستیەکان.
٧.تواناسازی کۆمەڵگای مەدەنی
٨.کردنەوەی کەناڵی پەیوەندی لەنێوان حکومەت و هاولاتیان ،پڕکردنەوەی بۆشایی نەبوونی

حکومەت وئیدارە لە کاتی قەیراندا .
٩.کاری بەردەوام بۆ چاکەی گشتی .

## ڕێکخراوەکان لە سەر نەخشەی جیهان

دنیای ئەمڕۆ ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی تیایدا هێزێکی گەورەی فشار ورێنمایی کردن و هۆشیارکردنەوەن و جیهانی ئێستا بێ ڕێکخراوە ناحکومیەکان نابێ ، لەپەیوەندی بە عودە وعەدەدی ئەم ڕێکخراوانەشەوە

لەوڵاتێکی وەک میسردا ٤٠٠٠٠ڕێکخراوی کۆمەڵی مەدەنی تا ساڵی ٢٠٠٠ تۆمار کراوە ، لەم وڵاتەدا بەردەوام ئازادیخوازان وچالاکانی مەدەنی بەپاساوی وەرگرتنی پاڵپشتی مادی بە بەرامبەر لەدەرەوە و خیانەتی نیشتیمانی ڕاوەدوو دەنرێن و دەخرێنە زیندانەوە و جۆرەها هەوڵی تۆقاندن و بێدەنگکردنیان ئەدرێت «ئەمە لەسەردەمی موبارەکدا تۆخ بووەوە و لەسەردەمی سیسیدا گەیشتۆتە چڵەپۆپە»

لە ڕوسیا ٤٠٠٠٠٠ و لە چین ٢٨٠٠٠٠لەڕێکخراوی تۆمارکراو هەن و دوو ئەوەندەش تۆمار نەکراون ، لەهندستان ٥٠٠٠٠٠ ڕێکخراوی ناحکومی هەیە .

ئەڵمانیای فیدراڵ ٦٢٠٠٠ ڕێکخراوی بۆ ٨٢ ملیۆن کەس هەیە ،کە ٢١٠٠٠یان خێرخوازین و ٦٨ ملیار یۆرۆ توانای داراییانە

لە ١٩٦٤ەوە ١٠٠ ڕێکخراو لەم وڵاتە داخراون بە بیانوو وپاساوی دژایەتی دەستوور ویاساکان وپێکەوەژیانی گەلان ، کە هەموویان نازی وئیسلامی بوون ، دیارترین کۆمەڵەی ئەقسا بووە .

لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زیاتر لە ١٠٠٠٠٠٠ یەک ملیۆن هەر ڕێکخراوی خێرخوازی هەیە کە ٧٪ی ئەمریکیەکان کاریان تێدا دەکەن ،بۆ تسۆنامی ئەمریکیەکان بلیۆنێک دۆلاریان کۆکردەوە و ٣٠٪خێزانە ئەمریکیەکان بەشدار بوون .

بەشێک لەو ڕێکخراوانەی کاریان هەناردەکردنی «بەهاکانی ئەمریکا»یە ولەدەرەوە کار دەکەن بودجە لە کۆنگرێس وەردەگرن ، بەجۆرێک کە ١٥٪ی هاوکاریەکانی ئەمریکا بۆ دنیا ئەدرێتە ڕێکخراوە ناحکومیەکان و هەردوو ئینستتیوتی کۆماری ودیموکراسی لەو جۆرەن ،١٨٪ی ئەم کۆمەکانەش لەڕێی ڕێکخراوە نێودەوڵەتیە ناسراوەکانی وەک بانکی نێودەوڵەتی و سنوقی دراوی نێودەوڵەتیەوە خەرج دەکرێن .

ڕێکخراوەکان لە ئەمریکا لەوڵاتێکدا کە لەسەر باج ئەژی لەسەر ئاستی فیدراڵی و ویلایەتەکانیش باج نادەن ،تەنانەت ئەو خێرخوازانەش لەباج دەبەخشرێن کە کۆمەکی دارایی ئەم ڕێکخراوانە دەکەن .

وڵاتێکی وەک تورکیاش ٩٠٠٠٠ ڕێکخراوی ناحکومی بۆ نزیکەی ٨٠٠٠٠٠٠٠ ملیۆن دانیشتوان هەیە .
٣٠ ملیۆن ئەڵمانی لەکاتی بێ فەراغدا کە لە ئیش گەڕاونەتەوە یا پشوویانە کاری خۆبەخشی ئەکەن ، بەڕێژەی ٢ سەعات لە هەفتەیەکدا .
هەرچی هەرێمی کوردستانە زیاتر لە ٤٨٠٠ ڕێکخراوی تۆمارکراوی بۆ ٧,٢٨٣,٠٠٠ کەس هەیە .
هەرێمی کوردستان
کۆمەڵی مەدەنی و ڕێکخراوی ناحکومی لە کوردستان مێژووی دوور و ڕیشەی قوڵی نیە ، لەسەرەتادا حیزبی کوردی بەتایبەت ئەوانەی لە دەسەلات بوون بە مەرامی جۆراوجۆر لە پشت دامەزراندنی ڕێکخراوەکانەوە بوون ، سەرەتا ژیانی ڕێکخراوەیی لە کوردستان مامەڵەی ئەمنی لەگەڵ دەکرا و مۆڵەت لە ڕێی وەزارەتی ناوخۆوە ئەدرایە ڕێکخراوەکان و جۆرێک لە مەحاڵ بوو چالاکوان یا گرووپێک لەدەرەوەی یەکێتی وپارتیەوە بتوانێ ئێن جی ئۆیەک دامەزرێنێ «ئەمە بەدەر لەو ڕێکخراوە پیشەیی وجەماوەریانەی حیزبەکان هەیان بوو»
بەداخەوە کوردی باشوور بەهۆی بەدبەختیە زۆرەکانیانەوە تا ماوەی نزیکەی ٢٠ ساڵ لە حکومڕانی کوردی تێنەپەڕی نەیان پەرژایە سەر بەیاسا ڕێکخستنی کاری ڕێکخراوە ناحکومیەکان لە کوردستان ، تا ساڵی ٢٠١١ یاسای ژمارە ١ بۆ ئەم مەبەستە دەرچوو ، کە لەمەشدا عیراقی ناو دیکتاتۆریە و حوکمی حیزبی سەرکردە پێش هەرێم کەوتبوو بە یاسای ژمارە ١٢ ی ساڵی ٢٠١٠ ،پێش بەرواری ئاماژەپێکراو ئەم بوارە بە یاسای ژمارە ١٥ ی ڕێکخراوە کوردستانیەکان مامەڵەی لەگەڵ دەکرا .
یاساکە واتە یاسای ژمارە ١ ی ساڵی ٢٠١١ ڕاستە تەجاوزی واقیعی قۆناغی خراپ وچەقبەستووی کاری ڕێکخراوەیی پێشووتری لەرووی ڕێکخستنی قانوونیەوە کردووە ، بەڵام ئێستا تەمەنی خەریکە دەبێتە دەیەیەک ،ئەمەش لە ڕوانگەیەکی یاساییەوە با یاسایەکی نمونەیش بێت ، بەڵام هەر دەبێ هەموار بکرێتەوە ،چونکە بۆ بوار وکایەیەکی ئێجگار پڕ جوڵە و گرنگ و گۆڕاو و گەردونیە کە بەردەوام لەبازدانی گەورەدایە بۆ پێشەوە .
مادەی ٢٠ ی جاڕنامەی مافی مرۆڤ باسی ئازادی ئینتیما بۆ کۆمەڵە و ڕێکخراوێک و ئازادی کشانەوەش دەکات
یاسای ژمارەی ١ ئەمەی لە مادەی شەشەمدا بۆ پەیڕەوی ناوخۆیی ڕێکخراو جێ هێشتووە و لەبەندەکانی یەکەم و دووەمی مادەی حەوتدا سزای بۆ داناون لەسەر چەمکێکی مەتاتی «دەرکردنی ئەو بڕیارانەی دەبنە مایەی ناکۆکی لەبەرژەوەندی کەسی یا وەزیفی»
لەپاڵ تۆمارکردنی ئەلیکترۆنیدا یاسا و ڕێوشوێنەکانی فەرمانگەی ڕێکخراوەکان لەتۆمارەکان و ڕاپۆرتی دارایی پڕ ڕۆتین و قورس کراون ،لەکاتێکدا ئازادی بیروڕا و کۆبوونەوە و

ڕێکخراوبوون مافی بنەڕەتی وسادە وسروشتین بەپێی قانونی دەولی .
بەندی ٤ ی مادەی ١٤ ماڵ ودارایی و داهاتی ڕێکخراو لە باج دەبەخشێ ،بەڵام بەپێی یاسا کارپێکراوەکانی دنیا دەبێت ئەم بەخشینە بۆ کەس ولایەنی بەخشەریش بێت .
لەئێستاوە گرنگە فۆکس بخەینە سەر گەرمیان و کەلار ، ئەڵبەتە ئەم ناوچەیە لەکاری ڕێکخراوەیدا هاوشێوەی ناوچەکانی تری کوردستانە و تەنیا چەند جیاکەرەوەیەکی بچووکی وەک کەنارکەوتن و بزێوی و ئازایەتی زیادی گەنجەکانی و ماوەیەک درەنگ ودواکەوتنی کاری مەدەنی لێ دەرکەیت ،ئیتر هاوبەش وچوون یەکیەکانی لەگەڵ باقی کوردستان زۆرن ، بۆیە لێرە بەشێک لە کۆسپ وکێشەکانی بەردەم کاری مەدەنی لەکەلار نیشان ئەدەین:
١.نەبوونی پاڵپشتی دارایی بێ بەرامبەر وبێ ئەجێندای شاراوە وپاک بۆ ڕێکخراوە لۆکاڵیەکانی کەلار وگەرمیان.
٢.گەندەڵی وبەهەدەردان لەژمارەیەک ڕێکخراودا .
٣.ژینگەیەکی فشۆڵی دیموکراسی ناسەقامگیر و سیستەمێکی ناوەندگەرا»مەرکەز»ی خنکێنەری کۆسپ سازێن .
٤.دەسەلاتەکانی کۆمەڵگای کەلاری وهێزە سیاسی و ئاینی و کۆمەڵایەتیەکان لێرە لە زۆر حاڵەتدا تێڕوانینێکی نزم و گوماناویان بۆ کاری مەدەنی و ڕێکخراوەکان هەیە ، مامۆستایانی ئاینی ومزگەوت ئەو هەموو دەقە ئاینیە هاندەرە بۆ خۆبەخشی وخێرخوازی و ڕێکخستنی ژیان وئیدارەدان و مونەزەمی بەئاراستەی کاری مەدەنی وڕێکخراوەیی تەوزیف ناکەن .
٥.پێکەوەنەگونجان ویەکتر قبوڵ نەکردنی ڕێکخراوەکان ، بەهۆی باکگراوندی ئایدۆلۆژی وئاینی و ئەتنی و کۆمەڵایەتی وتەنانەت ناوچەگەریشەوە «بەنمونە ئێمە نەک لەگەرمیان و کەلار بەڵکو لە کوردستانیش فیدراسیۆنی ڕێکخراوەکانی مافی مناڵ یا ژینگە یا خێرخوازیمان نیە»
٦.دیکتاتۆریەت لە پەیکەری ڕێکخراوەکاندا وشەڕی بچوک بچوک لەسەر دەسەلاتەکان و دابەش نەکردنی ئەرکەکان بەپێی لێهاتوویی .
٧.دابەش بوونی ئایدۆلۆژی وعەقائیدی و کارکردن دژی ئەجێنداکانی یەکتر .
٨.نەبوونی توانا ولێهاتوویی چاودێری کردن و نەزانینی ڕێوشوێنە زانستی وکاریگەرەکانی چاودێری کردن بۆ کاری دامەزراوەکانی ئیدارە وحکومەت .
٩.نەبوونی بەرنامەی ستاندارد وبێلایەنی تواناسازی .
١٠.کرچ وکاڵی وسەرەتایی بوون ونەمەینی کەلتوری خێرخوازی وخۆبەخشی لەناو خێزاندا لێرە.
١١.لۆکاڵی بوون «ڕێکخراوەناحکومیەکان لەکەلار و کوردستانیش قەتیسی چوارچێوە جوگرافیە بچوکەکانن و هەر یەکە لە دەڤەر و سنورێکی جوگرافیدا چالاکن .

١٢.مامەڵەکردن لەگەڵ کاری ڕێکخراوەیدا وەک کاسپی ومەیدانی پارەپەیداکردن و کردنەوەی خول بەنرخی گران و گەڕان لە فەند وپارەپەیداکردن وەک هۆکارێکی دەوڵەمەندبوون .
١٣.بوونە دەرگای پشتەوەی حیزبەکان وهەڵگرتنی ئەجێندای ئایدۆلۆژی وحیزبی .
١٤.فەوزا لە مامەڵەی ئیداری لەگەڵ ئەم بوارە لەسەر ئاستی هەرێم.
١٥.شەڕی دەسەلات ، دیکتاتۆریەت ، خۆسەپاندن وتاکڕەوی وفەردانیەت زۆر لە ڕێکخراوەکانی سیس کردووە وپوکاندۆتەوە وبەسەر خۆیاندا دایخستوون .
١٦.ڕێکخراوەکان زۆر کات پێوەرەکانی فەرمانگەی ڕێکخراوەناحکومیەکانیش ڕەچاو ناکەن وبەشی زۆریان وەک دوکانێک دانراون ولەوەتی هەن داخراون ،یا هەر بە ڕاپۆرت و ناو و لەهەلای تۆڕی کۆمەلایەتی و ئیعلامیدا هەن .
١٧.نزیک نەبوونەوە وکەمپەین وکاری جدی بەگروپ نەکردن لەسەر کێشە جدی ودیارەکان «ئالودەبوون بەمادەی هۆشبەر ویاریەئەلیکترۆنیەکان ،بەرزبوونەوەی ڕێژەی تاوانی ڕێکخراو ومافیایی و کوشتن،گۆشەگیری ونامۆبوون ، ڕەزیلەتی ئەخلاقی ، نائارامی وشلەژانی خێزانی ،کێشەگەورەکانی پەروەردەوفێرکردن ، بەهەدەردانی بودجەی گشتی ، دوورکەوتنەوە لە حوکمی ڕەشید ، مەحسوبیەت ومەنسوبیەت « لەجیاتی ئەمانە نووسانی بەردەوام بە جێندەر ،خەتەنەی مێینە وشتی لەو بابەتانە ئەمەش ئەجێندای دەرەکی گومانلێکراو ئاراستە وفەندی ئەکات .
١٨.سود نەبینین وتەوزیف نەکردنی میراتی فەرهەنگی و ئەدەب وهونەری میلی و ئەو هەموو دەقە ئاینیە بۆ کاری مەدەنی بەتایبەت لەبواری چاکەی گشتی ،بەخشین ، خۆبەخشی ،خێرخوازی ،ئیسلام ئاینی زۆرینە ولەسەر ئاستی ڕیشاڵی لەقولایی دەروونەکاندایە ،ئەمەش وای کردووە کاری مەدەنی بەهی نوخبە ودەستەبژێرێک بمێنێتەوە وشۆڕنەبێتەوە .
١٧.گەنج وەک مەخلوقێکی پڕ وزە وچالاک کە بربڕەی پشتی ژیانسازی وئایندەسازیە ،لەکایەی کاری ڕێکخراوەیدا لە کەلار و گەرمیان ونن یا وردتر ونکراون و خراونەتە کەنار وپەراوێزەوە و ڕۆڵی لاوەکی وشکڵیان ئەدرێتێ :ئەمەش هۆکاری جیاجیای هەیە:
*نەبوونی پاڵنەری کەلتوری وپەروەردەی خێزانی کە هاندەر بێ بۆ گەنج وچین وتوێژەکان بۆ چاکەی گشتی وکاری بەگروپ وخێرخوازی»کەلتوری خۆبەخشی وخێرخوازی»
*نەبوونی کاری خۆبەخشی لە پرۆگرامەکانی خوێندندا لە گشت قۆناغەکانی خوێندندا .
*جۆرێک لەتێکەڵ کردنی کاری کۆمەڵی مەدەنی بەئیلحاد وعەلمانیەتی توندی ئایدۆلۆژی ، کەلەسەر ئاستی میلی لە کۆمەڵگای ئێمەدا ئەبێتە هۆی ترس ولێ تەنینەوە و دوورکەوتنەوە و دابڕان .
*نەبوونی کەلتوری خۆبەخشی وچاکەی گشتی لە خێزاندا.

*کەمی گەنج لەئیدارەدانی ڕێکخراوەکان وهەرەمی بەڕێوەبردن وئاراستەکردنیاندا بۆ ڕێکخراوەکانیش لەبەر زۆر هۆ تەنگژە وکێماسیە ، لەوانە :
_ گەنج کائینێکی ئاگادارە لە چواردەوری ولەناو گەشە وگۆڕانکاریەکاندایە
_گەنجان هێزێکی گەرم وگوڕ وئازا وبوێری فشارن .
_گەنج تەکنیک و تەکنۆلۆژیای نوێ وشێوازی زانستی ڕێکخستن وبە ڕێوەبردنی پلان وپرۆژە دەزانن و بەکاردێنن .
_گەنج لەئێستادا مەخلوقێکی گەردونیە و بەردەوام لەسەر خەت ولەپەیوەندیدایە و هەموو ژیانی کۆمەنیوکەیشن و تەفاعولە لە ڕێی سۆشیال میدیاوە حزوری هەمیشەیی هەیە ،ئەمەش بۆ ڕێکخراو وکاری مەدەنی زۆر گرنگە .
١٨. لەپەیوەندی بەژن وکۆمەڵی مەدەنیشدا بەکارهێنانی ژن وپرسەکانی ژنان وەک چەکی ئایدۆلۆژی و شەڕی کەلتور وئاین وبەهاکان لەجیاتی تەوزیفکردنی میهرەبانی و دایکایەتی و سۆز وگەورەیی ژن ، لەبری سود بینین لە توانای ڕێکخستن و تەحلیل وتەحەمول و شیکردنەوە و دیققەتی بینین وسەرنجدان و خوێندنەوە و وردبینی وهەستیاری و وردەکاری ژنان .
ئێمە لەم ناوچەیە وکوردستانیش لەئێستادا شایەدی بەرزبوونەوەی ڕێژەکانی تەڵاق وجیابوونەوە و دوورکەوتنەوە لە هاوسەرگیری وبەرزبوونەوەی سامناکی ڕێژەکانی خۆسوتاندن وخۆکوشتن و توندوتیژی خێزانی و منالی فرێدراو و بەدێو و دوژمن کردنی پیاو و ژن لەیەکترەوەین .
ئەو هەرا وهەڵا وشەڕ بەرپاکردنەی هەندێک چالاکوان لەمیدیا وچالاکی ومیتینگ وپانێڵەکاندا دەیکەن ، فەزایەکی مەجازی وپڕ ناکۆکی و بارگاوی و خاڵی لەمتمانە ویەکتر تەواوکردنی دروست کردووە ، کە کۆمەڵگای خستۆتە بارێکی گرژ وئاڵۆز ونائارام .
١٩.ڕێکخراوەکان لە کەلار هەڵگری تایتڵی گەرمیانن ، بەڵام نەیانتوانیوە نوێنەرایەتی هەموو ناوچەکانی گەرمیان بکەن و زۆرتر قەتیسی کەلار بوون .
ئاسۆکان :
١.ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی سیستەمی دیموکراسی بێلایەن و ئیدارەی نائایدۆلۆژی دەوێ بیپارێزێ و گەشەی پێ بدا وژینگەی گەشە وگەورەبوونی بۆ بسازێنێ .
٢. دەبێت کۆمەڵی مەدەنی وکاری خۆبەخشی وخێرخوازی وبەخشین وەک مادەیەکی سەرەکی لە هەموو قۆناغەکانی خوێندندا بخوێنرێت .
٣. هەمووارکردنەوەی یاسای ژمارە ١ ی ٢٠١١ لە پەرلەمانی کوردستان ،بەجۆرێک لەگەڵ گەشە وگۆڕانکاریەکاندا هاوتەریب بێ و کۆسپ وتەگەرەکان لابدات ،بەسودبینین لەیاسای ئەو وڵاتانەی بە یاسا و کاری ڕێکخراوەیی کاریگەر وپلاندار پێشقەچوونی گەورەیان تۆمارکردووە

،ئەڵبەتە بەڕەچاوکردنی کەلتور وبەهابالاکانی کوردەواری .
٤. دوورخستنەوەی دەخالەتی حیزبی وسیاسی وخراپ بەکارهێنانی نفوزی هێزە دەسەلاتدارەکان و تەکەتول و بەرپرسان لەکاری ڕێکخراوەیی .
٥.کۆتایهێنان بەسەیرکردنی ڕێکخراو وەک هێزی پشتیوانی لەحیزب و وەک ئەداتێکی بەرگری لە دەسەلات وئۆپۆزسیۆن «ڕێکخراو ئۆپۆزسیۆنی حکومەت نیە و ئیشی فشار ورێنمایی وهەماهەنگی وتۆڕبەندی وکاری هاوبەشە .
٦.کردنەوەی کەناڵی پەیوەندی راستەوخۆ لەنێوان ڕێکخراوەکان و دەزگاکانی حکومەت»ئەمنی،خزمەتگوزاری»و دامەزراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی «مزگەوت ، زانکۆ ، دامەزراوە رۆشنبیری وکۆمەلایەتیەکان» لەسەر ئاستی گەرمیان وکەلار .
٧.تێگەیشتن ومامەڵەی واقیعی دوور لەگەورە یا بچوککردنەوە لەگەڵ کێشەکانی کۆمەڵگا وبەها وپیرۆزیەکانیدا .
٨.پاڵپشتی ڕێکخراوەکان وکاراکردنیان بەپرۆگرامی بێلایەن وگشتگیری بەرزکردنەوەی تواناکان و وەرشەی کاری زانستی ،کۆنگرە ،کۆنفرانس ، تویژینەوە ، راپرسی لەسەر ڕۆڵ وکاریگەری و روئیاپێدان .
٩.هەلی هاوبەش لە پێشکەش کردنی پرۆژە و وەرگرتنی فەند و ڕاهێنانی ریکخراوەکان لەسەر تەکنیکەکانی .
١٠.کارکردن بۆ دادپەروەری جوگرافی لە کاری ڕێکخراوەیدا لە کەلار .

# هۆکارەکانی تەڵاق و لێکجیابوونەوە



ئامادەکردنی: گۆران حسێن
ماستەر لە یاسای تاوان-ئەمەریکا

بەختەوەری بریتیە لەگونجان و باوەڕبەخۆبوون, ڕازی بوون بەوژیانەی کەهەڵیبژاردووە, هێلیکە هەرگیز بیر لەڕابردوو ناکاتەوە بەڵکو بناغەی دوا ڕۆژ و ئاسۆ و ئومێدێکی گەورە دەبەخشێت بۆ گەیشتن بەلووتکەی خۆشگوزەرانی ژیان و هاوسەنگیی لەدەروونی هەردوولادا دروست دەکات.ئەرستۆ دەڵێت:( بەختەوەری لە لۆژیکەوە دێت بەهۆی بەکارهینانی عقڵەوە). هەروەها فرۆم دەڵێت: (بەختەوەری گەورەترین داهینراوی دەستکەوتەکانی مرۆڤایەتییە ئەمەش ئەزموونێکە بۆ کەسایەتی تاک لەسەر ڕامان بەرامبەر بەجیهانی دەرەوە, هەروەها هونەری ژیان و هونەری بەردەوامبوونی خێزان «بەختەوەرییە» ئەم بەختەوەرییەش بەچالاکی و پەیوەندی دڵسۆزی لەگەڵخۆت و خەڵکدا جوان دەبێت ).هەروەها سپینوزا دەڵێت: (بەختەوەری بریتیە لەپاکی و بەهێزی و ملکەچ بوون بۆ حەزوو ئارەزوو).خەیاڵ و واقیع دووشتی جیاوازن لەبەرئەوە هاوسەرەکان هەڵدەستن بەگۆرینی سیفەتی خەیاڵی بەوسیفەتانەی لەواقیعدا هەن وبوونیان هەیە مەحاڵ نییە. ئەفلاتۆن دەڵێت: (ئافرەت بە بێی خۆشەویستی مردووە)
دەبێت خۆت هەوڵی بەدەستهێنانی ئاسوودەی بدەیت, ئەوەی خەڵک پێتدەبەخشێت

لەهەرکاتێک بێت هەرخۆشیان دەتوانن لێتوەرگرنەوە. لەئەمرۆدا بەرزبوونەوەی ڕێژەی تەڵاق و لێکجیابوونەوە بوونەتە یەکێک لەترسناکترین کێشەکانی نێوکۆمەڵگاو پێکهاتەی خێزان لەبنەرەتدا هەڵدەوەشێنێتەوە.دیاردەی توندوتیژی و جیابوونەوە لەدیاردەکانی سەردەمی ئێستایە کەژیانی شارستانی و هاوچەرخ بەخۆیەوە دەبینێت, سەرەڕای بوونی ئەو یاسایانەی ڕێگری لەم دیاردەیە دەکەن هێشتا کاریگەری زۆربەی دابو نەریتی فەرمی و نافەرمییەکان بوونەتە هۆکاری ئەوەی ئافرەتان دووچاری جیاکاری وستەم ببنەوە, لابریۆر دەڵێ: ( ئافرەت لە خۆشەویستی و لە هاوڕێیەتیدا لە پیاو باشترە!). لەلایەکی ترەوە چۆنیەتی خراپ بەکارهێنانی تۆرە کۆمەڵایەتییەکان و ڕاگەیاندنی بینراو بیستراو کاریگەری و ڕۆڵی نەرێنیان لەکۆمەڵگادا هەیە لە ماددەی( ٢) یاسای قەدەغە کردنی خراپ بە کارهێنانی ئامێرەکانی پەیوەندیکردن لە هەرێمی کوردستان- عێراق هاتووە (سزا دەدرێت بە بەندکردن ماوەیەک کەمتر نەبێت لە شەش مانگ و زیاتر نەبێت لە پێنج ساڵ بەبژاردن کەمتر نەبێت لەیەک ملیۆن دیناروزیاتر نەبێت لە پێنج ملیۆن دینار یان بەیەکێک لەم دوو سزایە هەرکە سێک بەخراپی تلفونی خانەی یان هەرئامێریکی پەیوەندی بەتەل یان بێتەل یان ئینتەرنێت یان پۆستی ئەلیکترۆنی بەکار بهێنیت ئەوەش لەڕێگای هەڕەشە یان تۆمەت هەڵبستن یان جنێودان یان بڵاوکردنەوەی هەواڵی جۆراوجۆر کە ترسی لیبکەویتەوە و دزە پێکردنی گفتوگۆکان یان وێنەی جێگیر یان جوڵاو یان کورتە نامە کە دژی ڕەفتارو ڕەوشتی گشتی بێت یان وێنە گرتنی بێ مۆڵەت یان بێ ڕەزامەندی یان دانە پاڵی بارێکی وا کە ئابڕو بروشێنێت . خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لەسوورەتیالاحزاب باسی تەلاقی کردووە دەفەرموێ (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا (٤٩).**

توندو تیژی بریتیە لە هەرکردارو گوفتارێکی توند پاڵنەرەکەی جیاوازی ڕەگەزی بێت یان ببێتە هۆی زیان و ئازار و مەینەتی لەرووی جەستەی و دەروونی و ماددی یان هەڵنەساندنی بە ئەنجامدانی کارێکە بەپێی یاسا دەبێت ئەنجامبدرێت. یان توندو تیژی بریتیە لە هەموو کردارێک یان ووتەیەک یان هەڕەشە کردن لەبەرامبەر لەسەر بنچینەی جۆری کێشە کۆمەڵایەتیەکان لەچوارچێوەی پەیوەندییە خێزانییەکاندا بنیاد نراون لەسەر بنچینەی هاوسەرگیری و خزمایەتی تاوەکو پلە چوارو ئەوەی خراوەتە پاڵ خێزان بە یاسا کە دەبێت زیان بگەیەنێ لە رووی جەستەی و سێکسی و دەروونی و داماڵینی مافەکان و ئازادییەکان. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لەسوورەتی (البقرە) باسی تەلاقی کردووە (**وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ ثَلَاثَةَ قُرُوءٍ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَنْ يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللَّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ إِنْ كُنَّ يُؤْمِنَّ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَٰلِكَ إِنْ أَرَادُوا إِصْلَاحًا وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٢٢٨).**

هەروەها لە ماددەی (١٤) دەستووری عێراق «عیراقیەکان یەکسانن لە بەردەم یاسا بەبێ جیاکاری

لەسەر بنەمای ڕەگەزو نەتەوە,ڕەگەزنامە, ئایین, تایفە, بیروباوەر یان باری کۆمەڵایەتی). لە ماددەی (١) ڕێککەوتنامەی سیداو (CEDAW) ڕێ لە هەموو وابەستەیو جیاکارییەک لە دژی ژنان دەگرێت.شکسپیر دەڵێ( زۆربەی هاورێیەتی ساختەیە و زۆربەی خۆشەویستی گەمژەییە)

لە ماددەی دووەمی یاسای بەرەنگاربوونەوەی توندو تیژی خێزانی لە هەرێمی کوردستان-عێراق ژمارە (٨) ی ساڵی ٢٠١١ دا هاتووە ( قەدەغەیە لە سەر هەرکە سێک وابەستەی پەیوەندی خێزانی بێت و توندتیژی جەستەی و سێکسی و دەروونی ئەنجامبدات لەچوارچێوەی خێزاندا وەک:

١- هاوسەرگیر ژن بەژن و بەشوودانی بچووک.

٢- زۆرلێکردن لە هاوسەرگیری.

٣- تەڵاقدانی بەزۆر.

٤- بڕینی پەیوەندی خزمایەتی.

٥- پیاوێک کە بە زۆر ژنەکەی بنێرێتە لەشفرۆشی.

٦- خەتەنەکردن.

٧- ناچارکردنی تاکەکانی خێزان لەسەر وازهێنان لەفەرمانبەرییەتی یان کار بەبێ ڕەزامەنی خۆیان.

٨- ڕێگرتن لە و توندو تیژیانەی ناو خێزان کە دەبێتە هۆی خۆکوشتنی ئەندامێکی خێزان.

٩- بەزۆر لەباربردنی منداڵ.

١٠- لێدانی تاکەکانی خێزان و مناڵان بەهەربیانوویەک.

١١- شکاندنی کەسایەتی تاکەکان بەهۆی جنێودان و بەسووک تەماشاکردنیان و ئازاردنی دەروونیان.


ستاندال

لەم چەند ساڵی دواییدا هێشتا کۆمەڵگەی کوردی ڕووبەرووی کێشەی کۆمەڵایەتی جۆراوجۆر دەبێتەوە و چەند فاکتەرێکی ناوخۆ ودەرەکی کاردەکەنە سەر مافەکانی ژنان , لەوانە کەلتوورو داب و نەریت و گەیشتنی تەکنۆلۆجیایی نوێ و بەجیهانی بوون, بەتایبەتی کاریگەری لەسەرنەوەی نوێ هەبێت, بەڵام سەرچاوە ئابوورییەکان و هەژاری و ڕۆشنبیری وسیاسی ڕۆڵێکی گەورە دەگێڕن بۆدروستبوونی کێشەی خێزانی لەکۆمەڵگای کوردیدا,وەک ستنداڵ دەڵێ: (ئافرەت ئامێرێکی مۆسیقای جوانە,ژێیەکانی خۆشەویستیە). سەرەڕایی ئەوپێشکەوتنانەی لەجیهاندا ڕوودەدەن لەسەرپرنسیپی ئاشتی

و یەکسانی وجیاوازی نەکردن لەنێوان ڕەش پێست و سپی پێست و ژنان و پیاوان لە ماف و ئەرکداوهاتنە کایەی باری ژیانی مۆدێرن کە داب و نەریتی کۆمەڵگا دەگریتەخۆی, هێشتا توندو تیژی بەردەوامە وەک لە ماددەی (١) میساقی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە سەبارەت بەلێکۆڵنەوەی هاوکاری دەوڵەتان لە بواری نەهێشتنی توند تیژی دژی ژنان و باشترکردنی ڕێزگرتن لە مافەکانی مروڤ و نەهێشتنی جیاوازی ڕەگەزی و بواریان بۆ فەراهەمبکرێت بەشداربن لەبواری سیاسی و ڕۆڵیگرنگ بگێرن لەبنیادنانی کۆمەڵگادا).

ماکۆلی دەڵی: (جوانترین دیمەن کەکاردەکاتە سەر دەروون, دیمەنی ئافرەتێکی جوانە کەدەگری یان ئازار دەکێشێ)خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لەسوورەتی ( البقرە) باسی تەلاقی کردووە و دەفەرموویت:

**(وَإِنْ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّا أَنْ يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَ الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ وَأَنْ تَعْفُوا أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَلَا تَنْسَوُا الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ إِنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٢٣٧) وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ (٢٤١)**

دەتوانین بڵێن ماف بریتیە لە بەرژەوندییەک یاسا دەیپارێزێت, واتە سیستەمی مافی مرۆڤ بەهۆی دوو میکانیزمەوە دەپارێزرێن و چاودێری دەکرێن, ئەوەش بەندە بەبەڵێنامە و ڕێککەوتنامەوە. پەرەسەندی یاسا نێودەوڵەتییەکانی مافی مرۆڤ وەک میکانیزمێکە بۆپاراستن و چاودێری کردنی پێشێل کارییەکانی مافی مرۆڤ لەئاستینیودەوڵەتیدا, بۆنموونە کۆنگرەی نێودەوڵەتی بۆ نەهێشتنی هەموو شێوازەکانی جیاوازی ڕەگەزایەتی و بەڵێنی نێودەوڵەتی بۆمافە مەدەنی و سیاسییەکان, بەڵێنی نێودەوڵەتی بۆ مافە ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەلتوورییەکان. هەروەها لە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ١٩٤٨/١١/١٠ هاتووە هەموو کەسێک بەئازادی لەدایک دەبێت و لە ماف و ئەرکدا یەکسانن ) هەموو مرۆڤێک مافی ئەوەی هەیە چێژ (تمتع) وەربگرێت بەهەموو ئەو ماف و ئازادییانەی لەبەندەکانی (میساق) نەتەوە یەکگرتووەکاندا ئاماژی پێدراوە.شکسپیر دەڵێ ( لە ژیاندا ڕێنمای سێ کەس مەکەن ڕۆشنبیرێکی لەخۆبایی, کچێکی جوان, گەنجێکی تازە پێگەیشتوو).

پرەنسیپی (مافی تێکۆشان و کۆشش-Due Diligence) لەبواری یاسای نێودەوڵەتیدا داوا لە دەوڵەتان دەکات دەست بەکاربن کاتێک پراکتیسی زیانبەخشی بنەڕەتی ڕوودەدەن لە خێزاندا چونکە یەکێک لەئامانجە بنەڕەتییەکانی یاسا بریتیە لە پاراستنی ماڵ و موڵکی تاک و ڕێکخستنی ژیانی خێزانی و پەیوەندی نێوان تاک و کۆمەڵگا ڕێک دەخات لەسەر بنچینەی یاسا وپرەنسیپە نێودەوڵەتییەکان, تاوەکو ببێتە هۆکاری چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتیی و خێزانییەکان وژیانێکیان بۆ فەراهەم بکات گونجاو بێت لەگەڵ پێشکەوتنی شارستانی سەردەم و بەها مرۆڤایەتییەکانداو سەرنەکێش بۆ ڕووبەڕووبوونەوە توندو تیژی و جیابوونەوە.

## «گرنگترین هۆکارەکانی تەڵاق و لێکجاییبونەوە»



مارك توين

ڕۆڵان دەڵی:( خۆشەویستی هونەرێکە ژن دەیزانێت و پیاو فێری دەبێت) هەرکۆمەڵگەیەک دۆخی وەچەرخان تێپەڕێنێت بیگومان بێسەروبەری ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتیتەواو بەرۆکی دەگرێت, دووچاری زۆرێک لەئاریشە کۆمەڵایەتییەکانی دەکاتەوە. خێزان بنەمای کۆمەڵگەیە, بۆیە ڕێکخستن و دەستەبەرکردنی ئارامی وسەقامگیری تێدا هۆکاری ئارامی سەقامگیری کۆمەڵگەیە,بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە یاسا ئەو ئەرک و مافانەی دیاریکردووە کە ژیانی هاوسەرێتی ڕێکدەخات بۆگەیشتن بەئاسوودەی و خۆشگوزەرانی, ئاشکراییە یاسا بەتەنها دەستەبەری مافەکان ناکات بەڵکو ژن و پیاو دەبیت خۆیان ڕۆڵی کاریگەرو بنەرەتییانەیان هەبێت لەبەدیهنانی ئەم پرسە, ئەوەش لەدەرئەنجامی ئەوەی کەهەردووکیان یەکپایەی مرۆڤایەتیان هەیە.. مارک توین دەڵی:( لەئافرەتێکی تەمەن نەوەد ساڵەم پرسی: کەی ئافرەت لەخۆشەویستی دەوەستێت, ووتی لە یەکێک بپرسە لە من بەتەمەنتر بێت ) .بە کورتی دەتوانین بەم جۆرە ئاماژەیان بو بکەین:

### ١-/ کات:

برناردشۆ دەڵێ: ( پیاوی زانا ئەوکەسەیە لەگەڵ ڕۆژگار خۆی بگونجێنیت, نەزان ئەوکەسەیە کە دەیەوێت رۆژگار لەگەڵ خۆی بگونجێنێت!). ژیان زۆر بەزەحمەت مەگرە, لووتکەی هەموو سەرکەوتنی ژیان ئارام گرتن و لەسەرخۆیە, کات سنووردارە ناتوانیت بەدەستی بهێنیت بەڵام ئەتوانی بەکاریبهێنیت بۆ چارەسەرکردنی کێشە خێزانییەکان, ناتوانی هەڵیبگریت بەڵام ئەتوانی سەرفی بکەیت, باشکستی گەورەت هەبێت تۆ تەنها یەکجار دەژیت. ئەو کارەبکە کەسۆزو خوشەویستیت بۆی هەیە .بەشێوەیەکی پرۆفێشناڵانە هەڵەکان بقۆزەرەوە, مەترسە لەشکستی گەورە و خەونی گەورە, بەڵام لە بیرت بێت خەون بەبێ ئامانج تەنها خەونە و لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی نائومێد بوون, خەونت هەبێت با ئامانجت هەبێت, خەونی ژیان, خەونی ساڵانە, خەونی مانگانە, خەونی رۆژانە, هەوڵبدە هەموو ڕۆژێک ئامانجت هەبێت و تێبکۆشە بۆ بەدەستهێنانی. بەردەوامبە لە هەوڵی زۆر, بەردەوامبە لەهەبوونی ئامانج. ئەو کاتەی کەلەدەست دەرچوو هەرگیز ناتوانی بەدەستی بهێنیتەوە, لەناخی هەمووماندا دوو دەنگ هەیە دەنگێک ئەیەوی بەرز ببینەوە , گەورە ببین ,گەشبین بین, پێبگەین, سەرکەوتوو بین, ئاسوودە, و بەختەوەر بین لەژیاندا, هەمیشە

پلان و ئاواتت هەبێت بۆ گەیشتن بەئامانج, دەنگێک ئەیەویت تەمەڵ بین و دانیشن و سەرلێشێواو بین کار نەکەین و نەگەین بەخەون وئاوات و ئامانج, ئایا توو لە کامیانی ؟ ئەزانن کامەیان براوە دەبیت؟ ئەو دەنگەیە کەزیاتر گوێی بۆ دەگرین وگرنگی پێدەین و بەجوانی لێتیدەگەین, ئەوە بژاردەی خۆمانە چۆن کاتەکانمان بەکاربهێنین. ژیان فێرمان دەکات کەکاتەکانمان باش بەکاربهێنین و کاتیش فێرمان دەکات کەنرخی ژیان بزانبین..دیل کارەنگی دەڵێ :( ئەگەر دەتەوێت کەسێکی سەرەنج ڕاکێش بیت هەمیشە گفتوگۆ لەسەر ئەوشتانە بکە بەرامبەرەکەت حەزی لێیەتی). چونکە مروڤ هەموو بەیانیەک ٨٦٤٠٠ هەشتاو شەش هەزار و چوارسەد چرکە دەرواتە سەر هەژماری ژیانت, چی لێدەکەیت ؟ چۆن بەکار دەهێنیت ؟ هەمیشە دەتوانی پارەی زیاتر بەدەست بخەیت بەڵام کاتی زیادە بەدەست نایەت, بۆ زانینی بەهای یەک سعات, پرسیار لە دوو خۆشەویست بکە کە چەندین ساڵە لەپەیوەندی خۆشەویستیدان, بو زانینی بەهای یەک خولەک پرسیار لە کەسێک بکە فرۆکەکەی لەدەست چووە, زۆرینەی ئێمە کەسە گرنگەکان لە دەست دەدەین تەنها بو ئەوەی ڕێز لە کاتەکانیان ناگرین یان تێنەگەیشتینک روویداوە, ئایا ئەوکاتە بەچیەوە سەرف دەکەین؟ دەبێت بەشێکی ئەوکاتە دابین بکریت بۆ گفتوگۆ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان و ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی ژیانمان کەبەرۆکی گرتووین و لەدەرگای ژیانت دەدات. ووتەیەکی ژاپۆنی دەڵێت: ( کەسێک ئیرادەیەکی بەهێزی هەبێت باوەری بە شانس نییە).

## ٢-لێکتێنەگەیشتن:

ڤێرجینیا دەڵێ ( سەیری خۆشەویستی لەوەدایە ئەگەر کچێک کوڕێکی خۆشبوویت پێوایە پادشایە لە ناو هەموو پیاواندا). خەفەت خواردن بۆکاتێکی لەدەست چوو کات بەفیرۆدانێکی ترە, بەجۆرێک بژیت ئەگەر باسی ڕابردووت کرا خۆت لە گێلی نەدەیت, یەکێک لەوهۆکارانەی ئەمرو تەشەنەی کردووە دەبینین لەنێوان تاک و خێزانەکاندا لێکتینە گەیشتن هەیەو کاتێکی زۆر بە فیرۆ دەڕوات .ئەمەش دبێتە سەرەتای درەستبوونی ناکوکی و کێشە و لەئەنجامدا تەڵاق و لێکجیابوونەوە روودەدات و کۆمەڵگە بەرەو ناسەقامگیری خێزانی دەبات و هەندێ جار دەگاتە ئاستی لێدان و کوشتن و خۆوکوشتن و خۆسووتاندن و دادگاکان پر دەبن لە کێشەی جۆراو جۆر. بۆ ئەوەی ئەندامانی خێزان لە نێوکۆمەڵگەدا بەدووربن لەهەر کێشەیەک و لەمانای ژیانێکی ئاسوودە و خوشبەخت تێبگەن دەبیت زوو بڕیار نەدەن لەسەر سەرجەم قسە و کێشەکان



ڤیرجینیا ئۆڵف

.ئەو کات دەبێت لێکۆڵینەوەی وورد لەبارەی ئەولێکتینەگەیشتنە بکەین کەوابکات سەرنەکێشی بو توندوتیژی خێزانی و ڕاستبکریتەوە بەجۆریک بێت گونجاو بێت لەگەڵ ژیانی شارستانی پێشکەوتنی گەلانی دونیادا. چەند فاکتەرێک هەن کە دەبنە هۆی نەگونجان لەوانە: گرفتی کەمی تەمەن و نەبوونی متمانە بەیەکتری و جیاوازی ئاستی ڕۆشنبیری نێوان خێزانەکان. چونکە سروشتی مرۆڤ ئاوایە هیوا و ئامانج وپلانی هەبێت, «ئیمە پلان دانانێن بۆ شکست بەڵکو شکست ئەهێنین و بۆئەوەی پلانی بو دابنێن» .

## ٣-هۆکاری ئابووری:

لایەنی ئابووری هۆکارێکیکاریگەر و پاڵنەرێکی سەرکییە بو تەلاق دان و لێکجیابووەنەوە و هەڵوەشانەوی خێزان. بۆیە دەڵێن (کاسەی پر ئاشتی ماڵە). ماڵ جیایی نێوان ژن و مێرد هۆکارێکە بۆ لەدەستدانی سۆزو خوشەویستی خێزانی بەرقەرار نەبوونی بەختەوەری.

## ٤-تەکنەلۆجیا (موبایل-ئینتەرنێت):

ئەمرۆ لەساییەی جیهانگیری ڕێگاکانی پەیوەندی کردن زور ئاسان بووە و تیچوونێکی کەمیشی دەوێت. هاتنە ناوەوەی ئامێرە تەکنەلۆجییەکان بۆ ناو کۆمەڵگەی کوردی کاریگەری لەسەر کۆی لاییەنەکانی ژیان هەبووە. تەکنەلۆجیا هۆکارێکی کاریگەرە بۆلێکجیابوونەوەو تەلاق و هەڵوەشاندنەوەی خێزان, چونکە هەرتاکێک پێویستە هێندە ڕۆشنبیر بێت لەچونیەتی بە کارهێنانی مۆبایل و ئینتەرنێت و تویتەرو فیسبووک و ئیمیل و تەکنەلۆجییا بەجۆرێک کەکاریگەری خراپی نەبێت بۆ سەر تاکەکانی کۆمەڵگاو دەرووبەری, لەم ڕۆژگارەدا ئینتەرنێت بەگشتی و تۆرە کۆمەڵایەتییەکان زیاتربوونەتە جێی سەرەنجی کەسانی دەست تێوەردەر. ئێستاش خێزانەکان لەبەردەم مەترسیەکانی شۆرشی ئامیرو تەکنەلوجییان زۆرجار کارەساتی ناخۆشی وەک کوشتن و لێدان و خۆسوتاندن و تەلاق و لێکجیابوونەوەی لێدەکەوێتەوە.

## ٥- هۆکاری کۆمەڵایەتی:

غاندی دەڵێت: ( ئەو کەسەی ئەندێشەی ناتوندو تیژی لەخۆی ڕواندوە هەموو جیهان بۆئەو خێزانێکە, نە لەکەس دەترسێت و نەکەس لێی دەترسێت).ئەنجامدانی هەڵەیەک تەنها یەک چرکەی دەوێت, بەڵام هەوڵدان بۆ لەبیرکردنی هەموو ژیانتی پێویستە, ترس کاریگەری لەسەر ژیانتان دەبێت, ڕێگا مەدەن هیچ شتێک ڕێگا لەو دروشانەوەیە بگرێت کە لەناختاندایە, سەرکێشی بکەن تاوەکو ئەوشکۆییەی هەتانە لەهەژماری چرکەکانی ژیانتان دەربکەوێت. بەڵام خۆتان ئەتوانن

بڕیار بدەن کەچەندە. تۆ دەتوانیت هەموو تەمەنت بە پێشبینیە ناخۆشەکانەوە بەسەر بەریت و هەمیشە خەمی ڕێگاکانی داهاتووت بێت, ئەوبڕیارەی ئێستا دەیدەیت بنچینەی ترسە یان خۆشەویستیە؟هەندێک لەئێمە ترسی ژیان دەکەینە شتێکی ڕاستەقینە لە سەر ڕیگاکانی ژیانمان, متمانەت بە خۆت هەبێت و بڕوا بوون لە ناخدا دروستبکە بۆ گەیشتن بە خەون و ئاوات.وانە لەژیاندا وەربگرە, وانە لە شکست وەربگرە, وانە لە هەڵەکانی بەرامبەر وەربگرە تادەگەیتە لووتکەی سەرکەوتنی کاروانی ژیانت, سەرکەوتوو دەبیت لەو ئیشەی کە حەزت لێیەتی, نیگایەکی بکوژانەت هەبێت بۆ خەونەکانت, خۆشەویستیەکی پرنازدارانەی خۆشەویستی خوشەویستیت بۆ کارەکەت هەبێت, پێچەوانەکەشی هەر ڕاستە. چۆن تۆ دەتوانی خزمەتی جیهان بکەیت, ئەوەی لە جیهاندا پێویستە لە لێهاتووی و پرۆفێشناڵی تۆدا هەیە بەڵام دەبێت بیدۆزیتەوە کاتت بە فیرۆ نەدەیت و بە وورياييەوە مامەڵەی لەگەڵ بکەیت. لە ڕێگای ئەزموونەوە تۆ دەتوانی کاریگەریت هەبێت لەم جیهانەدا. تاکەکەسێک کە گرنکیت پێدەدات هەر خۆتی, چونکە خۆت لیپرسراوی لەسەر ژیانی خۆت. پێویستە کردار بکەیت تاوەکو ببیت بە نموونە لەم جیهانەدا..بە پێی دواهەمین ڕاگەیاندنی داتاییەک لەئەنجومەنی دادوەری هەرێمی کوردستان ڕێژەی تەڵاق و جیابوونە لە سلیمانی ٪٣١, لە هەولێر ٪٢٨, لەگەرمیان ٪٢٨ بووە.

دەستێوەردان لەنێوان خێزانەکانەوە گواستراوەتەوە بۆ نێو قوتابخانە و زانکۆ و دادگاو سیماییەکی ناشیرین و کاریگەری تەواوی هەیە لەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و ڕێگرێکی تەواو دەکات لەجێبەجێکردنی یاسا. لە گەڵ پێشکەوتنەکانی جیهان و تەکنەلۆجیا ئەم دیاردەییە زەقتر لەنێوکۆمەڵگەدا هەستی پێکراوە, بۆیە دەبێت زۆر بەخێرایی بەرەنگاری ئەم دیاردەییە ببینەوە چونکە دەستەبەرکردنی ماف ودوورکەوتنە لەدەستێوەردان زیاتر دەبێتە هۆکاری ئاشتی و خوشبەختی و گەشەسەندنی کۆمەڵگاو ئاسوودەیی بۆ خێزانەکان دەستەبەر دەکات,بەپێچەوانەوە دەبنە هۆی هەڵوەشانەوەی خێزان کەبنەمای دروستبوونی کۆمەڵگەیە, هەروەها دەبێتە هۆی ناسەقامگیری و نائارامی و لێکجیابونەوە و تەڵاقی لێدەکەوێتەوە وکۆمەڵگا لەبوونەوە بەرەوە هەڵوەشانەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دەبات, کە چارەسەرکردنی ئەستەم دەبێت لەنێو خێزان و لەبەردەم دادگا, لەلایەکی ترەوە نەوەیەک پێدەگەیەنێت کەنەتوانێت وەک پێویست بەشدار بێت لەبڕیاردان و پارێزگاریکردن و پێشخستنی کۆمەڵگەدا. خوای گەورە لە قورئانی پیروزدا لە سورەتی (النساء) دەفەرموێ **(وَلاَ تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ اللّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُواْ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ وَاسْأَلُواْ اللّهَ مِن فَضْلِهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا) (١٦).**

## ٦-لاساری:

لاساری بریتیە لەخۆبەگەورە زانینی یەکێک لەهاوسەرەکان لەسەر ئەوی تریان یان سەرپێچی

کردنی ژنە بۆ مێردەکەی. خۆبەگەورە زانین بەشێوەیەکی گشتی لەهەرکەسێکەوە بێت کارێکی نەخوازرەوە دەرئەنجامی خراپی لێدەکەوێتەوە بەتایبەت ئەگەر لەلایەن یەکێک لەهاوسەرەکانەوە بێت بەرامبەر ئەوی ترو بێڕێزیکردنە بەرامبەر هەموو بەها پیرۆزییەکانی پرۆسەی هاوسەرگیری ودوورە لەهەموو ئەو ڕێزو خۆشەویستیەی پێویستە لەنێوان هەردوولادا هەبن بۆ دروستکردنی ژیانێکی ئاسوودە لەسەر بنچینەی خۆشەویستی و یەکسانی و ڕێزگرتن.

## ٧-خیانەتی زەوجی:

بریتیە لە ئەنجامدانی هەر ڕەفتارێکی جنسی حەرامکراو یان قەدەغە کراولە لایەن یەکێک لەهاوسەرەکانەوە لەگەڵ کەسێکی بێگانە, کە زیانبگەیەنێتە لەهاوسەرکەی خۆی.لەئەمڕۆدا هۆکارەکانی پەیوەندیکردن وەک (فیسبوک, ئینستاگرام و تیک تۆک...هتد) ڕۆڵیان هەبووە لەجیابوونەوە و تەڵاقدان, بەڵام ئەمە تەنها هۆکار نیین بۆ تەڵاق و لێکجیابوونەوەی هاوسەرەکان, دەتوانین بڵێین ئەم هۆکارانە ڕوودەدەن لەئەنجامی نەبوونی سەرچاوەی دارای وماڵێکی گونجاو نەگوونجاندی ژن و مێرد پێکەوە و ڕێزنەگرتنی یەکترو جیاوازی تەمەن. ....خوایگەورە لە سورەتی (النساء) دەفەرموێ (**وَاللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِن نِّسَائِكُمْ فَاسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِّنكُمْ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّىَ يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً (١٥) وَاللَّذَانَ يَأْتِيَانِهَا مِنكُمْ فَآذُوهُمَا فَإِن تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُواْ عَنْهُمَا إِنَّ اللّهَ كَانَ تَوَّابًا رَّحِيمًا(١٦)**

## ٨-داماڵراو لەسۆز:

مەدام دۆستاڵ دەڵێت: ( خۆشەویستی تەنها یەک بەشە لە ژیانی پیاودا, بەڵام مێژووی ئافرەتە بە درێژایی تەمەنی). ئافرەت بەسروشت هەردەم بیری لای پیاوێکە کەڕۆژێک بێت لەکۆشی خۆشەویستیدا جێگای بۆبکاتەوە و بەرنامەی ژیانیان دابڕێژن و پرنسیپەکانی ژیانی هاوسەری لەسەر هەڵبچنن و باخی خۆشەویستیان بەگوڵ وگوڵزار برازێننەوە, بەڵام تووشی شۆک و ڕاچەڵەکین دەبێت کاتێک دەزانێت پیاوەکە بەتاڵە لەسۆزو ڕۆمانسیەت.

ماناى ئەوە نیە پیاو دەست لەکاروباری ژیان هەڵبگرێت و کاری نەبێت تەنها پیاهەڵدان ولاوانەوەی هاوسەرکەی نەبێت, بەڵکو ئافرەت هەست بکات کەلای پیاوێکی بەنرخەو لەمانای خوشەویستی و روحی هاوبەش و ئاسودەی ژیان تێدەگات و شوێنێکی گونجاو چەترێکی ئارام لەدڵی پیاوەکەیدا هەیە تاوەکو ممارەسەری کاری ژیانی هاوسەری و خوشەویستی و گەشبینی بەژیانی داهاتووی خۆی بەدانایی پێشانی مێردەکەی بدات تادەگاتە ئەوپەری کەناری ئارامی, بەپیچەوانەوە لەگەڵ بیرو بۆچوونی خۆیدا دێتە گۆ گلەییەک لەچارەنووسی نادیاریخۆی دەکات و تاوەکو دەگاتە ئەو

ڕاستییەی ژیان هیچ مانایەکی نەبوو و خاڵی بوە لە پەیوەندی خۆشەویستی و یەکسانی.

## ٨-کەسایەتی لاواز:

کاتێک ئافرەت هەست دەکات ئەو بووەتە پیاوی ماڵ و بڕیار بەدەست پیاوەکەی تەنها بووکەڵەیەکە, چۆن بیەوێت ئاراستەی دەکات بێئەوەی بەڵی یان نەخێرێکی هەبێت, بەڵام هەرزوو بیری دەکەوێتەوە کەپیاو مانای هێز و پشتیوانییەو ئافرەت هەرچەندە بەهێز بێت دواجار پێویستی بەپیاوێکی بەهێزترە کەپشتی بگرێت لەبڕیارەکانی و هێزو توانای ژیانی پێبخەشێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو تەحدییانەی ژیان و ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو هەموو کۆسپ و تەگەرانەی دێنە سەر ڕێگاکانی گەیشتن بەخەون و ئاواتەکانی. لەلایەکی ترەوە کاتێک ئافرەت دەبینێت پیاو بڕیاری خێرا دەدات لەشتە چارەنووسسازەکانی ژیانی هاوسەرگیرییان بێئەوەی پرس و ڕایی هاوسەرکەی وەربگرێت لەوانە چەن جارێک ئارام بگرێت ڕێگا بەو کارەبدات, دواجر ئافرەت داوا دەکات سنوورێک بۆ ئەو قومارکردنە بەداهاتووی خۆی و خانەوادەکەی دابنێت.

## سەرچاوەکان:

١-تەڵاق و لێکجیابوونەوە,سەرباز سیامند,چاپی یەکەم, ٢٠١٨,لاپەرە ٧٥-٨٠.

٢-کۆمەڵەیاساکانی باری کەسیتیو بەرەنگار بوونەوەی توندو تیژی خێزانی, عزالدین عبدالله یاسین,چاپی یەکەم,٢٠١١و لاپەری ٣٥-٣٦.

٣-ئافرەت و یاسا, عزالدین عبدالله یاسین, چاپی چوارەمو٢٠١٢, لاپەرە ٣٠-٣٥.

٤-دیاردەی خۆسووتاندنی ژنان لەدیدی مافی ئافرەتەوە,نووسینی لیکۆڵینەوەی چەلەنگ ڕەشاد یەحیا,ژمارە ٢٥, کوردستان-هەولێر, ٢٠٠٩, لاپەرە ٣٥-٣٧.

World health organization, Violence against women,https://apps.who.int/iris/bitstream/.-٥ eng.pdf_١٤,١١_WHO_RHR/١١٢٣٢٥/١٠٦٦٥/handle.

pdf.http://hdr.undp.org/sites/default/files/kabeer_hdr١٤-٦.

pdf.http://hdr.undp.org/sites/default/files/kabeer_hdr١٤-٧.

violence-against-women-/٢٠١٨/https://www.undp.org/content/undp/en/home/blog-٨ cause-consequence-inequality.html.

https://www.un.org/en/un-chronicle/ending-violence-against-women-and-girls--٩ progress-and-remaining-challenges.

/https://www.fokuskvinner.no/aktuelt/saker/what-causes-violence-against-women-١٠.

# تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و کاریگەرییەکانی

اسماعیل محمد قادر



زانست یا ڕۆچوون لە زانست , بەپێی چەند پێوەرو لایەنێک دەبێ بۆ ئەوە بگەی بە ئامانج لە ژیانی ئاسا یدا , وەدەبێ هەرنەتەوەیەک یان کۆمەڵگەو هۆزو تاکە کەسێکیش بێ , ئامادەکاری و پلانی گونجاوی هەبێ چۆن بگەی وە چۆن فێربێ پاشان بەکاری بهێنێ ئەوکاتە کاری پێ بکەی , ژیان لە چرکە ساتی یەکەم بە ژان دەست پێ دەکات و وە بە ژانیش کۆتا دێ , ئەی لەم نێوەندەدا چی دەگوزەرێ ؟ سەرکەوتن ڕاچەڵەکان تۆقین ئازار نەهامەتی ماڵ وێرانی , پاشان کەمێک ئاسودەیی و ئارامی و هێوەربوونەوە , لەلایەکی ترەوە مرۆڤیش بە دەستی حەز و ئارەزووی خۆیەوەڕادەمێنێ بێ زانیاری و تێفکرین زۆرجار ئەیەوێ پیادەی دین و ژیان پێکەوە بکات . خـودای مەزنیش دەفەرمێ ( إِنَّالنفْسَ اَمّارَةُ بِالسُّوءِ إلا مَا رَحِمَ رَبّی ) واتە نەفس و دەرون هەمیشە فەرمان بە خراپە دەکەن مەگەر کەسێ خـودای مەزن خۆی ڕەحمی پێ بکات .. لێرەوە مەبەستمە بچمە سەر ناوەڕۆکی بابەتەکەم کە تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان لە نێو کۆمەڵگەی کوردیدا هێندە نەرێنی کەوتووە . کەمتر لێی سـودمەند بـووین .

## زیـانەکانی تـۆڕە کۆمـەڵایـەتیـەکـان

لەسەرەتای هاتنە کاییەی دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە کۆمەڵێک لایەنی باش و خراپی هەبـوون , ئەو ڕووە خراپەی کە ڕۆژانە ڕەنگ دەداتەوە لە نێو کۆمەڵگەدا گەیشتووەتە ئاستێکی مەترسیدار , کاریگەری خراپی لەسەر هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگای کوردی بووە , کەلتوری زۆربەی نەتەوەکانی هەڵوەشاندوە وە ژیان بەرەو گۆشەگیری دەبات وە چێژی زۆربەی زۆری ڕۆحە زیندووەکان بەرەو مردن دەبات , پاشان مرۆڤ بەشێوازێ ئاڵوودە دەکات کە هزری ڕادەکێشێ بەرەو ئایدیایەکی جیأوازی سەر بە ئەو بەرنامەیەی کە هەر کەناڵێ دەیەوی بۆ خۆی پەلکێش بکات, چونکە دەزانین هەرچی دەزگای لۆکالیێ و دەرەکی هـەن خەلکانی پسپۆڕ و شارەزای لەپشتەوەن کار بۆ ئەوە دەکەن کە بیرو هزری مرۆڤەکان بە خواستی خۆیان ئاراستە بکەن . لێردا دەتوانین بەچەند هەنگاوێک زیانەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان بخەیـنەڕوو.

کـات بە فیرۆدان

کات ئەوەندە پڕ بایەخە لە ژیانی مرۆڤدا خودای مەزن سوێندی بەسەر دەخوا لە قورئانی پیرۆزدا لە سورەتی الـعصر دەفەرمێ ( **الْعَصْرِإِنَّ الْإِنْسَانَ فِى خُسْرٍ)** واتە سوێند بەکات. چونکە کات بۆ مرۆڤە زیرەک و وریاکان مایەیی بەختیاری و سەرفرازیان بووە , هەوڵیان تیاداوە بۆ ئازادی و سەربەستی خۆیان, هیچ پشوویان تیانەداوە , بەڵام بۆ گەلانی تەمەڵ و نەزان بـووەتە ما یەی ژێر دەستەیی.

سەرورمان پێغەمبەر ( د.خ) دەفەرمێ ) یسئل عن عمره فیما اپناه (واتا پرسیارت لیدەکرێت دەربارەی کات و تەمەنت لە پێناوی چێدا بەسەرت برد؟ پاشان ووتەی داناو زاناکانیشی لەسەرە وەک (ئیمامی شافعی ) لە وتەیەکیدا دەربارەی کات دەفەرموێ: ئەگەر بوایە خودای مەزن تەنها ئەم سورەتەی دابەزاندایە بەس بوو بۆ ئەوەی لێپرسینەوەی بەندەکانی لەسەر بکات , چونکە کات کلیلی یان سەرچاوەی بەدەستهێنانی سەرکەوتنی هەموو بوارەکانی ژیانە.دەگوترێ هەموو شتێک لە ژیاندا هەتا زیاد بکات زیاد دەکات, بەڵام کات و تەمەن تا زیاد بکات کەم دەکات . بۆیە دەڵێن ( کاتنەیبری دەتبرێت ). کاتێک لە گەنجێدەپرسی تەمەنت چەندە؟ بێ دوودڵی ژمارەیەکت پێ دەڵێ. هەمان پرسیار ڕووبەڕووی هەڵچوویەک لە تەمەنداریێ بکەرەوەپاش مل خوراندنێ و تەمی خەمێ لە سیمایدا دێتە گۆ : هەرچەندە لە ناسنامەکەمدا ٥٠ ساڵم , ڕاستێکەی چەند ساڵێک کەمترم ..بە زانایەکیان گووت یـەک چرکە

بـوەستە با قسـەت لەگەڵ بکەین  ووتی: خۆرم بۆ ڕاگرن با من قسەتان بـۆ بکەم .

## ڕێکخستنی کـات..

ئەگەر لە مرۆڤێکی  ژیر بپرسیت شەوو ڕۆژێک ببێتە ( ٢٥) کاتژمێر بەرنامەت چییە ؟ دەڵێ: بەشێوازێ دەیقۆزمەوە کاتی خوێندنەوەم زیاد دەکەم,  ئەو کارانە بە ئەنجام دەگەیەنم کە ئێستا لەبەردەستن, بەڵام بۆ مرۆڤی تەمەڵ و کەمتەرخەم لە ژیان ببێتە ( ٢٦) کاتژمێر هێشتا بەشی دەست بەتاڵی ناکات . وە ئەگەر ببێتە (٢٣) کاتژمێر بۆ مرۆڤی ژیر دووبارە بڵێ بەرنامەت چی یە ؟ لە وەڵامدا دەڵێ بۆ ئەوەی کاری خۆم ڕێک خەمەوە , کاتی دانیشتن بەدیار تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان و کاتژمێرێ خەویش کەم دەکەمەوە. ئەو کات ژیان دەچێتەوە سەر ڕێچکەی ئاسایی خۆی ..

## تـۆڕە کـۆمەڵایەتیەکان و کێشەی کۆمەڵایـەتی

ئەوەی ئەمەوێ باسی بکەم زۆرێکمان دەیزانین  وە زۆربەمان کارەکتەری سەرەکین لە کۆمەڵگەی خۆمان هەمووومان ڕۆژانە گلەیی و گازندەی زۆر دەکەین بە دەست مەینەتی ژیانەوە, هەندێ لە تاکە دیارەکانی نێو کۆمەڵگەبەشداری کێشەی بەرامبەر دەکات قسەشی هەیە و هەندێ جار چارەسەری بەدەستە ,باس لە دیــن و  لێبوردەیی...هتد  دەکات دەیان نمونەی زیندووی بەپێز دێنێتەوە . بەڵام  کاتێک لە ژیانی تایبەتی خێزانیی ورد دەبیتەوە کێشەی زۆر کەڵەکەبوو هەن کە توانای چارەسەریان نیە ,ئەمە لەسەر ئاستی خێزان, بەڵام تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان کێشەی گەورەی دروست کردووە لە نێو  تاکەکانی کۆمەڵگەدا, لەوەتەی ئەم ئامرازانە(هۆیەکانی پەیوەندی کردن) زیادی کردووە هێندەش کێشەو گیروگرفتە کۆمەڵایەتیەکان زیادیان کردووە, ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕووداوی نەشیاو بەرگوێ دەکەون , ئەوانەی کە ڕوودەدەن کارەساتی زۆر مەترسیدارن , منداڵی (١٥) ساڵ خوشکی خۆی بکوژێ , منداڵ دایک و باوکی خۆی بکوژێ لەکاتێکدا خودای مەزن دەفەرموێ (فلا تقول لهما أوف ) واتە تەنانەت ئۆفیش مەکەن بەرامبەر دایک و باوکتان چ جای ئەوەی بیانکوژیت . خاڵۆ خۆشکەزای خۆی مارە بکات ! کچ خۆی هەڵبواسێت , لەمانە سەیرتر دادوەر , پارێزەر , شاعیر , پزیشک , خۆی بخنکێنێ یان خۆی بکوژێت . یان پیاو خێزان و ماڵ منداڵی خۆی گوولە باران بکات پاشان خۆیشی بکوژێت , ئەمانە حاڵەتی ناوازەن کە لە هیچ ئاین و ئاین

زایەکدا جێگای نابێتەوە ,بەداخەوە لە کۆمەڵگەی ئێمە لە حاڵەتەوە بووە بە دیاردە , ئەمەیە لە قصورەوە بۆ  قبور ,پاشان تەماشای ئەو هەموو خیانەتە بکەن لە نێوان ژن و مێردا , بەڵام بەراورد لەگەڵ ساڵانی ڕابردوو , هەرچەندە کێشەی کۆمەڵایەتی هەبوون , بەڵام هاوسەرێک خیانەتی ژن و مێردایەتی بکردایە سەری خۆی هەڵدەگرت وڵاتی خۆی بەجێدەهێڵا, ئێستا هەندێ لە ڕێکخراوەکان بە شێوەیەکی لاواز چارەسەری هەندێ لە کێشەکان دەکەن جاری واش هەیە دەبنە پەناگەیەک بۆ کەسی تۆمەتبار, دەبێ بەهەموومانەوە کار بۆ چارەسەری ڕیشەیی و گونجاو بکەین .

## ڕۆڵی دایک و باوک لە بوونیادی کەسایەتی منداڵدا:

لەو دەلاقەیەوە کە دەوترێت منداڵ وەکو هەویرێکە بەدەستەوە هەرچییەکت بوویوێت لێدروستدەکەیت:

وا پیویست دەکات دایکان و باوکان بە پێی قۆناغی تەمەنی منداڵەکانیان ئەو گۆڤارو نامیلکانەیان بۆ بکڕن کە لە کاییەی منداڵەوە نزیکەو دەبنە هۆی بوونیادی کەسایەتیەکی سەرکەوتوو بۆمنداڵ خۆ ناشکرێت منداڵەکان لە یارییە ئەلیکترۆنیەکانی ئەمڕۆ بەتەواوی خاڵ بکەیت چونکە کاریگەری دەر وواسیەکانیان لەسەرە بەکورتی مەبەستمە بڵێم حەزێک لای منداڵ دروست بکەیت دوو هێندەی یارییە ئەلیکترونییەکان پەلکێشی دنیایی خوێندنەوەی گۆڤارو ئەو نامیلکانە بکەیت کە تایبەتە بە دونیای منداڵ و خاک و ئاو نیشتیمان و مرۆڤایەتی لا دروست دەکات,بە پێچەوانەوە نەوەکانمان کەسایەتێکی تێکشاو ئایندەییەکی نەشیاو چاوەڕییان دەکات. مەترسی گەورەی ئینتەرنێت ئاڵوودەبوونی  مرۆڤەکان ئەمانەی لێکەوتووەتەوە: بۆنموونە لە وڵاتێکی وەک بەریتانیا بەپێی تازەترین توێژینەوە دەرکەوتووە لە پێنج کەس دووکەس کاتێکی ئێجگار زۆر بە ئینتەرنێتەوە دەکوژن ناتوانن واز لەو خووە بهێنن ,هەروەها لە پێنج کەس کەسێ بەیانیان لەکاتی خەو هەستان و شەوان لەکاتی خەوتندا لەسەر ئینتەرنێتن ,لە کۆی (١٠) کەسیش (٩)کەس گەڕانیان لە ئینتەرنێت پێ باشترە وەک لە خوێندنەوەی کتێب ئەمەیە کارەساتی خراپ بەکارهێنانی تۆرە کۆمەڵاییەتییەکان.

مەترسی ئەم سەرچاوەیە ئەوەیە کە زۆر دەبیستین  و کەم تێدەگەین, یەکێک لە باوترین (١٢) پرسیارەکان کەلە گۆگڵ دەکرێت چ لە ژیانم بکەم ؟ گۆگڵ نازانێت بەڵام لەهەمان کاتیشدا ئەو گفتوگۆیانەت دەپچڕێنێت کەلەگەڵ خۆتدا دەیکەیت, تەنها خۆتیت کە دەزانیت چ لە ژیانت بکەیت , ئەوەش ئەمە دەگەیەنێت کەژیانی تایبەتیت لەژێر چاودێری و هەڕەشە دایە, هەزاران فایلی کودکی ناو هاردی دیسکەکەت دەزانن بۆ کوێ دەڕۆیت , مبایلەکانمان هەموو

پێنج چرکە جارێک داتا لە بارەی جمووجوڵەکانمانەوە داخل دەکەن تەنانەت ئەو کاتانەش بە ڕواڵەت کوژاونەتەوە, بـۆنموونە لە (٧٠٪ ) خەمی ئەو پۆستانەمانە کەتا ئیستا سەیرمان کردوون .

زانایان ووتوویانە هەر گەلێک دەستی لە ئەفراندنی زانستێکدا نەبێت پێدەچێت لە بەکارهێنانیدا زیانی گەورە بکات ئێمەی کورد بەتایبەتی و گەل و نەتەوە تازە پێگەیشتووەکان لە دونیای عەولەمەو بەتایبەت بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا لە بری خۆشگوزەرانی و هەستانەوە زیانی گەورەیان کردووە بەتایبەت لە بوواری کۆمەڵایەتی و سایسی و فەرهەنگی و پەروەردەیدا.ساڵی ( ١٩٩٠)لە ئەمریکا (٧) هەزار وێنەی پۆرنۆگرافی منداڵ دزەیان کردۆتە ناو ئینتەرنێت ,کەچی ساڵی (٢٠١٤) لە ئەمریکا (٤٢) ملیۆن وێنە تەنها لەسەر یەک سێرڤەر دۆزراوەتەوە.حکوومەتی بریتانیا دەڵێ نزیکەی(٥٠) هەزار کەس دەستیان لە دابەزاندن و شەیرکرنی وێنەی دەست درێژی کردنە سەر منداڵ هەیە بە پێی تازەترین لێکۆڵینەوە لە (٦٩٪) گەنجانی بریتانیا توشی گێچەڵی ئینتەرنێت هاتوون , تەکنەلۆجیا نوێیەکان هەمیشە دوودڵی لەگەڵ خۆیان دەهێنن , ئەوکات کێشەی دەروونی دروست دەبێ ,لە ڕاستیدا ئەم ئامرازە وا لە مرۆڤ دەکات ببێتە بیسەری هەموو شتێک هیچیش فێر نەبێت , ئەم تەکنەلۆژیاییە کۆمەڵێ ئاڵنگاری دەخاتە بەردەمت کە توانای ڕووبەڕووبونەوەیانت نەبێت .بۆ نـموونە ئینتەرنێت بووەتە هۆی لاوازی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان , وەناتوانیت ڕەخنەگرانە بیر بکەیتەوە , , واشت لێدەکات کە بێبەرهەم بیت,دووبارە پەیوەندی لەگەڵ دونیا و سروشتدا دروست بکەینەوە لە جیاتی چات کردن لەسەر ئەم ئامرازە ڕووبەڕوو قسەلەگەڵ یەکتر بکەین ,دەبێت ئەوە قبوڵ بکەین کەنابێت لەمەو دوا بهێڵین ئینتەرنێت بێ چاودێری لە ژووری خەوتنی منداڵانی تەمەن (١٥) ساڵ هەبێ ئەمەش لەبەر مەترسی ئەم سەرچاوە کووشندەیە .

## ســوودەکانــی تـۆڕە کـۆمەڵایـەتـیەکان:

١- هۆکارێکە بۆ ئاشنا کردنی نەتەوەو ئایدیا و بیرو باوەڕو کەلتوورە جیاوازەکانی گەلان.

٢- زۆرێک لە وڵاتانی دەرەوە بەشێوازی خراپ لە داب و نەریتی نەتەوەی کورد گەیشتوون , بۆیە لە ڕێگەی نوسینی شیعرو بڵاوکردنەوەی ووتارلە پێگە جیاوازەکاندا وە دەرخستنی کەسانی سیاسی و ڕۆشنبیرو شاعیر و نووسەرەکانمان دەرخەین بۆ هەموو دوونیا .

٣- لە ڕێی ئەم تۆڕانەوە دەتوانین ڕایەڵەیەک لە نێوان دامەزراوە زانستیەکانی جیهاندا دروست بکەین, کە هۆکارێکی گرنگە بۆ ئاڵو گۆڕکردنی بوارە زانستییەکان.

٤-سەرجەم دام و دەزگای حکوومی و ناحکومی دەتوانن بەکاری بهێنن بۆ ڕاییکردنی

کاروباری هاوڵاتیان .
٥- دوورترین ڕێگا یان زۆرترین ماوە بە تەواوی کورت دەکاتەوە.
٦- هەندێک لە ئەندامی خێزانمان لە دەرەوەن بۆ ئاشنابوون بە یەکتری دەتوانن سوود لەم سەرچاوەیە وەرگرن .
٧- هۆکارە بۆ ئاسانکردن و پێشخستنی کاروباری بازرگانی .
٨- هۆکارێکە بۆ کاروباری تەندروستی , گەشت و گوزار, خێرخوازی ...هتد.
١٠- بەهۆی ئەم زانستەوە دەزگاکانی ئاسایش تا ئاستێکی باش توانیوویانە چاودێری جموو جۆڵەکانی کۆمەڵگا بکەن و تاوانەکان کەم بکەنەوە.هەواڵەکان بە خێرایی دەگەن و هاوڵاتیانی ناڕازی دەتوانن بەرهەڵستکاری ڕژێمە ستەمکارو توتالیتارییەکان ببنەوە.



# ئەو دەقەی سەرنجی ڕاکێشام

**کامەران گەردی**

بەدەم باوە بۆی قژت هات
کە زانیم بێ حیکمەت نییە!
لەوڕۆژەوەی پەنجەکانم
بوون بە شانەت
لام نەماون،
بزان لە ناو قژتا نییە..؟!
ئەگەر نەبوون
دەستێ بخە ناوسنگتەوە،
نەبا سێویان لە مشتا بێ!
ئەگەر وابوو
لێیان گەڕێ، نایانمەوێ ،
با لە باخت بمێننەوە..!

---

شیعری باخ
م: ئەحمەد محەمەد قادر

گرنگی بابەتی دەق:

یەکێک لەو ڕوداوانەی هەستی ڕاستەقینەی ئەڤینی دەوروژێنێ؛ پێگەیشتنی دوو ئەڤیندارە لە ژوانگەدا.
دوای ئەو دیدارە ڕاستەوخۆیە تێڕامانی ئەوان بۆ دنیابینییەکی جوانترو جیاوازتر دەگۆڕێت.
ئیتر ڕووبەڕووی جۆرێک لە هەژان دەبنەوە.
هەموو (ژیان) و (بوون) لە چوار
چێوەی عیشقدا چڕدەکەنەوە...

بژاردەی بابەتی ئەو تێکستە ڕووداوێکە لە ناخی کاراکتەرەوە بە شاراوەیی ماوەتەوە..
یەکێک لە بکەرەکانی دوای ڕوودانەکە لە ڕێگەی هەڵکردنی (با)وە یادەوەریەکانی ئەوێ لە یادگەی دەوروژێتەوە..

شاعیر لە زمانی ئەو کاراکتەرەوە جوڵە هەستیارەکانی ئەوێی کردووە بە کەرەسەی دەقێکی زیندوو؛ بەڕوون و ڕەوانیش تۆماری کردوون،
بەمەش وێنایەکی باڵای شیعریی خوڵقاندووە..!
ئەم شیعرەی مامۆستا ئەحمەد، دەربڕی زمانی ناخەو ئاوێنەیەکی ڕوونە نەخش و نیگاری تابلۆیەکی ئەڤینی زووم دەکات، کە لە بەر چاوی بکەرەکانی لیلاوێکی لە سەر نیشتووە..!
درک پێکردنی وجودی (شیعرییەت) لە دەقێکی بارگاویکراو بە ماناگەلێکی قووڵەوە خوێنەری زیندووی گەرەکە، دۆزینەوەو ئەفراندنی دیمەنێکی جولاو لە ناو بێدەنگی پەیڤگەلێکەوە چاوی خەیاڵی منی وەرگر ڕۆڵی بینەری وێنەدانەوەی ناوەوەی دەق دەگێڕێ بەدیار درامایەکی کورتبڕەوە.. دەق-ی ئەمریش هەڵگری ئەو خاسیەتەیە گوزارشتی باڵا بەرهەمدێنێ..
شۆڕبوونەوە بە ناواخنی (شیعری هەڵبژاردە) کە وەک ئاوێنەیەکی کۆبین خۆی دەنوێنێ، ئەرکە شەن و کەو بکرێن و فۆکس بخرێتە سەر بەهای مانا شاراوەکانی..
بۆیە لە ئەنجامی شیتەڵکاری دا ئەو ئاوێنە گەورەیە دەشکێت؛ ئیتر ڕووگەی ناوەوەی خەون و خۆزگەی یەکڕەنگی ئەوانیتریش ڕوونتر نیشان دەدات..
ئینجا تیشکەکانی بەجۆرێک پەرش دەبنەوە.. دەبنە فریاد ڕەسێک بەر دیدەی لیڵی کورگەل و کچگەلی تریش ڕۆشن دەکەنەوە..
کە دیارە هەمووانیش پەروەردەی هەمان کولتوورو ڕاهاتووی هەمان ژینگەن...
ئەو ڕووداوانەی لە دەوورو بەرمان بە زیندوویی دەگوزەرێن، گوزارشتی هاوکۆک کە زمانی

پاراوی شیعر بینای دەکات، هۆکاری خاڵیکردنەوەی ئەو ناخە پەنگخواردووانەیە کە گیرۆدەی دەربڕینێکی باڵای ئەدەبین مەراقەکانیان بشکێنێ...
کاتێ خوێنەر خواستەکانی لە دیداری ئاوێنەی شیعرێکا هاوتا دەبینێ، وەڵامی پرسیارە خنکاوەکانی دەدۆزێتەوە..ئیدی هەناسەی ئۆخەی هەڵدەمژێ..!

{١}
## دەسپێکی دەق:

بایەک لە شوێنی یارەوە بەڕێوەیە؛ هەرچی بۆن و بەرامەی خۆش لە زەتی پرچە شێدارەکەی هەیە دەیپێچێتەوە.. گرنگ نیە لە کوێوە هەڵیکردووە، ئەوە گرنگە بەگەیشتنی (با) جا چ (شەماڵ) بێت یان (شنە) ئەمەیان پەیوەندی بە کات و شوێنەوە هەیە، گرنگ ئەوەیە لەو دەمەدا هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەمژێ و ناخی دەتەنێت؛ وەک شەڕابێکی خەستی ئەڤینی هەمدیس سەرمەستی دەکاتەوە..!
ئەوەی لە هەمووی گرنگترە ئەڤیندار سەرچاوەی هەڵکردنی (با) دەگێڕێتەوە بۆ ئاڕاستەی ماڵی یار..
چونکە هێشتا لەو ڕەوشەدایە پێکرانی دیدارەکەی ژوانی پێشوو هەست و سۆزی جێ نەهێشتووە..!
مانەوەی تام و بۆی عیشق لە نائامادەگی دولبەریشەوە لە نەستی ئەودا دەژییێتەوە؛
هەر بۆیە نەک هەستەکانی ئەو بۆنێکی ئاشنا دەناسنەوە..
بەڵکو چوواندنی (با) وەک تەتەرێکی (قاسید) سروشتی بە هێنانی بەرامەی زوڵفی یار دووبارە ئەوی ئەڤیندار دەپێکێتەوە..!

بۆیە شاعیر لە دەسپێکا دەنووسێت:

بەدەم باوە بۆی قژت هات
کە زانیم بێ حیکمەت نییە!
لەو ڕۆژەوەی پەنجەکانم
بوون بە شانەت
لام نەماون،

نائاگایی هەستێکی یەقینی لا دروست دەکات کە لە ژوانی پێشوودا پەنجەکانی لا نەماون؛ بۆیە وا هەست دەکات لە ناو پرچی ئەودا بەجێمابن..! هەر بۆیەشە پرسیار لە خۆشەویستەکەی دەکات، کاتێک دەڵێ:
(بزان لە ناو قژتا نیە)؟!

نائاگایی کاراکتەری دەق هێشتا بەردەوامە..تامەزرۆیی دیداری پێشوو هەستەکانی بەتەواوی گەمارۆ داوە..
کاتێ پەنجەکانی وەکو دانەی شانە قژی ئەوی پێ داهێناوە.،  دەشێ لە ژێر عاتیفەی وروژانێکی پاکژی ئەڤینیدا پێکگەیشتنی دوو ئەڤیندار بەنەرمی پەنجەکانیان یەکترییان گوشی بێت.
کاتێ مەعشووق (خۆشویستراو) قامکی نەرم و نیانی لە قەدی پەنجەکانی خۆشەویستەکەی دەئاڵێنێ، هەم کردەیەکی خۆڕسکانەیە هەم وەلامێکیشە بۆ هەستی وروژاوی دڵدارەکەی هەم هەوڵیشیداوە لەوێدا گۆشەگیری بکات؛ نەبادا سەر بکێشن بۆ شوێنێکی ترو بەرەو ژوورتر بخزێن...

{٢}

## خوێندنەوەی کۆتایی
## بابەتی دەق:

بەشی کۆتاو دووەمی تێکستەکەی شاعیر ئەم ڕووداوە ئەڤینیە بە هونەرێکی وردی زمانی شیعرەوە پرسیارێکی سادە دەخاتە ڕوو؛ هاوکات وەلامگەلێکی مەراقگیریش بەهەڵواسراوی بۆ خوێنەران بەجێدێڵێ...

سەرمەستبوونی عاشق پەنجەکانی سەر دەبزوێنن؛
دەشێ زەن بۆ ئەوەش ببرێت لە پەیوەندی نێوان خۆشەویستی هەردوو ڕەگەزدا چاوەکانی (کوڕ) پێشینیەکی وەک باخەوان لە گەڵ باخی سینەی ڕەگەزی بەرامبەر (کچ) هەبێت، ڕەنگە لەیادەوەری ئەودا چاوەکانی زۆر جار مورەیان لێکردبێت، هەروا مەراقگیری پەنجەکانی وەک

پۆلێک پەپوولەی خەیاڵی بەر لە نووستنی درەنگانی شەو بە نەهێنی سەفەریان بۆ ئەو دیوی باخچە تەلبەند کراوەکە کردبێت، چونکێ هەم لە هەڵکەوتەی جەستەیی ئەویتر جیا دەکرێتەوە هەم جوانی هەموو دنیای بەو ڕەگەزی ژن بەخشیوە.. کە بریتین لە جووتی مەمکەکان.
ئیتر لەم بارەدا ئەستەمە پەنجەکان لە تەنیا شوێنێک بحەجمێن و بحەوێنەوە..
بۆیە نەرم نەرم بەهێمنی دەخزن بۆ نێوانی درزە هەستیارەکەی باخی سینەی سێوان..!

وەک شاعیر لە دەسپێکی بەشی کۆتایی ڕوودانی ناو تێکستەکەی دەڵێ:

---

ئەگەر نەبوون
دەستێ بخە ناو سنگتەوە؛
نەبا سێویان لە مشتا بێ!
ئەگەر وابوو
لێیان گەڕێ، نایانمەوێ،
با لە باخت بمێننەوە!

---

شاعیر بەوردی و لێزانیەوە مامەڵە لە گەڵ هەستی ناڕاستەوخۆی بەجێمانی پەنجەکانی دەکات، کە ڕۆڵ و جوڵەیان لە ددانی شانەوە دەگۆڕێ بەهاوکاری ناو چنگ خڕدەبنەوە بۆ ئەوەی سێوەکان گەمارۆ بدەن و بیخەنە دوو مشتەوە..
بۆیە دواجار دەپرسێتەوە:

ئەگەر وابوو
لێیان گەڕێ؛ نایانمەوێ،
با لە باخت بمێننەوە..!!

---

کیژۆڵەیەکی شۆخ و شەنگ ساتەکانی بەشەرمەوە لە ژوانا دەگوزەرێنێ..؟
بۆیە هەوڵدەدات خۆشەویستە سەرمەستەکەی سنوور نەبەزێنێ..؛ گەرەکیەتی پەنجەکان هەر لەناو شەپۆلدانی پرچیدا بمێننەوە...
چونکە جوڵەی دەستەکان جار جار تاڵەکانی قژی بەسەر گۆناو ڕوخساری پەرش دەبنەوە ئەمەش ختوکەی دەدەن و مووچڕکەی شادی پێ دەبەخشێ..!

لەو حاڵەتەدا هەست دەکات لە بەرامبەر پاڵەوانی خەونەکانی نازدارترین شازادەی سەرزەمینە... بۆیە دەشێ وەک کاردانەوە دەستی خستبێتە ملی خۆشەویستەکەی هەروا پەنجەکانیشی لە پەنجەی ئەو ئاڵاندبێ.. ئەم کردەیەش هەم بۆ پاکژ مانەوەی پیرۆزی عیشقەکەیانە هەم وەڵامێکی خۆڕسکانەشە بۆ حەزێکی هاوبەشی سنوور بەندکراو؛ لە ساتەوەختی هەستیاری ژوانگەدا...

شاعیر لە زمانی کاراکتەری دەقەوە بۆ دوایین جار دەڵێت:
ئەو نایەوێ دەستە پڕەکانی دەست بەرداری مەمکەکانی بن.
وە ناشیهەوێت باخی سینە بترازێنن! ئەم سنوور نەبەزاندنە دوو لایەنە ماناگەلێکی جوان دەدەن بەدەستەوە..
شیعری ئەڤینی لە ژوانا دەگاتە ترۆپکی جوانی و گوزارشت لە قووڵایی هەست و سۆزی دوو لایەنەی ڕاستەوخۆ دەکات، هەرچەندە زمانی دەق ناڕاستەوخۆ لە چوارچێوەی تخووبی وێنای شیعری لە دنیای (ئیرۆتیک) نزیکدەبێتەوە..
ئەمەش ڕەنگدانەوەیەکی ڕاستەقینەی کولتووری کۆمەڵگای ئێمە نیشان دەدات...

لێرەوە شاعیر دوا سنوور بۆ دەستەکانی دادەنێت؛ نایەوێت دەقەکەی داخڵی نێو ئەدەبی (پۆرنۆگراف) (ئەدەبیاتی سێکس)ی ببێتەوە.
چوون غەریزەی سێکسی لە هەر حاڵەتێکدا هەم دەتوانی خۆی زاڵ بکات.. هەم چاوی کۆمەڵگاش زەق دەکاتەوە.. هەم بکوژی هەست و سۆزی گرمۆڵەبووی عیشقی مەزنیشە...
وێنەی عیشق لە ناو دڵی عاشقدا تەلارێکی شووشە بەندی بەسۆز هەڵچنراوە...
بە خۆخاڵیکردنەوە لە کردەی سێکسیدا بە سەر بکەرانیدا وردو خاش دەبێت؛
لە ئەنجامیشدا هەردووکیان دادەمرکێنەوە ئیدی عیشق لەم کاتەدا دەمرێ؛ مەودایەکی ئازار بەخشی دەوێت تا دووبارە تێهەڵدەچنەوە بەڵام لە ئەگەری ڕوودانی ئەو کردەیە هەنگاوەکان خاو دەبنەوە ئەستەمە بگەنەوە سەر ڕێڕەوی تەندروستی عیشقی پاکیزەوە..

(وەک چۆن لە مێژووی ئەدەبی کلاسیکدا لای شاعیرانی کلاسیکنووس وا باو بووە،
بە تێکەڵبوونی جەستەیی ئەویندارن عیشقەکەیان ناتوانێ ببێتە عیشقێکی مەزن)

بۆیە مامۆستا ئەحمەد لە دەقەکەیدا وەک پەیامێکی ئەدەبی ئەو ئاکارە جوانەی ئەمڕۆی کۆمەڵگەی پاراستووە؛ بەڵام پرسیارێکی گەورەشی بۆ هەمووان جێهێشتووە...



# کەلار، گرانترینی جیهان:- (خانوبەرە) بەنمونە....

مشير عارف علی

ئەڵبەتە تاسەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابردو,کەلار گوندێکی گەورەی دورەدەست بوە,دورەدەست بەومانایەی,نزیکترین شار(پارێزگا) لێیەوە,لەباشورەوە شاری بەعقوبە بەدوری(١٢٠)کم و لەباکورەوە شاری سلێمانی بەدوری(١٤٠)کم و هەروەها کەرکوکیش لەڕۆژئاوایەوە بوە بەدوری(١٦٠)کم.

ئەی کەواتە,ئەوهۆکارانە چیبون وایان لەم گوندە دورەدەستەکرد,لەماوەی تەنها(٤٠)ساڵدا,ژمارەونرخی خانوبەرەی بگاتە ئەوئاستەبەرزەی ئێستا ؟

بەپێی بەدواداچون و زانیاریەکانمان,تاساڵی ١٩٧٠ و بەقەزابونی کەلار,زۆربەی دانیشتوانی گوندی کەلاری کۆن وئەوچەندماڵەشی کە نیشتەجێی (بنگرد)تەنیشت قەڵای شێروانەبون,پێشبینی ئەوەیان نەکردوە ڕۆژێک لەڕۆژان ,کەلار ببێت بەشارێکی ئاواگەورەو نرخی زەوی و خانوبەرەی ئەوەندەبەرزبێتەوە,ببێتەمایەی تێڕامانی چاودێرانی ئابوری ومامەڵکارانی بازاڕی خانوبەرە لەکوردستان وجیهانیشدا.هەربۆیە,ئەم شارەی کەلەسەرپشتی گوندی کەلاری کۆن دروست بوە,دانیشتوانەکەی(خەڵکی کەلاری کۆن)بەوشوێنەی کەئێستا زەویەکەی گرانترینی جیهانە,وتویانە(قەزامێشولە). وەک دەڵێن مێشولەی زۆربوەو بەلایانەوە گونجاونەبوە بۆژیان.

هەربۆیە گوندی کەلاری کۆن و دانیشتوانی گردەگۆزینەو حەمەی کەریمیش,شوێنی

نیشتەجێ بونی خۆیانیان زۆرلەلا بەنرخترو پەسەندتربوە لەو بنگردەی ئەوسا. ڕۆژان دێت وڕۆژان دەڕوات,کەلار دەبێت بەقەزا.پاش چەند ساڵێک وبەدیاریکراوی دوەم قایمقامی قەزاکە(عبدالستار تاهرشریف ١٩٧٢-١٩٧٣),داوای لەدانیشتوانی کەلاری کۆن ودەوربەری کردوە, ڕوبکەنە ناوەندی قەزاکەو لەوێ نیشتەجێ بن,گوایا بەبۆچونی ئەو(قایمقام)ە, بنگردوشێروانە(ناوەندی قەزا),ئایندەیەکی باشی دەبێت.

بەڵام بەشێکی کەم لەوهاووڵاتیانە گرنگییان بەوداوایەی قایمقام داوە. بۆیە دەتوانین بڵێین,دابەشکردنی سەدان پارچە زەوی لەلایەن قایمقامیەت وشارەوانیەوە,لەنیوەی یەکەمی حەفتاکان و پاشان لەنیوەی یەکەمی هەشتاکاندا و هەروەها ڕاگوێزانی گوندە سنوریەکانی ئێران لەناوەڕاستی حەفتاکاندا,بەسەرەتاو هۆکاری بنەڕەتی گەشەی خانوبەرە دادەنرێت لەکەلاردا.

لەوڕۆژە بەدواوەوبەهۆی هەردو فاکتەری (پێگەی ستراتیجی قەزاکە،ڕوداوەسیاسی وسەربازیەکانی کوردستان),بەرەوپێشچون وگۆڕانکاری گەورەوخێرای بەسەر کەرتی خانوبەرەی ئەم شارەداهات .

بێگومان لەئێستادا,لای بەشێکی زۆر لەهاووڵاتیان جێگای سەرسوڕمانە,نرخی زەوی وخانوبەرەی ئەم شارە,گرانترین بێت لەسەرئاستی کوردستان وتەنانەت جیهانیش.هەربۆیە,باوەڕپێ هێنانی بابەتێکی لەوشێوەیە,تاڕادەیەک قورس وناواقعی دەبێت.

باوەڕپێ هێنانیشی قورستر دەبێت کاتێک,مرۆڤ شارۆچکەیەکی وەک کەلار,بەراورد دەکات بە شارەکانی(هەولێر،تاران,پاریس و لەندەن).ئیدی هێندەی تربابەتەکە دەتگەیەنێتە حاڵەتی مبالەغەو زیادەڕەوی.بەڵام بابەتەکە بەوشێوەیە نیە کەئێمەومانان بەخەیاڵماندا دێت ولێکدانەوەی بۆدەکەین.

بەڵکو بەشێوازی بەراوردکاری وهەندێ پێوەری تایبەت ئەنجامەکە دەرهێنراوە.لەنێویاندا (پێگەی شار,ژمارەی دانیشتوان,ڕوبەرەکەی,پێگەی کارگێڕی و هتد)و دواتر بەراوردکردنی بە هاوتاکانی.بۆنمونە/نرخی زەوی وخانوبەرە لەکەلار,ڕاستەوخۆ بەراوردنەکراوە بە نرخی زەوی لە(هەولێر،لەندەن ونیۆیۆرک),بەڵکو بەراوردکراوە بە قەزایەک لەهەولێر,کەلەهەمان هەرێمدان وپاشان هەرێمیش لەعێراقێکدایە بەوبارودۆخە ئابوری وسیاسی وئەمنیەوە,لێرەوەو بەلەبەرچاوگرتنی ئەوبارودۆخەو مێژوی دروست بونی شارەکە,ئەوکاتە بەراورد دەکرێت بەهەرشارێکی تری لەهەمان حەجم وئەندازەی خۆیدا.بەوشێوەیە ڕون بۆتەوە کە زەوی و خانوبەرەی کەلار,گرانترینی جیهانە.

نهێنیەکانی بەرزبونەوەی نرخی خانوبەرە لەکەلار..

بەبۆچونی بەندە,نرخی زەوی وخانوبەرە لەکەلاردا,بەسێ قۆناغ وبەچەندین هۆکاری جیاواز,گەیشتۆتە ئەم ئاستەی ئێستای:-

قۆناغی یەکەم/لەساڵی ١٩٧٠ دەست پێدەکات وتاساڵی ١٩٩١ دەخایەنێت..
دەتوانین ئەم قۆناغە,بەقۆناغی سەرەتا یاخود سروشتیی ناوزەدی بکەین.چونکە کاتێک یەکەیەکی کارگێڕی دروست (استحداپ) دەکرێت,بەسروشتی پێویستی بەفەرمانگەو دامودەزگای جیاوازهەیە,هەموو ئەوانەش بەدامەزراندنی کارمەندو فەرمانبەر لەپسپۆڕیە جیاوازەکان ئاوا دەکرێنەوە.هەروەها دروستکردنی بیناوپرۆژەی جیاوازی پێویستە.
لەبەرئەوە خەڵکانێکی زۆر لەناوچەکانی دەوروبەریەوە ڕویان لەم قەزایە کردو تێیدا نیشتەجێ بون.ئەمەش بوهۆی ئەوەی بازاڕی کاروکاسبی،تاڕادەیەک ببوژێتەوەو گەشەبکات.ئیتر وردەوردە,هەندێک لەدانیشتوانی گوندەکانی دەوروبەری کەلاریش,بەمەبەستی بەدەستهێنانی هەلی کارو دورکەوتنەوە لەگرژی وبەریەک کەوتنەکانی پێشمەرگەو سوپای عێراق,لەم شارەدییەدا نیشتەجێ بون.
هەموو ئەوهۆکاروفاکتەرانە بەسەریەکەوە,دۆخ وکەشێکیاخوڵقاندوە کە,خواست لەسەر شوێنی نیشتەجێ بون لەوشارۆچکەیەدا زیادبکات و نرخی زەوی وخانوبەرەش لەکەلاردا بەرزبێتەوەو کەلار لەڕیزبەندی (٢٠)ەوە لەسەرئاستی شارەکانی باکوری عێراق لەساڵی(١٩٧٧),بچێتە پێشەوە بۆ ڕیزبەندی (٦) لەساڵی (١٩٨٧),بەشێوەیەک کەلەوساڵەدا,تەنها قەزایەک کەلەپێشیەوەبوە, قەزای تەلەعفەربوە.ئەگەرلەڕوی مێژوییشەوە,کەلار بەراوردبکەین بە دونزیکترین قەزا لێیەوە کەقەزاکانی ،کفری لەڕۆژئاوایەوە و خانەقین لەباشوری ڕۆژهەڵاتیەوە,ئەوابۆمان ڕون دەبێتەوە کە,گەشەی کەرتی خانوبەرە لەم شارەدا,گەشەیەکی نائاساییەو
زۆربەخێرایی هەردو دراوسێکەی خۆی تێپەڕاندوە.بێگومان بەبەڵگەی ئەوەی کە,کەلار لەساڵی ١٩٧٠ بوە بەقەزا,لەکاتێکدا
هەردوشاری(کفری،خانەقین)،لەگەڵ دروستبونی حکومەتی عێراق لەساڵی (١٩٢١)ەوە,بون بەقەزا.

خشتەی ژمارە (١) نرخی زەوی لەقەزاکانی(کەلار،خانەقین،کفری)بەدۆلار، بۆساڵی ٢٠١٩.

| ز | قەزا | نرخی زەوی بازرگانی/ م٢ | نرخی زەوی نیشتەجی بون/ م٢ |
|---|---|---|---|
| ١ | کەلار | ١٦٠٠٠٠ | ١٠٠٠٠ |
| ٢ | خانەقین | ١٦٠٠ | ٣٠٠ |
| ٣ | کفری | ٧٥٠ | ١٥٠ |

ژمارەی یەکەکانی نیشتەجێ بون لەکەلار،ساڵی ١٩٧٧ تەنها (١٠٨٥) یەکەبوە,لەساڵی ٢٠١٩ دائەم ژمارەیە بەرزبوەتەوە بۆ (٣١٠٠٦) یەکە.

خشتەی ژمارە (٢) ژمارەی یەکەکانی نیشتەجێ بون لەکەلاردا,بەپێی ساڵ

| ز | ساڵ | ژمارەی خانوو |
|---|---|---|
| ١ | ١٩٧٧ | ١٠٨٥ |
| ٢ | ٢٠٠٢ | ١٤٥١٧ |
| ٣ | ٢٠١٠ | ٢٥٣٢٩ |
| ٤ | ٢٠١٩ | ٣١٠٠٦ |

## قۆناغی دوەم/١٩٩٢-٢٠٠٢ )قۆناغی دەسەڵاتی هەرێم,پێش ڕوخانی صدام(:-

ئەم قۆناغە,دەسپێکی یەکەم حکومەت وپەرلەمانی دان پێدانراوبوو لەسەرئاستی نێودەوڵەتی .لەوماوەیەدا دەیان ڕێکخراوی نێودەولەتی لەژێرناوی جیاجیاداو بۆ خزمەتگوزاری وهاوکاری خەڵکەکەی, ڕویان لەهەرێمی کوردستان کردو کەلاریش بەدەرنەبو لەخزمەتە مرۆیی وتەکنیکی ودارایییەکانیان.

ئەمەولەگەڵ هەولەکرچ وکالەکانی حکومەتدا,جۆرێک لەدڵنیایی لای هاونیشتمانیانی ناوچەکەدروستبو,بەشێوەیەک بوبەهۆی ئەوەی،ڕو لەناوەندی شارەکەبکەن بەمەبەستی نیشتەجێ بون,بەڵام بەڕێژەیەکی ئەوتۆنەبو.لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بۆ ئەوکارلێکەبکەین کەلەم قۆناغەداسەری هەڵداو لەقۆناغی سێیەمدا کاریگەریەکەی زیاتربو,ئەویش ڕۆڵ وکاریگەری یاسا یاخود ئالیەتەکانی (خواست وخستنەڕوە,بەبەراورد بەبارودۆخی داراییتاک)لەم شارەدا.

وەک ئاشکرایە لەم ماوەیەدا,عێراق لەژێرکاریگەری گەمارۆیەکی ئابوری خنکێنەری نێودەوڵەتیداو,کوردستانیش لەژێرگەمارۆی هەردولایاندابو.بۆیە خەڵکی کەلاریش,بەدەرنەبون لەکاریگەریە نیگەتیڤەکانی,تاکۆتاساڵەکانی نەوەدەکان وسەرەتای دوهەزار.

لەوماوەیەدا,سەدان پارچەزەوی وخانو بەسەر کەس وکاری شەهیداندا دابەشکرا, کەگەڕەکی شەهیدانی لێکەوتەوەو بوبەسەرەتایەکی نوێ,لەگەشەی زەوی وخانوبەرە لەکەلاردا.بەڕادەیەک کەژمارەی خانوبەرە لەم شارەدا,گەیشتە(١٤٥١٧) لەساڵی ٢٠٠٢ دا.لەکاتێکدا,لەقۆناغی یەکەمداو لەساڵی ١٩٧٧ تەنها(١٠٨٥) خانوی تێدابوە.هەرچەندە لەکۆتاییەکانی ئەم قۆناغەدا,دروست کردنی خانو وەدابەشکردنی زەوی بەسەر چین وتوێژەکاندا لەزیادبوندابو,بەڵام لەبەر دوهۆکار,نرخی زەوی وخانوبەرە ,تاڕادەیەک وەستا:

١-دۆخی دارایی هاووڵاتیان ڕولەخوارو لەئاستێکی نزمدابو,لەبەرئەوە بوەهۆی نزمبونەوەی خواستی تاک لەسەرخانوبەرە.

٢-لەگەڵ بەردەوامی هۆکاری یەکەمدا,خستنەڕوی زەوی ڕولەزیادبو,ئەویش لەئەنجامی دابەشکردنی هەزاران پارچە زەوی لەلایەن حکومەتەوە بەسەرچین وتوێژەجیاوازەکانی

شارەکەدا.ئەم ڕەوشە بەردەوام بو تاکو ساڵی ٢٠٠٣ و ڕوخانی دەسەڵاتی (صدام حسین).
قۆناغی سێ یەم/لەساڵی ٢٠٠٣ بەدواوە (قۆناغی دەسەلاتی هەرێم,پاش ڕوخانی صدام):-

ڕوخانی دەسەلاتی صدام حسین,چی بۆ کوردهێنا؟ کەلار لەونێوەندەدا,چی بەرکەوت وچی بەسەرداهات ؟
١) لەکاتی دروست بونی حکومەتی هەرێمەوە وبۆیەکەمجار,پارەیەکی باش لەلایەن بەغداوە تەرخان کرا بۆ هەرێم وهەواڵەی هەولێرکرا.کەهەرئەوکاتە شارەوانی ئیدارەی شارەکە,کۆمەڵێک کەسایەتییان کۆکردەوە بۆ قسەکردن لەسەرچۆنیەتی
خەرجکردنی پشکی کەلار لەوپارەیەو بەندەش یەکێک بو لەوبانگهێشتکراوانە.
٢) کۆچی هاوولاتیانی ناوچەکانی کێشەلەسەر بۆکەلار,بەهۆی بەریەک کەوتنی نەتەوەیی ومەزهەبیەوە.
٣) گەڕانەوەی ئەو کوردانەی نیشتەجێی ناوەڕاست وباشوری عێراق بون,بەهۆی فشاری عەرەبی شۆفێنی وئیسلامیە توندڕەوەکانەوە.
٤) پێدانی قەرز(پێشینە)ی خانوبەرە بەهاووڵاتیان,لەلایەن حکومەتی هەرێمەوە.
هەمو ئەوپێدراوانەی سەرەوە,ڕێگەخۆشکەربون بۆ دەرکەوتنی وێنەسەرەکیەکەو,دواجار ( کەلاری دیاردە ) یان دروست کرد. کەلارێک,لەئێستادا نرخی خانوبەرە تێیدا لەدەرەوەی هەرپێشبینیەکەو,ڕێژەی بەرزبونەوەکەی لەهیچ شوێنێکی تری عێراق وناوچەکەش,لەوێنەی نیە. بەڕادەیەک کە, زەویەک بەڕوبەری(٢٥٠)مەتر,ئەگەرلەقۆناغی دوەمداو لەساڵی ٢٠٠٢ دا بە(٩٠٠) دۆلاربوبێت,ئەوا لەم قۆناغەداو بەدروستی لەساڵی ٢٠١٢ دا,گەیشتە (١٥٠٠٠٠)هەزاردۆلار.
ئەم دیمەنە (مەشهەدە),لەسەردەمی زێڕینی دارایی هەرێمی کوردستاندا کەساڵانی (٢٠١٢, ٢٠١٣, ٢٠١٤) دەگرێتەوە,جوانتر دەرکەوت,
کاتێک نرخی خانوبەرە لەکەلاردا بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بەرزبووەوە.بەشێوەیەک،نرخەکان لەوساڵانەدا,لەسەدان هەزار دۆلارەوە دەست پێدەکات و ناوەستێت تادەگاتە ملیۆنان دۆلار.
خشتەی ژمارە (٣) نرخی خانوبەرە لەکەلاردا,بەپێی ساڵ

| ز | ڕوبەری زەوی/خانو (م ٢) | جۆرەکەی | ساڵ | نرخ/دۆلار | ساڵ | نرخ/دۆلار |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ٠٥٢ | نیشتەجێ بون | ٢٠٠٢ | ٠٠٩ | ٢١٠٢ | ٠٠٠٠٥٢ |
| ٢ | ٠٥٢ | بازرگانی | ٢٠٠٢ | ٠٠٠٠٤ | ٩١٠٢ | ٠٠٠٠٠٥١ |
| ٣ | ٥١ | بازرگانی | ٠٠٠٢ | ٢٠٠٠٠ | ٢٠١٩ | ٢٥٠٠٠٠ |

پەیوەندیدار بەم بابەتەولەلێدوانێکمدا بۆ کەناڵی (الجزیرە)ی عەرەبی لەساڵی ٢٠١٨ دا,ئەوەم ڕون کردۆتەوە کە,چۆن ئەوپاشەکشەی کەبەسەرنرخی خانوبەرە داهاتوە لەعێراقدا,کەلاری

نەگرتۆتەوە.وە ک ئەوەی کەلار شارێکی عێراقی نەبێت.بارودۆخەکە ئاڵۆزتربو,کاتێک دەسەڵاتدارانی خۆجێی,نەیاندەتوانی یاخود نەیاندەویست,وەبەرهێنەرانی بواری خانوبەرەی نێوخۆیی ودەرەکی پەلکێشی شارەکەبکەن.

هەربۆیە سەرەڕای باش بونی دۆخی دارایی هاوولاتیان لەم قۆناغەدا,کەبوەهۆی زیادەیەک لەخواستی تاک بۆ خانوبەرە,لەبەرامبەردا خستنەڕو کەم بو, یاخود لەئاستی پێویستدانەبوە. هاوکات لەبەر بەردەوامی ئەو چوار هۆکارەی لەسەرەتای ئەم قۆناغەوە ئاماژەمان بۆکرد,نرخی خانوبەرە هێشتالەسەر رێچکەی خۆیەتی و ڕولەبەرزبونەوەیە وتائەم ساتە وەختە,بەردەوامە. هاوکات ژمارەی یەکەکانی نیشتەجێبونیش لەم شارەدا بەراورد بەقەزاکانی دراوسێی زۆر زیادی کردوە،سەرەڕای جیاوازیی مێژویی نێوان کەلار،لەگەڵ خانەقین و کفری،بەتایبەتی خانەقین کەلەکۆنترین قەزاکانی عێراقە.بۆیەبەپێویستی دەزانم ئەوە ڕون بکەمەوە کە،خانەقین وکفری پێش ئەوەی ببن بەقەزا (سەردەمی حکومەتی کاتی ١٩٢٠-١٩٢١)،لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیشداهەرقەزابون ویەکەی کارگێری جیاوازیان تێدابوە.

خشتەی ژمارە (٤) ژمارەی یەکەی نیشتەجێبون،بەپێی قەزا بۆساڵی/٢٠١٩

| ز | قەزا | ساڵی بون بەقەزا | ژمارەی یەکەی نیشتەجێبون | سنوری ئامار | ساڵ | نرخ/دۆلار |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | کەلار | ١٩٧٠ | ٦٠٠١٣ | سەنتەری شار | ٢١٠٢ | ٠٠٠٠٥٢ |
| ٢ | خانەقین | ١٩٢١ | ٠٠٠٩٤ | | ٩١٠٢ | ٠٠٠٠٠٥١ |
| ٣ | کفری | ١٩٢١ | ٠٠٠٠١ | سەنتەری شار | ٢٠١٩ | ٢٥٠٠٠٠ |

تێبینی/نرخەکان لەسەر بەبەهاترین زەوی وەرگیراون.

سەرچاوەکان/

١)پرۆفیسۆری یاریدەدەر،احمدباوەڕ.

٢) بەرێوەبەرایەتی ئاماری کەلار.

٣)بەرێوەبەرایەتی ئاماری کفری.

٤)رزگارحاجی حمید/کەلار،مێژویەکی دێرین وجوگرافیای شارێکی زیندو(١٩٧٠-٢٠١٢).

٥)کاک علی،خاوەنی نوسینگەی کرین وفرۆشتنی خانوبەرە لەکفری.

٦)کاک ابوعلی،خاوەنی نوسینگەی کرین وفرۆشتنی خانوبەرە لەخانەقین.



# چۆن دکتۆر (محمد سۆیرەکی)* م ناسی ؟

د. شوان فرج سعید

لە ساڵی ٢٠١٠ بەمەبەستی خوێندنی ماستەر لەگەڵ هەریەکە لە بەڕێزان ( د.مریوان ساڵەح، د.کوردستان حەمید محمد، م. اسماعیل محمد رشید)ی پەیمانگای تەکنیکی کەلار، لە ڕۆژی ٢٠١٠/٧/٣ پەیوەندیمان بە زانکۆی یەرموک لە شاری (اربد)ی وڵاتی (ئەردەن) ەوە کرد، و پێشتریش هەریەکە لە بەڕێزان (د.چیا محمد حسن، د.سامان محمد محمەدامین، م.دڵگیر احمد محمود، م.جمیل محمد، م. سکاڵا حسێن محمد) لە هەمان زانکۆ دەست بەکاربوون.

پاش ماوەیەک لەدەوامکردن و پەیوەندیمان لەگەڵ مامۆستایانی بەش و بەتایبەتی بەڕێز (د.راتب عاشور) کە دواتر بووە بە سەرۆکی بەشمان، ڕۆژێک پێی وتین کە هاوڕێیەکی نزیکم کە لەهەمان کاتدا دراوسێشمە و ناوی (د.محمد سۆیرەکی ) یە کوردە و نووسەرە و خاوەنی چەندین کتێب و لێکۆڵینەوەیە، بەهەمان شێوەش لای بەڕێزیان باسی ئێمەی کردبوو، بۆیە بەڕێز (د.محمد) پێی باش بوو ئێمە بناسێت، بەهەمان شێوە ئێمەش وەڵامماندایەوە پێخۆشحاڵین بە ناسینیان و سەردانیکردنیان، سەرەنجام بانگێشتی کردین بۆ ئێوارەخوانێک لە ماڵی خۆیاندا، ئەوەش بووە هۆی

سەرەتای پەیوەندی نێوانمان. پاش یەکترناسین و گفتوگۆ، دەرکەوت پیاوێکی دڵسۆز و نیشتمان پەروەر و نوسەر و خاوەنی چەندین کتێبی مێژوویی و لێکۆڵینەوەی زانستی و خولی نێودەوڵەتییە، تەنانەت لەناو ماڵی خۆیان و لە ژووری پێشوازی ئالایەکی جوانی کوردستانی هەڵواسیبوو، هەروەها ئەوەشی بۆ ڕوون کردینەوە کە ڕێژەیەکی زۆری کورد لە وڵاتی (ئەردەن) هەیە، نازناویان ئاماژەن بۆ کوردبوونیان وەک ( الکوردی – زازا – الماردینی – الصویرەکی .....هتد) و هەوڵیشیان داوە لە ساڵانی ڕابردوو بە لیستێکی کوردی بەشداری بکەن لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی وڵاتی (ئەردەن)دا، بەڵام هۆکاری دارایی بووە هۆی شکستهێنانی هەوڵەکانیان و چەندین ڕێکخراوی کوردی هەیە لەو وڵاتە، کە لە بواری ڕۆشنبیری و کلتوری و زانستی کار دەکەن و چەندین کار و چالاکییان ئەنجام داوە، لە وەڵامی پرسیاری نەزانینی زمانی دایک (کوردی) لە لایەن زۆربەی زۆری کوردانی ئەو وڵاتە و بە تایبەتی گەنجان، هۆکارەکەی بۆ ئەوە گەڕاندەوە کە کوردانی ئەردەن پاشماوەی سوپای سەلاحەدینی ئەیوبی بوون و لەوێ جێگیر بوونە بۆیە وەک (د.محمد) وتی کاتێک ئێمە چاومان بە ژیان هەڵهێنا بینیومانە کە دایکمان عەرەب بووە بۆیە تەنها بەتەمەنەکانمان کوردی دەزانن، بەڵام وەک دەڵێت من لەناو خزم و کەس و کارمدا وامکردووە منداڵەکانمان ناوی کوردی لە منداڵەکانیان بنێن و کوڕەکەی خۆشم ناوی (کامەران)ە .

* : (سۆیرەک) دێ یەکە لە باکوری کوردستان

ژیاننامەی د. محمد علی سویرکی

لەدایکبووی ١٩٦١/٩/١٠ز اربت-اردن

*هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرا لە ڕێگەکانی وانەوتنەوەی زمانی عەرەبی، لە زانکۆی عەممانی عەرەبی بۆ خوێندنی باڵا، عەممان- ئەردەن، ساڵی ٢٠٠٤ز

* هەڵگری بڕوانامەی تەکنیک و کارامەیی، مێژووی زارەکی لە مەڵبەندی ئەردەنی تازە بۆ لێکۆڵینەوە عەممان کە لە ٣ب-٧ی شوباتی ٢٠٠٦ی زایینی بەسترا.

* ئەندامی یەکێتیی نووسران و ئەدیبانی ئەردەن- لقی عەممان لە ساڵی ١٩٩٢ـەوە ئەندام و ئەمینداری کۆمەڵەی نووسینە کۆنەکان، اربت – ئەردەن.



د. محمد علی سویرکی

کتێبه بڵاوکراوەکانی:

(أ) یڵاوەکراوەکانی له بواری پسپۆڕییەکەی:

. العنوان: التعبيرالشفوي : حقيقته ، واقعه ، أهدافه ، مهارته ، طرق تدريسه ، و تقويمه.الناشر:

ط ١ـ ، (د . ن)، عمان: ٢٠٠٦.    ط ٢، دار الكندي، اربد، ٢٠٠٧م

. العنوان:   التعبيرالكتابي ( التحريري) : أسسه، مفهومه، أنواعه، طرائق تدريسه.

الناشر: دار الكندي، اربد, الأردن، ٢٠١٠م.

. العنوان: الألعاباللغوية و دورها في تنمية مهارات اللغة العربية.

الناشر: ط١ ، مكتبة الطلبة الجامعية، عمان : ٢٠٠٥.  ط٢، إربد، دار الكندي، ٢٠١٢م

العنوان: التعبير الوظيفي : أسسه، مفهومه، مهاراته، أنواعه.

الناشر: دار الكندي، إربد : ٢٠١١.

(ب) بڵاوکراوە مێژوویە بەڵگەنامەییەکانی:

العنوانكتابتاج الملوك النفيس بترجمة الإمام الشافعي محمد بن إدريس.

المؤلف: الشافعي؛ إسماعيل العجلوني (محقق).الناشر: دار الكندي(دعم وزارة الثقافة)، إربد : ٢٠١٠

العنوان: تاريخالأكراد في بلاد الشام ومصر.الناشر:أ مانه عمان الكبرى، عمان، الأردن : ٢٠١٠.

. العنوان: عائشةالباعونية.الناشر: عمان، مطبعة دار دجلة، ٢٠٠٦م.الطبعة الثانية، مكتبة الأسرة، وزارة الثقافة، عمان، ٢٠١١م.

العنوان: الأردنفي أشعار العرب.الناشر: وزارة الثقافة والتراث القومي، عمان: ١٩٨٨.

العنوان : إربد : المدينة : تاريخ و حضارة و آثار.الناشر: أمانة عمان الكبرى، عمان : ٢٠٠٦.

. العنوان : تاريخالسلط والبلقاء ودورهما في بناء الأردن الحديث. الناشر: دار عمار، عمان، الأردن : ١٩٩٨.

العنوان: الموسوعة الكبرى لمشاهير الكرد عبر التاريخ. الناشر: الدار العربية لموسوعات، بيروت، ٢٠٠٧-٢٠١٢م. (في ٨ مجلدات).

- نشر العديد من المقالات الثقافية والأدبية في العديد من المجلات الأردنية والعربية.



# کورتەیەک لەسەر مێژووی وەرزش لە کەلار

یاسین محمد احمد

وەختێک باس لە مێژووی هەرشارستانیەتێک یان وڵاتێ یان شارێک ئەکەیت دەبێت ئەوشوێنە مێژوویەکی دورو درێژی هەبێت واتا هەتا دێرین تر بێت گومانی تیانیە لە هەموورووییەکەوە دەوڵەمەند ترە ، شاری کەلاریش بەوەی کەبووەتە قەزا زۆر کۆن و دێرین نیە وەک هەمووان دەزانن لە ساڵی ٧٠ ی سەدەی ڕابردوو بڕیاری بە قەزاکردنی دەرچووە ،

ئەڵبەتە کە کاتێکیش باس لە جموجووڵ و چالاکی و بزاوتی وەرزشی ئەکەین لەم شارە دەبێت لەو مێژووەوە دەست پێ بکەین و باسی لێوەبکەین ، نکوڵی لەوەناکرێ کە هەمیشە حەز و خولیای وەرزش لەم ناوچەیە هەبووەو حزوری هەبووە بۆ نمونە لە ساڵەکانی ١٩٥٠ بۆ ١٩٦٠ یاری تۆپی پێ هەبووە لە گوندی کەلاری کۆن ، بەڵام لە سنورێکی دیاریکراودا بەڵام لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا ئیتر ئەتوانین بڵێین لەومێژووەوە بە فیعلی جموجوڵی وەرزشی هەمەچەشن و هەمەجۆر دەست ئەکات بەچالاکی ، ئەوەی کەزانراوەو لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا لەم شارە چەند تیپێکی تۆپی پێ هەبوون خەریکی یاریکردن و سەرقاڵی چالاکی وەرزشی بوون بۆنمونە لەوانە ( کەلاری کۆن / تیپێک هەبوو بەناوی قەزاکە یان بنگردیشیان پێ ئەوت ) تیپێکی تر هەبوو بەناوی ( گلائع ) ، وەهەروەها تیپی زەراعە هەبوو ، ئەوەی قەزاکە یان بنگرد زۆرتر کاک محمدی حاجی



محمود سەرپەرەشتی ئەکرد کە کەسایەتیەکی دیارە لە شاری کەلار ، هەروەها تیپی گلائع کە ئەم تیپەش چەند کەسێک سەرپەرەشتیان ئەکرد ، تیپی زەراعە کە لە لایەن کاک بەکر و کاک محمد علی سەرپەرەشتی ئەکران ، ئەڵبەتە ئەم تیپەی دواییان زۆر تەمەنی نەبوو و نەما ، وەک زانیمان لە ناوەڕاستی حەفتاکان ئەم شارە کەم کەم گەشەئەکات و ئاوەدان ئەبێتەوەو خەڵکی ئاوارەبووی ١٩٧٤ لە خوارووی عێراق ئەگەڕانەوەو لەم ناوچەیە نیشتەجێ ئەبوون و لەگەڵ زیاد بوونی خەڵکیش تیپەوەرزشیەکانیش زیادیان ئەکرد و لەوماوەیە هەتا سەرەتای هەشتاکان چەن تیپێکی تری وەرزشی دروست ئەبن وەک ( حەمەی کەریم ) کە ئازادیشی پێ ئەوترا ، کەئەم تیپە لەسەر دەستی مامۆستا ئیبراهیم عبدالرحمن و کاک جلال محی الدین دروست ئەبێ ، ئینجا تیپی ( مجموعە ) کە نەورۆزیشی پێ ئەوترا ئەم تیپەیش لەسەر دەستی چەند کەسایەتیەکی وەرزشی درووستبوو وەک : مامۆستا نەوزاد و مامۆستا هێرش و مامۆستا گارق و هتد ....

تیپی هاوکاریش دێتە بوون بەدەستی مامۆستا صاڵح درووست ئەبێ ، تیپی برایەتی لەلایەن مامۆستا دڵشاد و چەند هاوڕێیەکی تری درووست ئەبێ ، کەئەتوانین بڵێین تاکۆتایی هەشتاکان تیپەکانی کەلار کەلەسەر گەڕەکەکان ناو ئەنرا ئەمانە بوون ( کوردستان ، برایەتی ، حەمەی کەریم ، مجموعە ، لیواکە کە لیوای ٤٤٤ی پیادەی بارقی عبداللە حاجی حنکە ، هاوکاری ، بەردەسوور ، گەرمیان ، بنگرد ، کەلاری کۆن ، قۆرەتوو ، گازینۆ ، دەورە ، گردەگۆزینە ، کوڵەجۆ ) سەبارەت بەساحەکانی کەلار کە یاری تێدا ئەکرا سەرەتا دووساحە هەبووە ( ساحەی کەلاری کۆن / کەئەم ساحەیە تایبەت بووە بە و گوندە ، لەگەڵ ساحەی بنگرد کە ئەم ساحەیە دوای ماوەیەک شوێنەکەی دەکرێتە یانەی فەرمانبەران بەفەرمانێکی حکومی ئەوکاتە ،

نزیک لەنگە فرۆشەکانی ئێستاو بیناکەی کاک احمدی حاجی فاتم ، ئینجا کەکاتێک ئەو گەڕەکە زۆرتر ئاوەدان ئەبێتەوەو یانەی فەرمانبەرانیش درووستئەکرێت ساحەکە ئەگوێزرێتەوە بۆ پشتی بینایەی حزبی شیوعی ئێستا بەڕووی چەمی سیروان ، ماوەیەکیش لەوێ ئەبێت و دواجار لە ساڵی ١٩٨١ بۆ ١٩٨٢ ئەگوێزێتەوە بۆ شوێنی مزگەوتی شێخ ئیبراهیمی ئێستا وە دوای ماوەیەکیش جارێکیتر شوێنەکەی ئەگوێزێتەوە بۆ شوێنی دریم لاندی ئێستا کەدواجار ئەم ساحە یە ناوی لێنرا ساحەی (شەهید نەجم ) ، ئەوکاتە ساحەیەکی ترمان هەبوو بەناوی ساحەی حەمەی کەریم کە تایبەت بوو بەم گەڕەکە .

خزمەتکردن و بەرەو پێشبردنی وەرزش لەم شارە سەرەتا خۆبەخشانە بووە دواجار و کەم کەم و بەیناوبەین حکومەتی عێراقی ئەوکاتە یارمەتی تیپە مللیەکانی داوە بە جلوبەرگ و تۆپ و کەرەسەی وەرزشی تر ئەویش لە ڕێگەی یەکێتی لاوانی سەربەحکومەت ( الاتحاد شباب ) ئەوەی شایانی ووتنە هەرلە ناوەڕاستی حەفتاکان هەڵبژاردەی کەلار بۆ تۆپی پێ ئەکرێتەوە لەلایەن چەند کەسێکەوە وەک (محمدی حاجی محمود ، کریم ڕەفعەت و خلیل ڕەفعەت و ڕزگار مەشەەیی ) و کۆمەڵێک گەنجی تری ئەو سەردەمە ، هەتا ئەوکاتەی کە مامۆستا خلیل وەلی لە ١٩٧٧ ڕووله کەلار ئەکات و نیشتەجێ ئەبێت و هەڵبژاردەی کەلار دەگرێتە دەست و بە شێوەیەکی ئەکادیمی و هونەری و تۆکمەتر گرنگی بەم هەڵبژاردەیە ئەدات ، وەزۆرجار بووە لە ماوەی هەفتەیەکدا چوار ڕۆژ ڕاهێنان و مەشقیان کردووە ، ئیتر ئەم هەڵبژاردەیە دەست ئەکات بەیاری کردنی دۆستانەی خۆی لە گەڵ شارەکانی دەوروبەری کەلار وەک خانەقین و دەرەندیخان و هەڵبەجە و جەلەولاو هیتد ....



وەزۆرجایش هەبووە کە سلێمانی یاری کردووە لە خولەکان سوودیان لە یاریزانە باشەکانی هەڵبژاردەی کەلار وەرگرتووە .

سەرەتای هەشتاکان و بەرەو نەوتەکان کەم کەم تیپەمللیەکانی شاری کەلار زۆرتر ئەبن و دەستئەکرێت بە کردنەوەی خولی تۆپی پێی تیپە مللیەکان ، ئەوەی کە شایانی ووتنە لێرە ئاماژەی پێبدەین بۆ مێژوو کە ئێمەباس لە کوەرتەک لە مێژووی وەرزشی کەلار ئەکەین ڕۆل و خەمخواردنی هەندێ کەسایەتیە کە هەمیشە لە غەمی ئەوە بوونە ڕەوتی وەرزش لەم شارە بەروە پێش بڕوات بەهێزبێت و جوانتر دەرکەوێت و کەلاریش ببێتە ژمارەیەک لە گەڵ شارەکانی تر ، بۆ نمونە لەوانە مامۆستا خلیل وەلی بەڕەحمەت بێت کەزۆرجار خولی تۆپی پێی قوتابخانەکان ئەوسەرپەرەشتی ئەکرد لە گەڵ چەند هاوڕێیەکی تری هەروەها ڕۆڵی کاک ڕزگار مەشەیی بەڕحمەت بێت کە زۆر جار ئەم کەسە لەماڵ و گیرفان و کاتی خۆی هەمیشە خزمەتی بەوەرزش ئەکرد و زۆر یش بەپەرۆش بووە ، وەهەروەها کاک شەهید نەجم کە یەکێک بووە لەو کەسایەتیانەی کاتی خۆی و لە سالانی هەشتاکان سەردانی وەزیری لاوانی عێراقی کرد بۆ ئەوەی یانەیەکی تۆپی پێ بکرێتەوە تایبەت بێت بەشاری کەلار هەروەها کاک نجم هەمیشە بە پارەو ماڵی خۆی لە خزمەتی وەرزشدابووە ، هەروەها کاک محمد ی حاجی محمود کە ئەم بەڕێزەیش زۆرجار لەخزمەتکردنی ساحەکانی کەلار و دابینکردنی جلوبەرگی وەرزشی و بەدەمەوەچوونی بۆ گەنجان و لاوانی ئەم شارە ڕۆڵ و دڵسۆزی خۆی هەبووە .



# هونەری لێبووردن



بەیان مەجید سەعید

لێبووردن گونجاندنێکی کارەکییە هەستی ناوەکی پەشیمانی  دەگۆڕێت بۆ داننان بە هەڵەدا, واتا لێبووردەیی جۆرێکە لەدەربڕینی پەشیمانی  بە کردارو گوفتار .. سیفەتی کەسە پاک و مەزنەکانە, چونکە داننان بەهەڵە چاکەیە , داوای لێبووردنیش چاکەیەکی تر ,بەهەردووکیان چاکەیەکن کە خۆشەویستی و سۆزو میهرەبانی  نێوان مرۆڤەکان زیاتر دەکات و هاوسەنگی پەیوەندییەکان ڕادەگرێت .

مەرهەمێکە زۆربەی برینەکان سارێژ دەکات , لەهەمان کات دەبێتە ڕێگر لەبەردەوامی و تەشەنەکردنی ناکۆکییەکان .

بەو پێیەی  ئێمە مرۆڤین, مرۆڤی کامڵ و نموونەییش بوونی نییە, هەموومان قابیلی هەڵەین , وە لە پێکهاتەو سروشتی مرۆڤ دا توانایەک هەیە کە بتوانێت لە کاتی قسەکردن و هەڵسوکەوتیدا بەرامبەرەکەی برەنجێنی ,یان ئازاری بدات بە مەبەست بێت یان بێ مەبەست , هەموو مرۆڤ هەڵەدەکەن , باشترینی ئەو مرۆڤانەش لێبووردەکانن . کەواتە لە بەرامبەریشدا دەبێ توانای ئەوەمان هەبێت کە بەپێی قەبارە جۆری هەڵەکەمان ,لێبووردن و بەخشین پێشکەش بکەین .بۆ بەردەوامیدان بە ژیان .

سروشتی لێبووردن وایە کە ئاسان نییە , ڕۆشنبیری تاکەکانیش بۆ چەمک و شێوازی لێبووردن جیاوازە و , یەک جۆرو ئاست و قەبارە نین . لای هەندێک کەس داوای لێبووردن و بەخشین قورس و زەحمەتە بە جۆرێک وا دەزانن دەبێتە هۆی بریندار بوونی کەرامەتیان , .بەو مانایەی نیشانەی لاوازییە ,ئەمەش زیاتر لای ئەو کەسانە وا ئەزانن چینێکی باڵاتر و تایبەت ترن و ئەوان هەرگیز هەڵەناکەن , هەڵەشیان کرد جوان نیە بۆیان داوای لێبووردن بکەن لەبەر پلە و پوستێک کەهەیانە .. لە ڕاستیدا ئەمەش یەکێکە لە سیفەتەکانی شەیتان ئەویش (تەکەببور) لەخۆبایی بوونە .

بەڵام بە پێچەوانەوە لای کەسانی ڕوشنفکرو ئەوانەی هەست بە بەرپرسیاری زیاتر دەکەن و هەمیشە ورياو حەزەرن لە گفتو گۆو مامەڵەیاندا , وە هەست و شعور و کەرامەتی بەرامبەرەکەیان گرنگە بەلایانەوە ,لێبووردن بە لایانەوە کارێکی ئاسان و ئاساییە ,بەو پێیەی لێبووردن مانای زەلیل بوون و خۆ بەکەم زانین نییە ,بەڵکو نیشانەی گەورەیی و دەرخستنی هێزی ناوەکییە .

لە ڕاستی دا قەبووڵ کردنی ئەو حەقیقەتە دژوارە بەوەی هەست بکەی هەڵەیەکت ئەنجام داوە , چ بگات بەوەی دانی پیا بنێیت و پەشیمانی دەربڕیت بەرامبەر کەسانی تر . بێگومان ئەمەش بە پێی قەبارەو جۆری هەڵەو ئاستی ڕۆشنبیری و تێگەیشتنی کەسەکان دەگۆڕێت .

بەداخەوە لە هەندێک کۆمەڵگەکان داو لای زۆربەی تاکەکان ڕۆشنبیری لێبووردەیی نییە یان زۆر لاوازە بەو پێیەی هەندێک لە دایکان و باوکان پێیان شەرمە یان وا ئەزانن لاوازییە گەر داوای لێبووردن لە منداڵەکانیان بکەن یان بەڕێوەبەربەرامبەر فەرمانبەرەکانی و مامۆستا بەرامبەر قوتابی ,لە کاتێدا هەڵە هەر هەڵەیە هەرکەسێک ئەنجامی بدات , بە پێچەوانەوە لە زۆربەی کۆمەڵگەکانی تردا لێبووردەیی بەشێکە لە ڕۆشنبیری فیکری و پێکهاتەی تاکەکانی , دەبینین هەر لە منداڵییەوە تۆوی ئەم سیفەتە جوانەیان تێدا دەچێنن ,بۆئەوەی لەگەڵ پەروەردەکردنیدا گەورە ببێت و ببێتە بەشێک لە ڕۆشنبیرییەکەی و بە شێوەیەکی ئەرێنی لەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ڕەنگ بداتەوە و وایان لێ بکات داوای لێبووردن و بەخشین بخوازێت لەهەر هەڵەو لێکنەگەشتنێک بێ ئەوەی هەست بە شەرم و لاوازی بکات .

### سوود و کـــاریگەرییەکانـی لێبـــووردن :

١- بەهێز کردن و پاراستنی خاوێنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان لە نێوان تاکەکان دا بەو پێیەی دەرگای گفتوگۆو پەیوەندییەکان لە نێوان هەردووکەس دا دەکاتەوە , واتا پێدانی فرسەتێکی ترە بەکەسی بەرامبەر بۆ درێژەدان بە پەیوەندییەکەیان .

٢- پایەو پێشکەوتوویی لە بیر کردنەوەدا , قورئان دەفەرموێ ( وتعاونو على البر والتقوى ) .

٣- لێبووردن خۆی لە خۆیدا شێوەیەکە لە شێوەکانی مامەڵەی جوان و هونەرێکە, لە هونەرەکان سەنگ و قورساییەکی تایبەت لە مرۆڤدا دروست دەکات, ئەمەش ئاستی متمانەی کەسەکە

بەخۆی دەردەخات و دەیسەلمێنێ پاشکۆی کەسانی تر نییە .
٤- لێبووردن و ڕێگاکانی لێبووردەیی کاریگەرییەکی گرنگی دەروونی و کۆمەڵایەتی لەسەر تاکەکان بەجێدەهێڵێ و جۆرێک لە ڕێزو موحیببەت بە ژیانی دەبەخشێت .
٥- لێبووردن جۆرێک لە هێـزو متمانەو ئارامی دەروونی بەکەسی لێبووردوو دەبەخشێ ,ئەمەش وادەکات ببێتە جێگای ڕێزو متمانەی ئەوانی تر ,واتا بە دەستهێنانی ڕێزی خۆت و بەرامبەرە لەیەک کاتدا .

## هەنگـاوەکانـی هـونەری لێبـووردن :

١- دەربڕینی پەشیمانی لەگەڵ ڕوونکردنەوەی پێویست بۆ ئەوەی ئەنجامت داوە , واتا تەنها وشەی (ببورە ) یان ( داوای لێبووردن ) بەس نییە بەڵکو پێویستە ئەو دەربڕینانە ببەستی بە ناو هێنانی ئەو هەڵەی ڕووی داوە , بۆ نموونە بڵێیت : ( ببورە دوێنێ دەنگم بەسەرا بەرز کردیتەوە ) یان ( ببورە کە ئەو هەڵەیەم بەرامبەرت کرد)

٢- هەست کردن بە بەر پرسیارییەتی :

هەوڵ بدەین هەمیشە وشەی پوخت و پێویست هەڵبژێرین بۆ لێبووردنمان , هەمیشە خۆت لەجێی کەسی بەرامبەر دابنێ بۆ ئەوەی هەست بە ناخی بکەیت و بەپێی ئازارەکەی ئەو داوای لێبووردن بکەیت, و پێویستە ڕاستگۆبیت لە لێبووردن چونکە دەری دەخات ئەو کەسە هەڵگری بەرپرسیاریەتی ڕەفتارەکانێتی , ئەمە بڕوا بەخۆبوونیش زیاتر دەکات

٣ – قەرەبوو کردنەوە :

دەبێت ڕێگەیەک هەبێت بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەو کەسەی کە هەڵەو خراپەیەکت بەرامبەری کردووە ,بۆ نموونە لەکاتی هەڵەکردنی بەرێوەبەر بەرامبەر فەرمانبەرێک لەپێش فەرمانبەرێکی تر ,ئەوا پێویستە هەرلە پێش هەمان کەس داوای لێبووردنی لێبکات ,یان باسی کارامەیی و لێهاتوویی فەرمانبەرەکەی بکات .

٤- بەڵێندان بە دووبارە نەکردنەوەی هەڵە :

ئەمە پەیامێکی دڵنیاییە کە چیتر هەڵسوکەوتی دەگۆرێت و هەوڵدەدات کە هەڵەکەی دووبارە نەکاتەوە بەمەش متمانەو ڕێزو کەرامەتی بەرامبەر دەگێڕێتەوە .

٥- لێبووردن ئەرکە , قەبوڵ کردنیشی ئەرکێکی پێویست تر :

کاتێک کەسێک داوای لێبووردن دەکات بێگومان دوای هەست کردن بە هەڵەو پەشیمانی و پێداچوونەوە بە خۆی دا بڕیاری لێبووردنی داوە , کەواتە پێویستە کەسی بەرامبەریش ئەمە بە سوکایەتی و کەمی کەسی لێبووردوو نەزانێت , درک بەوە بکات ئەمە بۆ پاراستنی بەردەوامی هاوڕێیەتی و سۆزو موحیببەتە , هەنگاوێکە بۆ چاکەو چاکە کاری .

٦- هەڵبژاردنی کاتی گونجاو بۆ لێبووردن :

پێویستە ئەو کەسەی داوای لێبووردن دەکات کاتێکی گونجاو و شیاو هەڵبژێرێت ,لە کاتێکی وادا نەبێت کە کەسی بەرامبەر لە حاڵەتی هەڵچوون و نائارامی دابێت , بەو مانایە نییە کە لێبووردن دوابخەیت , چونکە بە دواخستنی جگە لەوەی ساردییەکی زیاتر دەکەوێتە نێوانیان بەڵکو لێبووردنەکەش ئەو نرخ و بەهایەی نامێنێت.

٧- دەستپێشخەری لە لێبووردن دا :

وا باشترە کەسی هەڵە دەستپێشخەری بکات لە پێشکەش کردنی لێبووردن و بەو پێیەی نییەت پاکی و گەورەیی خۆی بسەلمێنێ , زۆرجار تۆ هۆکاری هەڵەو ناحاڵیبوونەکە نیت بەڵام دەسپێشخەری ئەکەی لە لێبووردن بەو پێیەی لێبووردن و بەخشندەیی سیفەتی کەسە مەزن و پاکەکانە .

## جۆرەکـــانی لێـــبووردن :

١- لێبووردنی ڕووکەش : تەنها بۆ نەهێشتنی لۆمەو گلەیی یە , تاڕادەیەک ڕاستگۆیی تێدا نییـە .

٢- لێبووردنی خۆشدوویی (مجامله):تەنها بۆ ڕاکێشانی سەرنجی بەرامبەرە وەک لەوەی مەبەستی لێبووردن بێت.

٣- لێبووردنی خـــێرا : ڕاستەوخۆ پاش ڕوودانی هەڵە پێشکەش دەکرێت , زیاتر ئەو کاتانەی ڕەنگە لێکنەگەشتن و بەریەککەوتنێکی بێ مەبەست و ئاسایی روویدابێت .

٤- لێبووردنی مشتومڕی : ئەم جۆرە مشتو مڕو بیانوو هێنانەوەی زۆری لەگەڵدایە , لە ڕاستیدا کەسی هەڵە نایەوێ دان بەهەڵەکەیدا بنێت یان نیوە داننانێکە .

٥- لێبووردنی فرت و فێڵ (تەڵەکە) : ئەم جۆرە لێبووردنە کەسانێک بەرامبەر کەسانی خاوەن پلەو پایەو نفوز و دەسەڵات پێشکەشی دەکات ,یان لەترسی سزادانە یان لەدەستدانی کەسەکە یان بەرژەوەندییەک .

٦- لێبووردنی ئاشکراو ڕوون : لێبووردنێکی روون و ڕاستگۆیە , دوورە لە ڕیا و بیانوو , ئەو کەسە تەواوی قەناعەتی پێی هەیە و ئاشکرا دان بە هەڵەکەیدا دەنێت و هەوڵی ڕاستکردنەوەی دەدات .

٧- لێبووردنی گشتی : کەسانی خاوەن دەسەڵات و پایە پێشکەشی دەکەن لە بەرامبەر هەڵەو کەم و کوڕییەک , زیاتر بۆ ڕاکێشانی هەستی خەڵکییە .



# قەرەچەکان بە کەلاردا گوزەریان کرد

فەتاح تەنیا

## قەرەچەکان کێن؟

قەرەچ:(قەرەچ بە عەرەبی: الغجر) گروپێکی گەڕۆکی خەڵکن, کە دابەشبون بە سەرجیهاندا بەتایبەتی لە کیشوەری ئەوروپا و ئەمریکا بەتایبەتیتر لە وولاتی ڕۆمانیا لە ئەوروپای ڕۆژهەلات کە بە ناوەندی قەرەچ دادەنرێت. لە ئاسیا و لە وڵاتی عێراق و کوردسانیش دەژین, خاوەنی کلتورو ئادابی خۆیانن و هەمیشە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر کۆچ دەکەن بەوە ناسراون کە پیس و پۆخڵن .

زۆربەی کات لە گوند و کۆمەڵگای نیشتەجێبونی دورەپەرێز لە دەورووبەری شارەکاندا دەژین. لە هەریەک لە پارێزگاکانی بەغداد، بەسرە، نەینەوا، موسەنا، دیوانیە و هەندێ شاری هەرێمی کوردستانیشدا بونیان هەیە، لەشارەکانی هەولێر و سلێمانی کۆیە و دەهۆک و یەکێ لە شارەکانی پارێزگای دیالەش بە ناوی کەنعانەوە یەکێکە لە نشینگەگرنگەکانی ئەم کەمینەیە، هەروەها دوای

جەنگی(٢٠٠٣). یەکێک لە نیشتگەکانی تری ئەم کۆمەڵە بە ناوی شارۆچکەی کاولییە کە دەکەوێتە(١٠٠)میل لە باشوری شاری بەغداد. ئەوەندەی زانراوەئەو شارۆچکەیە وێرانکرا لەلایەن سوپای مەهدییەوە بە پاساوی ئەوەی کە دانیشتوانەکەی بنەمای ڕەوشتیی پەسەندیان نییە، ئەمانە بونە هۆی ئەوەی کە زۆرینەی دۆمەکانی عیراق کۆچ بکەن بۆ دەرەوە.

## ڕەگ و ڕیشی قەرەچەکان...

ڕەگ و ڕیشەی قەرەچ دەگەڕێتەوە بۆ نیمچە دوورگەی هند لە ناوچەکانی ڕاجاستان و هاریان و پەنجاب و سینە، مێژووی کۆچکردنیان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی(١٤٤٠) ز لە هندستانەوە بۆ ڕۆمانیا، ژمارەی قەرەچەکان، بە پێی سەرژمێرێیەکی نافەرمی ژمارەی دانیشتوانی قەرەچەکان نزیکەی(١٢) ملیۆن کەسە .

## قەرەچەکان بێ دەوڵەتن:

قەرەچان بەوە ناسراون کە خاوەنی دەوڵەتی خۆیان نین بەڵکو هەموو شوێنێکی ئەم جیهانە بە دەوڵەت و نیشتمانی خۆیان دەزانن. ئەوان سنورەکان ناناسن بۆ هەرکوێ بیانەوێت دەچن، بەپێی سەرچاوەیەک ژمارەیان لە دەوری(٥٠) هەزار کەس بووە لە ساڵی(٢٠٠٥) دا لە عیراقدا. لە ساڵی(٢٠٠٩) لە سەردەمی سارکۆزی سەرۆکی فەرەنسا بڕیاریدا(١٠) دە هەزار قەرەچ بگێڕێنێتەوە بۆ ڕۆمانیا.

## قەرەچەکان دەروەزەکەرن:

قەرەچەکان لە ڕووی ئابوریەوە پشت دەبەسن بە پیشەی سواڵکردن و دەرۆزە کەروە لە شارەگەورەکان، قەرەچەکان نەخوێنەوارن، منداڵ ناخەنە بەرخوێندن بەڵکو کەهەر پێی گرت فێری پیشەی دەرۆزەکردنی دەکەن.

## کوردو قەرەچ ...

کوردستانیش وەک هەموو شوێنێکی تری جیهان بێ بەش نییە لە قەرەچ. مێژوویەکی دووروو درێژی هەیە. لە نزیک شارەگەورەکان دەژین, ووشەی قەرەچ وەک دەربڕینێکی خراپ لە ناو ئەدەبیاتی کوردیدا جێی خۆی کردۆتەوە، زمانێکی تایبەت بە خۆیان هەیە.

قەرەچەکان بەنێو کەلاردا گوزەریان کردووە و ماوەیەکی زۆریش لێی نیشتەجێبوون، لەباشووری خۆرهەڵاتی شارەکەوە بەتایبەتی لەلای قەڵای شێروانە، لە ساڵی(١٩٩٩) بۆ ساڵانی(٢٠٠٤) تاوەکو(٢٠٠٥) لە و ناوچەیە کەپریان چێکردبوو، لەلایەکی دیکەشەوە لە شاری کەلار ئەم چینە لەم شارە ژیاون ناکرێت پەراوێز بخرێن بەجۆرێک لەجۆرەکان لە ڕووی تێکەڵ بوونیانەوە لەم شارەدا دیاربوون ئەگەر چی بەرێژەیەکی کەمیش بێت ئەوانیش بریتی بوونە لە قەرەچەکانی شاری کەلار هەروەک چۆن لە کوردستان بەگشتی بوونیان هەبووە بەهەمان شێوەش لە شاری کەلاریش بوونیان هەبووە، لەگەڵ ئەوەش ئەو قەرەچانە وەک بەشێک لە قەرەجەکانی کوردستان لە ڕووی پێکهاتەیانەوە جۆراو جۆر بوونە هەندێ لەمانە بەرەسەن کورد بوونە بەهۆی کۆچ و ئاوارەی بوونەتە قەرەچ، بەڵام بەشێکی دیکەشیان خەڵکی ناوچەی دیکە بوونە دواتر بوونەتە قەرەچ، ئەو قەرەچانەی لەکەلار نیشتەجێ بوونە لەڕووی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیانەوە چەند بەشێک بوونە هەندێکیان بەفارسی قسەیان کردووە هەندێکی تریان بەتورکی، ئەو قەرەچانە پیاوەکانیان بە پیشەی جۆراو جۆری میللی خەریک بوونە وەک دروستکردنی تەشی و تیرۆک و ئاهەنگ گێرانی میللی و ژن و منداڵەکانیشیان خەریکی دەرۆزەکردن بوون لە نێو نۆڕینگە و مزگەوت و نێو بازاڕدا، سەرەڕای ئەمەش بەشێک لە ژنەکانیان خەریکی فاڵگرتنەوە بوون، ئەمەش بۆخۆی دیاردەیەکی ناپەسەند بوو لە چاوی دانیشتوانەوە لە شاری کەلار، بەڵام بە هۆی ئەوەی شاری کەلار لە ڕووی میوان دۆستی و سەخاواتەوە دەستکراوەن هاریکاری باشی قەرەچەکان دەکەن، لە ڕووی مادی و خواردن و جلوبەرگەوە، ئەمەش نەریتێکی جوانی شاری کەلارە.

سوود وەرگیراوە لەم سەرچاوانە:

١. ٨٥٪D٩٪٨٦٪AF٪DB٪https://ckb.wikipedia.org/wiki/٪D٨

٢. bi&١٣٦٦=https://www.google.iq/search?q=roma+people&hl=ar&biw
٠ahUKEwi٣upnJ٢YPnAhXEPFAKH=source=lnms&sa=X&ved&٥٧٦=h
WxNBGQQ_AUIDSgA



# رادیۆیەکی ئازاد
# بۆ خزمەتی ئازادیی

ئازاد عوسمان

لەکاتێکدا باو باوی دەرکردنی رۆژنامە و گۆڤار بو، رۆژنامەنوسانی گەرمیان کەمتر خۆیان لە پرۆژەی تری میدیایی دەدا، بەتایبەتی کە پرۆژەکانی تر تێچون و کات و ماندوبونی زۆری دەویست، ئەمە سەرباری زۆریی سەرئێشەکانیش! لەوکاتەدا ئێمە بڕیارماندا (رادیۆی دەنگ) دابمەزرێنین، بۆ ئەوەی ببێتە بڵندگۆیەکی میدیایی سەربەخۆ و خزمەت بە بەرەوپێشەوەچونی سنورەکە بەگشتی و ئازادیی و ئازادی بیروڕا بەتایبەتی بکات. هەڵبەت بیرکردنەوە لە ئەنجامدانی ئەم پرۆژەیە بۆ چەندین ساڵ پێشتر دەگەڕێتەوە، بەڵام سەرەنجام توانیمان لە ساڵی ٢٠١٠ ئەو بیرۆکەیە بکەینە واقیع و لە ٦ی شوباتی ئەو ساڵە، بۆیەکەمجار پەخشەکەی گەشت بە گوێی بیسەران. ئامانجی ئێمە لە دەستبردن بۆ پرۆژەیەکی وەها، ئەوەبوە کە هەمەچەشنیی بدەینە کاری میدیایی سنورەکە و بەتایبەت برەو بە میدیای ئازاد و ئەهلی بدەین، چونکە ناوچەکە بەگشتی لە سەردەمێکدا بو کە هەنگاوی دەنا بۆ کرانەوە و بەرەوپێشەوەچونی زیاتر، لەوەها دۆخێکیش دا بونی راگەیاندنی ئازاد بۆ روماڵی ئەم بەرەوپێشەوەچونە و ئەو ئاستەنگانەی دێنە رێی، زۆر گرنگ و پێویست بو. هەر ئەم هۆکارەیە وایلێمان کرد دەست بدەینە ئەم کارە، ئەگەرچی زەمینەی مادیی و دارایی بۆ پرۆژەکەش

بەئێستاشەوە هەر لەبار نیە، چونکە ئێمە هەر لە سەرەتای دەستپێکردنی پرۆژەکەوە بڕیارماندا هیچ کۆمەک و هاوکاریەکی مادیی لە حزب و حکومەت وەرنەگرین، بەڵکو تەنها پشت بە کۆمەکی خەڵکی ئازادیخواز و ریکلام و پرۆژەی ڕێکخراوە ناحکومی و ناحزبیەکان ببەستین، ئەمەش بۆ شوێنێکی وەکو گەرمیان کە دورە لە سەنتەرەوە «هەولێر و سلێمانی» قورس بو، بەڵام بە مکوڕبونی ستاف و هاوکارەکانمان و بە بەدەمەوەهاتنی خەڵکان و ڕێکخراوە ئازادیخوازەکان، توانیمان بەردەوام بین. کرۆکی چیرۆکی ئەم رادیۆیە، پێش هەر شتێک ئالەنگاریی و بەرەنگاربونەوەیە، چونکە رادیۆکە لەتەمەنێکی کەمەوە روبەڕوی شەپۆلێک لە ڕێگری و هێرش و داخستن بویەوە، تا گەیشت بە تالانکردنی. ئەمە سەرباری ئەوەی کە بە توانا و کەرەستەی زۆر ساکار و سەرەتایی دەست بەکاربوین، لە یەک ژوردا بە ستافێک گەنجی خۆبەخشەوە هەمو کارەکانمان رایی دەکرد، شەڕی دەرونی و هێرشی زارەکیی «دوژمنانی هەر هەولێکی ئازاد»یش لەولاوە بوەستێت. لەکاتێکدا گرەوی زۆر لەسەر ئەوەدەکرا کە ئەم پرۆژەیەش وەکو پرۆژە میدیایەکانی تر هەر چەند مانگ و لە باشترین حاڵدا چەند ساڵێک بەردەوام دەبێت، خۆشحاڵانە وا ئێستا مۆمی ١٠ ساڵەی تەمەنی دەکوژێنینەوە، هۆکاری ئەمەش بە پلەی یەکەم، خۆڕاگری ستافەکەی بو بەوەی سەرباری هەمو ئاستەنگێک، بەردەوام بون لە درێژەدان بەکاری رادیۆکە، چونکە لە بون و پێویستیی دەزگای راگەیاندنی ئازاد لە سنورەکەدا تێگەیشتون، بەتایبەتی کە تادێت دەزگا و هەوڵی میدیایی ئازاد لە سنورەکەدا کەم دەکات. ئەوەیشی زیاتر خۆشحاڵمان دەکات، ئەوەیە کە «دەنگ» تەنها وەکو رادیۆیەک نەماوەتەوە، بەڵکو وەکو دەزگایەکی میدیایی و زۆرجاریش کۆمەڵگەیی کاردەکات، بەوەی ئێستا ماڵپەڕ و رۆژنامە و یەکەی جیاوازی رۆژنامەوانی هەیە. وا ١٠ ساڵە رادیۆی دەنگ بە دروشمی «رادیۆیەکی ئازاد بۆ خزمەتی ئازادیی» بەردەوامە، لەگەڵ ئەوەشدا مێژوی کارکردنمان خاڵی نیە لە کەموکورتیی، وەکو هەر دەزگایەکی تر ئێمەش بەدڵنیاییەوە هەڵە و کەموکورتیی و هەندێکجاریش کەمتەرخەمییمان هەیە، تەنانەت زۆرجار کارەکانمان ناگات بەوەی خۆمان دەمانەوێت، بەڵام ئێستا کە میدیای ئازاد لە هەرێمی کوردستان زیاتر لەهەر کاتێک لە قەیران و کێشەی قوڵ دایە و شەڕی مانەوە و بەردەوامبون دەکات، بونی هەوڵێکی وەکو رادیۆکەی ئێمە، بۆخۆی دەستکەوت و مایەی خۆشحاڵیە، ئالەنگاریی سەرەکیشمان ئەوەیە: چۆن ئەم هەوڵە بەرەوپێشەوە ببەین؟ لەمەشیاندا کۆمەک و بەدەمەوەهاتنی خەڵکانی ئازادیخواز بەپێویست و گرنگ دەزانین. * بەڕێوبەری رادیۆی دەنگ لە کەلار

# شوێنەوارەکانی سنوری قەزای کەلار



نەوزاد عبداللطیف عبدالكريم

دۆزینەوەو بەڵگە شوێنەوارییەکانی قەزای کەلارو دەوروبەری ئەوە دەردەخەن کە مێژووی نیشتەجێبونی مرۆڤ لەم ناوچەیە بۆ هەزاران ساڵ پێش ئێستا دەگەڕێتەوە , وە کۆنترین شوێنەوار کە تا ئێستا لە ناوچەکە تۆمارکرابێت مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بەردینی نوێی پێش گلێنە سازی نزیکەی ٨٠٠٠ پ.ز ,هەرچەندە گەڕان و ڕووپێوی شوێنەواریی چ لەساڵانی ١٩٧٠ کان و هەوەها لەم ساڵانەی دواییدا کەلەلایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان و تیمە بیانییەکان ئەنجامدراون هێشتا بە چڕی سەرنجیان نەخستۆتە سەر قەزای کەلار کە ئەگەر وەکو ئەو سنورە جوگرافیایەی ئێستا وەری بگرین کە هەرسێ ناحیەی ( ڕزگاری و شێخ تەویل و پیباز) دەگرێتەوە , بەڵام بەشی ڕۆژهەڵاتی کەلار بە تایبەتیتر کەناری ڕۆژئاوای ڕووباری سیروان کۆمەڵێک شوێنەواری تێدا دیاریکراوە و تۆمارکراوە , لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێک شوێنەواری بەرچاوی ناوەندی قەزاکە لە مێژەوە ناسراون و دیاری کراون وەکو شوێنەواری جۆگەی گاوری و قەڵای شێروانە و کۆشکی مەحمود پاشا... وە هەروەها کۆمەڵێک شوێنەواری گرنگ و دەگمەنی تر هەبوون لە ناوەندی شاری کەلار کە

بەداخەوە بەتەواوی لەناوچوون یاخود بوون بە ژێر بیناو پرۆژەکانی حکومەت و خەڵکەوە کە چیتر ئەستەمە دووبارە کاریان تێدا بکریتەوە لە نمونەی ئەوانەش دوو شوێنەواری سەردەمی ساسانیەکان (٢٢٦ز- ٦٥١ ز ) کە لە ئێستادا نەخۆشخانەی گەرمیان و پارکی شاری یاری کەلاریان لەسەر دروستکراوە, هەروەها شوێنەوارێکی تری زۆر گرنگ هەبوو لە ناوەڕاستی بازاڕ کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی کاشیەکان (١٥٩٥پ.ز_١١٥٧پ.ز) کە لە کاتی دووبارە بیناکردنەوەی شوێنەکەدا شوێنەوارەکە دەرکەوت و لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیانەوە کنەوپشکنینێکی سەرەتایی تێدا کرا بۆ ڕزگاردنی شوێنەوارەکەو تۆمارکردنی پاشماوە دەرکەوتوەکان وە توانرا و سەردەمە مێژوویەکەی دیاری بکرێت . لەم ڕاپۆرتەدا هەوڵدەدەین زۆر بە کورتی ئاماژە بەو شوێنە شوێنەوارییانە بدەین کە دەکەونە سنوری قەزای کەلار بە پێ ئەو بەڵگە شوێنەواریی و زانیاریانەی تا ئێستا تۆمارکراون ,کە ئەگەر هەریەک لەم شوێنانە کاری کنەوپشکنینی تێدابکرێت ئەوا پێوستی بە ڕاپۆرتی تایبەت دەبێت بەڵام ئێمە لێرە بە کورتی دەیانناسێنین .

شوێنەواری گردی ڕەحیم : دەکەوێتە ناحیەی ڕزگاری لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان لە ساڵی ٢٠١٢ بۆ ماوەی یەک وەرز و لەسەر ڕووبەرێکی ١٠م*٥م کاری کنەوپشکنینی تێدا ئەنجامدرا , ئەم شوێنەوارە بە یەکێک لە شوێنەوارو گرنگ و دەگمەنەکانی ناوچەکە دادەنرێت و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شارستانی حەلەف ( ٤٩٠٠-٤٥٠٠پ.ز) بەشی هەر زۆری پاشماوەکانی بریتی بوون لە پارچە بەردی شێوە چەقۆیی و پارچە گۆزەی ڕەنگاوڕەنگ و کە بەشی هەرە زۆریان نەخشی ئەندازەییان لەسەر کرابوو (بڕوانە وێنەی ژمارە ١)



وێنەی ژمارە ١: شوێنەواری گردی ڕەحیم و هەندێک لە پاشماوە شوێنەوارییەکانی

گردی شێروانە : بریتی یە لە گردێکی زۆر گەورەو فراوان کە قەڵای شێروانەی لەسەر دروستکراوە ئەم گردە بەپێی ئەو پاشماوە شوێنەوارییانەی وەکو ( پارچە گۆزەو و بەردوو ئەو پاشماوە شوێنەوارییانەی کە بە ڕێکەوت  دەرکەوتون ) ئەوە دەردەخات کە بۆ هەزاران ساڵ ژیانی تێدا بەردەوام  بووە لە چاخی بەردینی نوێ وە تا سەردەمی کۆتایی ئیسلامی , لە ساڵی ١٩٨٨ لەلایەن مۆزەخانەی بەغدادەوە هەڵکۆڵینی شوێنەواریی لە بەشی ڕۆژهەڵاتی گردەکە ئەنجامداوە بەڵام تا ئێستا هیچ ڕاپۆرتێکی بڵاوکراوە دەربارەی ئەم هەڵکۆڵینە بەردەست نیە , بەڵام چەند جارێک بە ڕێکەوت لە کاتی باران بارینی زۆر و داخورانی خۆڵی سەرگردەکە چەند پاشماوەیەکی گرنگ دەرکەوتون وەکو تابوتێکی شێوە هێلکەیی سەردەمی ئەشکانیەکان ١٢٦پ.ز ٢٢٦ ز ) (بڕوانە وێنەی ژمارە (٢)    وە دەرکەوتنی کۆمەڵێک پاشماوەی گۆزەو پەرداخی سەردەمی بابلی کۆن  (٢٠٠٠پ.ز ١٥٩٥ پ.ز ) و گۆزەیەکی گەورەی خەزن کردنی دانەویڵەی سەردەمی ساسانیەکان (٢٢٦پ.ز ) هەروەها پاشماوەی شوێنەواری سەردەمی کاشیەکان(١٥٩٥پ.ز –١١٥٧پ.ز



وێنەی ژمارە ٢ : تابوتێکی گڵێنەی شێوە هێلکەیی کە ئێسکە پەیکەرێک و هەندێ پارچەی جوانکاری لە زێڕدراوستکراوی تێدابوو

شوێنەواری جۆگەی گاوری : , ئەم شوێنەوارە  بریتیە لە پاشماوەی کەناڵێکی گرنگی ئاودێری کە ئاوی لە ڕووباری سیراوانەوە گواستۆتەوە بەناو گەڕەکی سەرکەوتنی ئێستادا تێدەپەڕێت و بە هێڵێکی ڕاست دەڕوات تا ڕۆژئاوای گردەگۆزینەوە لەوێشەوە بۆ ناوچەی ئاوبارەی سەر بەناحیەی کۆکز ,کە ڕەنگە ناوی (ئاوبارە) ش هەر لەوە هاتبێت چونکە ئەم جۆگەیە ئاوی لە سیروانەوە هێناوە بۆ ناوچەی ئاوبارە , ئەم کەناڵە ئاودێری یە ڕەنگە درێژترین کەناڵی ئاودێری کۆن بێت لە هەموو کوردستاندا چونکە هەتا ساڵی ١٩٧٠ کانیش لەسەر نەخشەی

کۆرۆنا دەتوانرێت بناغەکەی بە ئاسانی ببینرێت بە درێژایی نزیکەی ٤٠ کم , بەڵام لە ئێستادا پاشماوەی بینای کەناڵەکە تەنها لەسێ شوێن دەبینرێت لەسەر ڕووباری سیروان و گەڕەکی سەرکەوتن و هەروەها لە باکوری ڕۆژئاوای گردەگۆزینەوە (بڕوانە وێنەی ژمارە ٣) .مێژووی ئەم کەناڵە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ساسانیەکان (٢٢٦ز _٦٥١ز)



وێنەی ژمارە ٣: شوێنەواری جۆگەی گاوری لە سەر نەخشەی کۆرۆنای ساڵی ١٩٦٩

شوێنەواری پەیکولی : ئەم شوێنەوارە دەکەوێتە گوندی بەرکەل و سەر بە ناحیەی شێخ تەویلە, شوێنەوارەکە بریتی یە لە پاشماوەی بینایەکی سەردەمی ساسانیەکان و شێوەیەکی چوارگۆشەیی هەبووە لە بەردی داتاشراوی ڕێک دروستکراوە , مێژووی دروستکردنەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پاشا (نرسی ٢٩٢ز_٣٠٣ ز ) ئەم شوێنە وەکو یادگارییەک دروستکراوە بۆ تاج لەسەر نانی پاشا نرسی دوای ئەوەی سەرکەوتنی بەدەستهێنا بۆ گرتنەدەستی تەختی شاهانەی ساسانی , هەروەها پەیکەری پاشا نرسی لە ناو دیواری هەرچوارلای بیناکەدا دانراوە لەگەڵ هەندێک نوسین بە زمانی پەهلەوی کە نوسینەکان باس لەڕووداو کێشەکانی ئەو کاتە دەکات , لە ئێستادا تیمێکی ئیتاڵی کاری تۆمارکردن و کۆکردنەوەی هەموو پاشماوە بەجێماوەکانی شوێنەوارەکە دەکەن و بەشێکی زۆری بەردە داتاشرا و نوسراوە هەڵکۆڵدراوەکان لە مۆزەخانەی سلێمانی پارێزراون . (بڕوانە وێنەی ژمارە ٤)



وێنەی ژمارە ٤ : پاشماوەی شوێنەواری پەیکوڵی لەگەڵ وێنەیەکی خەیاڵی کە شێوەی بیناکە پیشلن دەدات  لە پێش ڕووخانیدا

قەڵا خان وەردە  : بریتی یە لە گردێکی گەورەو فراوان لە ناوەڕاستی گوندی تازەدێ دایە , مێژووی گردەکە بۆ چەند سەردەمێکی جیاواز دەگەڕێتەوە بە پێی ئەو پاشماوە شوێنەواریانەی کە دۆزراونەتەوە لەسەر گردەکە  دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بەردینی نوێ و هەروەها پاشماوەی سەردەمی ساسانی یەکانیشی تێدا دۆزراوەتەوە , لەبەشی سەرەوەی گردەکەش بناغەی بیناسازی سەردەمی عوسمانیەکان دەبینرێت .

پاشماوەی بینایەکی ساسانیەکان :ئەم شوێنەوارە دەکەوێتە گوندی بەردەسوری سەروو  و بریتی لە پاشماوەی بینایەکی شێوە چوار گۆشەیی کە لە شێوەی قەڵایەک دەچێت هەتا ساڵانی ١٩٧٠ ش پاشماوەی بناغەکەی لەسەر وێنەی سەتەلایتی کۆرۆنا دەبینرێت بەڵام لەم چەند ساڵەی دواییدا بە هۆی کشتوکاڵ کردنەوە شوێنەوارەکە  تەخت کراوە لەگەڵ زەوی یەکەی دەوروبەریدا .

 گردی بازاڕ: بریتی یە لە شوێنەوارێکی گرنگی سەردەمی کاشیەکان کە مێژوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ١١٩٥پ.ز -١١٥٧ پ.ز , دەکەوێتە ناوەڕاستی بازاڕ و شوێنەوارەکە بەڕێکەوت لە کاتی بیناکردنەوەی دوکانێکدا دەرکەوت ,پاشماوەکانیش بریتی بوون  لەچەندین جۆری گلێنەو بەردوو گۆڕ (بڕوانە وێنەی ژمارە (٥)) بەڵام بەشی هەرەزۆری شوێنەوارەکە لە ئێستا لە ژێر دووکان و بیناکانی ناو بازاڕدایە .



وێنەی ژمارە(٥) : شوێنەواری گردی بازاڕو نمونەی گلێنەکانی شوێنەوارەکە

گۆڕەکانی بەرلوت : لە گوندی بەرلوت لەسەر هەندێ لە گردو تەپۆلکەکانی ئەم ناوچەیە کۆمەڵێک شوێنەوار بە ڕێکەوت دەرکەوتوون کە بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان کنەوپشکنینی سەرەتایی تێدا کردوە بە مەبەستی ڕزگارکردنیان لە تێکدان ولەناوچوون ئەم شوێنەوارانەش بریتین لە دوو گۆڕی گلێنەیی شێوە هێلکەیی,بە گوێرەی ئەو پاشماوەو کەلوپەلانەی کە لە ناو گۆڕەکاندا دۆزراونەتەوە زیاتر لە گۆڕی ژن و مێردێک دەچێت کە بریتین لە کلدانی چاو و مۆرو کەمەربەند , مێژوویی ئەم دوو گۆڕە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەشکانیەکان ١٢٦پ.ز -٢٢٦پ.ز .

گردی یەغنی : گردێکی گەورەو فراوانەو دەکەوێتە ڕۆژئاوی شاری کەلار لە ناو گوندی سەید خەلیل دایە , تا ئێستا هیچ کنەوپشکنینێکی تێدا ئەنجام نەدراوە بەڵام بە پێی لێکۆڵینەوە سەرەتاییەکان مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەشکانی و ساسانی , بەشی سەرەوەی گردەکە لە ساڵانی ١٩٩٠کان بە خراپی تێکدراوە بەهۆی گەڕانی نایاسایی بەدوای شوێنەواردا .

گردی گردەگۆزینە : گردێکی گەورەو فراوانەو تا ئێستا هیچ کنەوشکنینێکی تێدا ئەنجام نەدراوە , بەڵام بە پێی ئەو پاشماوە شوێنەوارییانەی لەسەر گردەکە کۆکراونەتەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی چاخی پێش گلێنە سازی ٨٠٠٠پ.ز وە هەوەها ئەم نیشینگەیە لە سەردەمی ساسانی و هەروەها لەسەردەمی ئیسلامی یشدا دووبارە بەکارهێنراوەتەوە , شوێنەوارەکە بە خراپی زیانی پێگەیشتوە بەهۆی چالاکی سەربازی و هەوەها چەند جاریکیش بە شێوەی نایاسایی چاڵی تێدا کراوە بۆ گەڕان بە دوای شوێنەواردا .

قولەکانی نێوان کەلار- دەربەندیخان : قولەکان کە ژمارەیان نزیکەی (١٤) قولە دەبێت ولە دوو نهۆم پێکدێن و نهۆمی خوارەوەیان شێوە بانەیی و نهۆمی دووەمیان شێوە لولەکی یە و بۆ مەبەستی چاودێری دروستکراون و بەشی هەرە زۆریان دەکەونە کەناری ڕۆژئاوای ڕووباری سیروان , هەندێکیان بە تەواوی ڕووخاون تەنها بناغەکانیان ماوە بەڵام تا ئێستا (٣ )سێ لە

قولەکان لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان نۆژەنکراوەتەوە ,مێژووی دروستکردنی ئەم قولانە دەگەڕێتەوە بۆ سەردمی عوسمانیەکان بەڵام بە تەواوی ڕوون نی یە لە چ ساڵێکدا دروستکراون ( هەر لەم کتێبەدا ڕاپۆرتێکی تایبەت لەسەر قولەکان نووسراوە )
کۆشکی مەحمود پاشا : ئەم کۆشکە دەکەوێتە گوندی تازەدێ و لەسەر کەناری ڕۆژئاوای ڕووباری سیرواندایە کۆشکەکە لە دوو نهۆم پێکدێت و مێژووی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٨٧٤-١٨٨٢ ز لەلایەن مەحمود پاشای جاف کوڕی دروستکراوە .( بڕوانە وێنەی ژمارە ٦)



وێنەی ژمارە ٦ : کۆشکی مەحمود پاشای جاف لە گوندی تازەدێ

قەڵای شیروانە : شوێنەوارێکی ناسراو و بەناوبانگی ناوچەی گەرمیان و کوردستانە, قەڵاکە لە ژێرزەمینێک و دوونهۆم و ژوورێکی هەشت لا پێکهاتوە , بە پێی زۆرێک لەسەرچاوەکان مێژووی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٨٦٦ز -١٨٧٤ز و لەلایەن محەمەد پاشای جاف دروستکراوە .

ئارامگاکانی سەید خەلیل : ئەم گۆڕستانە دەکەوێتە گوندی سەید خەلیل , بە شێوازێکی بیناسازی تایبەت دروستکراون . بیناکان خویان لە دووشێواز دەبیننەوە وەک ئارامگای تاکە کەسی و ئارامگای خیزانی کە پیکدیێن لە زیاتر لە ژورێک, ڕووی سەرەوەیان بە پشتێن و گومەدی نیوە بازنەیی تەواوکراون بە نەخش زەخرەفە دیوار و تاق و گومەزەکەیانیان ڕازێنراوەتەوە , بەشییێکی زۆری ئەم گۆڕانە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم . (بڕوانە وێنەی ژمارە ٧)



وێنەی ژمارە( ٧ ) ئارامگاکانی سەید خەلیل

هەروەها هەندێک شوێنەواری تر هەن کە بەم دوایانە تۆمارکراون و دەرکەوتون , لە گوندی بەردەسور لە کاتی فراوانکردنی ڕێگای سەرەکی لە لێواری شەقامەکەدا کۆمەڵێک پاشماوەی شوێنەواری دەرکەوتن وەک گۆزەو مورو و سەرەتیر (بڕوانە وێنەی ژمارە ٨ ) کە پێدەچێت مێژوویان بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی بنەماڵەی سێ یەمی سۆمەری (٢٩٠٠پ.ز ٢٨٠٠پ.ز) هەروەها دوو شوێنەواری تر لە کەناری ڕۆژئاوای ڕووباری سیروان دەرکەوتن کە یەکێک لەوانە پێدەچێت کۆنترین شوێنەواری ناوچەکە بێت چونکە کۆمەڵێک پاشماوەی بەردینی تێدا دۆزراوەتەوە(بڕوانە وێنەی ژمارە(٩) ) کە ئاماژە بە نیشینگەیەکی زۆر کۆن دەکەن کە پێدەچێت مێژووی شوێنەکە بگەڕێتەوە بۆ چاخی بەردینی نوێی پێش گلێنەسازی ٨٠٠٠ پ.ز , بەڵام شوێنەوارەکە پێویستی بە کاری لێکۆڵینەوەو پشکنینی زیاتری هەیە , هەروەها لەم دواییانە لە نزیک گوندی تازەدێ شوێنەواری گۆڕستانێکی کۆن دۆزرایەوە کە ڕەنگە مێژوەکەی بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (ساسانی یاخود ئەشکانیەکان ) , هەر لەسەر کەناری ڕووباری سیروان لە گوندی بەردەسور بە هۆی پرۆژەیەکەوە شوێنەواریی گۆڕستانێکی تری سەردەمی ساسانیەکان دەرکەوت .



وێنەی ژمارە ٨ : پاشماوە شوێنەوارییەکانی گوندی بەردەسور کە لە کاتی فراوانکردنی شەقامەکەدا دەرکەوتن



وێنەی ژمارە ٩ : کۆمەڵێک ئامێری لە بەرد دروستکراو کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی ٨٠٠٠پ.ز

لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێک شوێنەواری تر لە قەزای کەلار هەن کە تەنها ناوی شوێنەکەیان تۆمارکراوەو هیچ زانیاریەک لەسەر سەردەم وشوێنەکانیان تۆمار نەکراوە وەکو شوێنەوارەکانی : تەپە سەوز و تەپە بەراز و تەپە زەردو و کانی چایلەو تەپە زەماونگەو قەڵا تۆپزان و گردی ئەشکان و گردە کارێزەو گردی قاسم ئاغا و گردە ڕەش .

سەرچاوەکان


١- ڕووپێوی شوێنەواری عێراقی ساڵی ١٩٧٠ .

٢- ڕووپێوی شوێنەواریی پرۆژەی ناوچەی سیروان ٢٠١٢ بۆ ٢٠١٩.

٣- محمد علی کریم: ڕێبەری شوینەوارەکانی گەرمیان , ٢٠١٠ز.

# شارۆچکەی کەلار شاری وەفا و میهرەبانی



د. تارا عبدالله سعید

ناوی شارۆچکەی کەلارە، بەڵام گەورەترین شاری وەفا و میهرەبانییە، کەلار شارێکی جوانە، خاوێنە و دلگیرە، بێگومان ئەم سیفەتانە، ڕەنگدانەوەی خەڵکەکەیەتی.

من لە هەندەران بوم، کاتێک بەشی کوردی لە کەلاری خۆشەویست کرایەوە، هیچ زانیارییەکم لە سەری نەبو، بەڵام دوای گەڕانەوەم بە یەک دوو مانگ، ڕۆژێک ژمارەیەکی نەناسراو پەیوەندی پێوەکردم و وتی: مامۆستا لەوانەیە تۆ منت بە بیر نەیەتەوە بەڵام من خوێندکارێکی خۆتم، کە لە هەولێر لە زانکۆی سەلاحەدین، یەکەم خول وانەت پێوتن، من یەکێک بوم لەوانە، ناوم(دارا حەمید)ە و ئێستا پاش تەواوکردنی خوێندنی دکتۆرا، بوم بە سەرۆکی بەشی کوردی، پێم خۆشە وانەی وەرگێران و زمانەوانیمان بۆ بڵێیتەوە؟

منیش، لەگەڵ ئەوەشدا کە بیستبووم ڕێگای کەلار زۆر سەخت و پڕ لە ڕووداوی هاتوچۆیە، بەڵام لەبەر بەوەفایی و ئەدەبی(دکتۆر دارا) نەمتوانی بڵێم ناتوانم، یەکسەر وتم بە سەرچاو و بە خۆشحاڵیەوە ڕەزامەندیم پیشاندا، بۆ یەکەمجار بو کە ئەو شارۆچکەیە ببینم، بەڵام کە گەشتمە شارۆچکەکە یەکسەر دڵم کرایەوە، شارێکی جوان

و گەورەی پڕ میهرەبانی بو، بۆیە سەردانەکانم بۆ چەند ساڵێک بەردەوام بو. سوێند ئەخۆم کە بەدرێژایی ئەو چەند ساڵە، تەنانەت بۆ ساتێکیش دڵگران و ناڕەحەت نەبوم.

مامۆستا و فەرمانبەر و شۆفێر و دوکاندار ...هتد، هەموو دڵپاک و هەردەم دەم بە خەندەن لە گەڵ هەموو میوانێک، بەڵام ئەوەی زیاتر سەرنجمی ڕاکێشا ئەوە بو کە خەڵکی ئەم شارە جوانە ڕێزی زۆر تایبەتیان هەیە بۆ خەڵکی سلێمانی، بە ڕادەیەک کە ئەگەر خەڵکی کەلار هەموو ئەوروپایان دیبێت و سلێمانیان نەدیبێت، وای لە قەڵەم ئەدەن کە هیچ شوێنێکیان نەدیوە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا وای لە من کرد کە زیاتر پەیوەست بم بە خاک و خەڵکی ئەم شارەوە. ئێستاش هەرچەند بۆ وانە وتنەوە نایەم بۆ کەلار، چونکە سوپاس بۆ خوا گەنجە خوێن گەرمەکانیان بون بە خاوەنی بڕوانامەی بەرز و خۆیان پێویستی زانکۆی گەرمیانیان پڕ کردۆتەوە، بەڵام من هەمیشە بیری کەلار ئەکەم و حەز ئەکەم لە کانگای دڵمەوە کە بەشداری لە هەموو کۆنفرانسە زانستیەکان و بۆنە خۆشەکانیاندا بکەم.

لە کۆتاییدا هیوادارم ئەم شارە و زانکۆکەی، هەردەم لە گەشانەوە و سەرکەوتندا بن، دوعام لە خوای گەورە ئەوەیە هەموویان تەمەن درێژ وسەرکەوتوبن.



# کەلار،
# هەناسەی تاسەی گەرمیان

موحەممەد ڕەشیدی ئەمینی

ناوچەی گەرمیان لە چەند ڕوانگەوە نەک هەر بۆ من، بۆ هەر کوردێکی دڵسۆزی وڵات و نیشتیمان جێگای ڕێز و خۆشەویستییە.

ئەگەر بێت و تەواوی ئەو لایەنانە بخەینە بەرچاو، ئەوە کات و زەمەنێکی زۆری پێویستە، لە کاتێکی ئاوادا ناتوانین سەرجەم ئەو شتانە باس بکرێن، هەر بۆ ئەوەی لێرەدابە شێوەیەکی کورت ئاماژە بە چەند بابەتێکی سەرەکی دەکەم، یەکێ لەو بابەتانەش کە ئەبێ هەموو کوردێکی دڵسۆزی وڵات و نیشتیمان سەری ڕێزی لە بەردا دانەوێنێت، بابەتی خۆڕاگری و بەرگری و خۆفیداکردنە لە پێناوی نیشتیمان و بەربەرە کانییە لەگەڵ گەورەترین جینایەتکاری مێژووی کوردەواری، جریانی ئەنفال و کۆمەڵکوژی بۆ لە ناوبردنی نەتەوەیەک، کە ئەوەش بووەتە سونبولێکی خۆڕاگری بۆ سەرتاسەریی وڵاتی کوردەواری و هەرگیز لەبیر ناچێت.

بابەتێکی دیکە کە جێگای ئاماژەیە، ناوچەی گەرمیان مەڵبەندی فەرهەنگ و هونەری ڕەسەنی کوردی بووە، کێ دەتوانێت کاتێ چریکەی مەقاماتی گەرمیان دێتە بەر گوێی، دڵی ڕانەچڵەکێ و مێشکی نەکاتە مەکۆی چریکەی گەرمێن، هەر ئەم ئاواز

و مۆسیقایە بەشێکی گەورەی لە ئاوازی ڕەسەنی کوردی لەخۆ گرتووە و جێگای ڕێز و خۆشەویستی هەموانە.
یەکێتر لەو بابەتانەی کە جێگای باس و لێکدانەوەیە، بابەتی فەرهەنگ و ئەدەبی نەتەوەیە، کە هەر لە دێر زەمەنەوە ناوچەی گەرمیان مەکۆی شاعیران و ئەدیبانی پایەبەرز و بەناوبانگی کوردەواری بوون، کە بەشێکی هەرەزۆری ئەو ئەدیبانە دەچنەوە سەر ئەدەبی گۆران یان ماچۆ کە سەرقافڵەی ئەدەبی کوردی بووە، بۆ ئەوەش باوەڕت بەم بۆچوونە هەبێت، سەیرێکی کتێبی مێژووی شیعر و شاعیرانی گەرمیان کە بە تێکۆشان و کۆکردنەوە و نووسینەوەی نووسەری پایەبەرز کاک ساڵح هەلاج بکەن، کە نزیک بە (٧٤) شاعیری هێناوە کە زۆربەیان کەوتبوونە پارگێنی لەبیرچوونەوە.

## چۆنیەتی پەیوەندیم لەگەڵ بەڕێزان و دۆستانی کەلار:

با تەوەجو بە ئەوەی ئێمە لە ناوچەی هەورامانی ڕۆژهەڵات دەژین؛ زیاتر هەنگاوە ئەدەبییەکانمان لەسەر ئەدەبی گۆران یان هەورامی بووە، هەروا لە سەریشەوە ئاماژەم پێکرد، شاخەیە لەم ئەدەبە هەر لە کۆنەوە لە ناوچەی گەرمیاندا هەر لە کۆنەوە وێردی زمانی شاعیران و ئەدیبانی ئەو ناوچەیە بووە و بەرهەمی باشی بە پێستیان هێناوەتە ئاراوە، ئەوە لەلایەکەوە هانی ئەدام کە زیاتر پەیوەندی ئەدەبی لەگەڵ ئەم ناوچەیەدا بگرم، لەلایەتریشەوە هەر لە کۆنەوە لە دەمی بە ساڵاچووانی لای خۆمان ئەوەیان پات ئەکردەوە، کە مەڵبەندی گەرمیان هەر لە باوەنوورەوە تا کەلار و کفری، لە ڕابردوودا زێدی دووهەمی ئێمە بووە، ئاخۆ ئێمە وەک تیرەی جاف لە کاتی خۆیدا کۆچەر بووین و لە زستانانداندا لە ناوچەی گەرمیان ژیاوین و لە تاوسانانیشدا دەچووین بۆ بەرزاییەکانی شاهۆ.
هەر بەم بۆنەیەوە هەستێکی دەروونی هەردەم هانی ئەوەی دەدام کە پەیوەندییەکانم لەگەڵ دانیشتوانی ئەم ناوچەیەدا بگرم و بە تێروتەسەلی لەم ناوانەدا بگەڕێم و بزانم باب و باپیرانمان لێرەدا چۆن ژیاون. ئەو دالغە و خەیاڵاتەم هەروا مایەوە تا ساڵی (٢٠٠٩) لە بەرنامەیەکی مەڵبەندی ڕۆشنبیریی هەورامان لەگەڵ چەند کەس لە نووسەران و ڕووناکبیرانی ناوچەی کەلار و کفری ئاشنا بووم، یەکێ لەو بەڕێزانە کاک ساڵح هەلاج بوو کە بە ئاشناییم لەگەڵ ئەم بەڕێزە و کاک شوکری حەمەی هەیەر لە کفری و مامۆستا شوکر خەیات لە کەرکووک، بە شانازییەوە هەر ئەو ناسینە بوو بە هۆی ئەوەی کە من لەگەڵ

بەڕێزانی تری ناوچەی کەلار زیاتر پەیوەندیمان هەبێت و هەتا لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانیان بەشداری بکەم، ئێستایش بەوەی شانازیی دەکەم کە دۆستانێکی دیکەی زۆر خۆشەوستم لە کەلار و کفری و کەرکووک پەیدا کردووە، هەتا ئەو پەیوەندییە بووەتە پەیوەندییەکی دوولایەنە و زۆریّ لەو ئازیزانە منیان سەربەرز کردووە و بە هاتنیان بۆ هەورامان و شاری پاوە و بەشدارییان لە کۆڕ و کۆبوونەوەی فەرهەنگی و سەردانی شوێنەوارە دێرینەکانی هەورامان وەک کەسانێکی ڕووناکبیر جێگای شانازیی بووە بۆ ئێمە.

لە کەناری ئەمانەیشدا لەگەڵ برای بەڕێزم کاک کاروان عوسمان خەیات، لاوی تێکۆشەر و ڕووناکبیر و نووسەری بە توانا، لەبەر ئەوەی ئیشی هەردووومان کۆکردنەوەی نوسخە خەتییە کۆنەکانی ئەدەبی کوردی بوو، پێکەوە دەستمان کرد بە ئیشوکار و چەند کتێبمان پێکەوە بازنووسی و چاپمان کردوون و ئێستایش بەردەوامین لەو ئەرکە فەرهەنگیانە.

بەڕاستی جیا لە پەیوەندیی فەرهەنگی و ئەدەبی، هەرکاتێ سەردانی ئەم ناوچەیە دەکەم وا دەزانم بەشێکی ونبووی خۆمم لێرەدا دۆزیوەتەوە و هەستێکی خۆشەویستی یەکجار زۆرم بۆ ناوچەی گەرمیان هەیە، ئەوەیش نەک تەنیا بە قسە بێت، لەنێو شیعر و نووسینەکانمدا ئەو بابەتەیش ڕەنگیان داوەتەوە، چەند پارچە شیعرێکم لەسەر ناوچەی گەرمیان لە ساڵەکانی (٢٠١٠-٢٠١٣) داناوە، هەر بۆیە هەتا ئێستا ئەوەندە شیعرم لەسەر هەورامانیش دانەناوە، ئەوەیش لە هۆکاری خۆشەویستیمە بۆ ئەم ناوچەیە. بۆ ئەوەی زیاتر لە کاتی ئازیزان نەگرم بە خوێندنەوەی پارچەیە لەو شیعرانە قەناعەت دەکەم و هیوادارم جێگای ڕەزامەندی دانیشتوانی ئازیز بێت.

## سۆزی گەرمێن

کە هەوێنی هەستی بە تین
لە پێدەشتی گەرمێنەوە
لێم بە دەرکەوت
گڵپەی دەروون
وەک بڵێسەی گڕی سووری
دڵی ماندووی کوردستانم

له پێ بناری باباگوڕگوڕ
خۆی بەدەر خست
..........
هەڵدەسووڕام لەو هەوارەی
کە وا هێشتا
دەنگی ئەسپی شۆڕەسوارانم دێتە گوێ
کە وا ئێستاش بە کەلەپچەی خۆشەویستی
نیشتیمانم لە دەس بەندن
هەتا تێگەن ئەوانەی وا
ڕەوتی ژینگەی سالانی دوورم ون دەکەن
چەندە گەمژەن
وا دەزانن بە خەونێک و
تیشکی ڕقێ ئەتوێمەوە
............
با بۆت بڵێم لە کەونارم
هەر لەو دەمەی خۆم ناسیوە
لەگەڵ ژان و ئێش و ئازار
کە وا هەردەم
لەسەر پەنجەی جەوری زەمەن
لێمی ئالا بوو
دوورپەرێز و نەناسراو نیم
ساڵەهایە من ڕاهاتووم
لە سێبەری دالی سەرگەڕ
کە وا هەردەم هەڵدەسووڕا
بۆ کەلاکی لەشی ماندووی لە ڕەو جێماو
لەبیر ناکەم
هەرچەند لەوەی

زیاتر لەسەر لەتلەتم کەن
بە ژاراوی چاوچنۆکی بمتاسێنن
یان لە سارای چۆڵی دەوار
بە فەرتەنەی کۆمەڵکوژی
چاوەکانم لێ وەرگەڕێن
ئەمن هاوڕێی تاشەبەردی
شاخ و هەردم ناتوێمەوە
..............
من بە چریکەی ئەویندار خۆشەویستی
گۆش کراوم
گەر لە شاخ بم یا لە بناری
لەنێو سنگی سۆزی گەرمێن
بە دەم کرکەی
قەتارێک و ئەڵاوەیسی
کە بە هەنۆی دواهەناسەی
عەلی مەردان
هاوڕێ لەگەڵ دڵۆپەی ئاوێ
وا بە قوڵپەی چاوەکانی شوکر خەیات
لە پیدەشتی ئەو هەوارەی
شۆڕشێکی خستە نێو باغچەی گوڵان
بولبولێکی دەمبەیانی
بەری ڕەنجی لێو بە تاسەی
ئەم سەردەمەی هێنایە گۆ و
لە پیدەشتی نەوبەهاری دەخولایەوە
چەپک چەپک بۆنی خۆشەویستی هەڵدەمژی و
باوەش باوەش خەمی دەوران
بە دەم سرووەی بەیانەوە ئەدا بە با

................

هەتا تێگەن ئەوانەی وا

لە تۆڕداوی جاڵجاڵۆکەی ژاری زەمەن

چاوەڕوانی لاشەم ئەکەن

نەزانکار و خۆپەرەستن

سەد ئەوەندەش کەوتەکار بم

چریکەی گەرۆی دەشت و شاخم

وەک سوورێکی ئیسرافیلە

کە هاتە گوێم

هەڵدەسمەوە لەسەر پێی خۆم

ڕادەوەستم

تەنها لە بۆ ئەم خاکەیە سەردادەنێم

تەنها لە بۆ ئەم خاکەیە سەردادەنێم

ناوچەی گەرمێن ١٣٨٩/٢/١٢



# کەلارو ئەزموونی یەکەمین گۆڤاری پەروەردەیی لەسەر ئاستی کوردستان.

ئامادەکردنی : ساڵح حسین میروەیس

شاری کەلار لەچاوی مێژووی دامەزراندنی و پشتگوێ خستن و گرنگی پێ نەدانی لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بەهۆی ئەوەی کە ڕژێمی بەعس بە لانکەی شۆرش و پێشمەرگەی دەزانی و خۆشی هەر بەحەقیقەت لانکەی شۆڕش و پێشمەرگە بوو , بەلام ئەم شارە بەهۆی وشیاری و ئازایی خەڵکەکەیەوە لەزەمەنی بەعسەوە تاکو دروستبوونی حکومەتی خۆمالای توانیویەتی لەهەموو عێراقدا بناسرێت و ناو و ناوبانگی خۆی هەبێت و ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر و باشتر بناسرێت , بەهۆی هەڵکەوتەیی باشی جوگرافی شارەکەوە, کە لەنزیکە لەبەغدادی پایتەختی عێراق, و هەولێری پایتەختی کوردستان, ساڵانێکە شاری کەلار گەشیەکی زۆر باشی کردەوە, وبەتایبەت بریاری ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێم, کە وەک ئیدارەیەکی سەربەخۆ, ولەهەمان کاتدا وەک پارێزگایەکی رانەگەیەندراو بەناوی ( ئیدارەی گەرمیان ) لەساڵی ٢٠٠٨ وە مامەڵەی لەگەڵا دەکرێت کە شاری کەلار بۆتە سەنتەری پارێزگایی ئایندەی گەرمیان .

زەمەنێک بوو بیرم لەدەرکردنی گۆڤاریکی تایبەت بەبواری پەروەردە و رۆشنبیری پەروەردەیی دەکردەوە، بەڵام هەرجارەو لەبەر هەلومەرج و هۆکارگەلێک تایبەت بەدەرکردنی گۆڤارەکەم بۆ کاتێکی گونجاو تردوادەخست, لەم رونگەیەوە کەدەکردنی گۆڤارێکی تایبەت بە رۆشنبیری پەروەردەیی کارێکی ئاسان نییە , بەڵام خۆشبەختانە ئەمجارەیان و دوای ڕاویژکردن بەژمارەیەک ڕۆشنبیر و نوسەرو رۆژنامەنووسی هاورێم

بەتایبەت مامۆستا و رۆژنامەنووس ( لاوان ئەحمەد ) کەهاندەر و ,پشتیوانیەکی باشیان لەم پرۆژەیە کرد, بۆیە منیش پشت ئەستور بەو پشتیوانی و هاندانەی ئەوان, پشت بەخوا بڕیارمدا یەکەم ژمارەی گۆڤاری ( ڕوانیین ) بخەمە بەر دیدەی خوێنەران و رۆشنبیران, بەتایبەت مامۆستایان و شارەزایانی بواری پەروەردەو فێرکردن , بەوئومێدەی توانیبێتم مەلۆیەک بخەمە سەر خەرمانی خزمەتگەیاندن بە کایەکی گرنگ و هەستیاری وەک پەروەردەو فێرکردن .لەلایەکی ترەوە ٢٢ ساڵ ئەزموونی کارکردنم لە نێو کایەی پەوەردە و نزیکەی ٢٠ ساڵ سەرقاڵیم بە کاری نووسین و رۆژنامەوانیم کە زۆرینەی دیدار و نووسینەکانم تایبەت بوون بەبواری پەروەردە و فێرکردن کە کەم تازۆر توانیومە خزمەت و ئاورێک لە بوارە هەر گرنگ و هەستیارەکە ( پەروەردەو فێر کردن ) بدەمەوە , بەڵام ئەو هەوڵاو هەنگاوانە تینوێتی منیان نەشکاند, بۆیە لە هەوڵی دۆزینەوەی کەناڵێکی باشتر بە چۆنیەتی خزمەت گەیاندن بە کایە گرنگەکەی ژیان ,پەروەردە فێرکردن هیچ نەبێت لە دەڤەری گەرمیاندا بریتی بووە لە دەرکردنی گۆڤارێکی تایبەت بە پەروەردەو رۆشنبیری پەروەردەیی , ئەم هەنگاوەشم هەوڵێکی بچکۆلانەیە بەئاراستەی خزمەتگەیاندن بەکایەی پەروەردە و ئاوڕدانەوەیەکیشە لە واقع وهەلومەرجی خراپی پەروەردە وفێرکردن لەهەرێمیکوردستان و گەرمیان بەتایبەتی , چەند سەرکەوتوو دەبم ,و تەمەنی ئەم پرۆژەیەش چەند درێژ دەبێت نازانم , بەڵام هەر ئەوەندە تێگەیشتتووم لەئێستادا کە ئیدارەی گەرمیان بۆخۆی پارێزگایەکی ڕانەگەیەنراوە , بۆیە حەقوایە لەزۆر لایەنەوە گرنگیەکی زیاتری پێبدرێت بەتایبەت لەبواری پرۆژەی رۆشنبیری و رۆشنبیری پەروەردەی بەتایبەت ,هەروەها بوونی دەمەزراوەیەکی گرنگی وەک زانکۆی گەرمیان, و دەیان دامەزراوەی گرنگتر لە گەرمیاندا بەگشتی پاڵنەرێکی تری بەهێزن بۆدەرکردنی گۆڤارێکی پەروەردەیی لەم دەڤەرەدا , لەلایەکی ترەوە بوونی دەیان رۆشنیر و رۆژنامەنوس و مامۆستای ئەکادیمی و شارەزای بواری پەروەردە لەگەرمیان هاوکار و پشتیوانیەکی گەورەدەبن لە سەرخستن و دەرکردنی گۆڤارێکی رۆشنبیری پەروەردەیی, بەناوی ( روانیین ) . دیارە

یەکێک لە هۆکارە سەرەکی و هەرە گرنگەکانی پێشکەوتنی وولاتان پەیوەندی ئاستی بەرزی پەروەدەو فێرکردن و چۆنیەتی گەشەپێدانی سیستەمی پەروەردەو فێرکردنەوە ,پەیوەندەی بە فەلسەفەو دونیابینی وولاتانەوە بۆ کایەی پەروەردەو فێرکردنەوە هەیە، ئاشکراشە لای مامۆستایان و شارەزایانی بواری پەروەردە کە دوای ئەنجامدانی کۆنگرەیەکی پەروەردەیی و ژمارەیەک گۆرانکاری لە بواری پەوردەدا, وەزعی پەروەردە لە هەرێمی کوردستاندا , هێشتا پێویستی بەکار و چاکسازیەکی باش هەیە, لەکۆتاییدا هیوادارم بەهاوکاری دامەزراوە گرنگەکانی بواری پەروەردە لەگەرمیان و بەسوود وەرگرتن لە ئەزموونی و شارەزایی مامۆستایانی ئەکادیمی و رۆشنبیری بواری پەروەدە لەگەرمیان گۆڤاری روانیین تەمەن درێژ بێت و بتوانیین پێکەوە بیکەینە مینبەرێک بۆ گەشەپێدانی بواری پەروەردەی لەکوردستان و گەرمیان بەتایبەتی .

روانینی نوێ ژمارە (١)ی لە تشرینی دووەمی ساڵی(٢٠١٤) دەرچوە و ژمارە (٢)ی لەحوزەیرانی (٢٠١٥)دەرچوە..لە ئێستادا ئەم گۆڤارە بەهۆی قەیرانی داراییەوە دەرناچێت .



# سەرژمێری دانیشتوان لە باشووری کوردستاندا

## (قەزای کەلار بە نموونە )

ڕزگار حاجی حەمید

مرۆڤ لەدێر زەمانەوەو لە هەموو قۆناغەکانی ژیانیدا گرنگی بە مەسەلەی سەرژمێری داوە,(کلارک) وا پێناسەی سەرژمێری دەکا: سەرژمێری ڕیزە پرۆسەیەکی تایبەت بە دەست نیشانکردن و کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی زانیاری دیمۆگرافییە لەمەڕ کۆی دانیشتوانی ناوچەیەکی دیاریکراو لە کاتێکی دیاریکراودا, جاران مەبەستی سەرەکی بریتی بوو لە زانینی ژمارەی ئەوانەی بە کەڵکی سەربازی دێن, یان باج و سەرانەیان لێدەسەنرێت, بەڵام لەگەڵ پەرەسەندنی ئەو ڕێوشوێنە میکانیکیانەی بەکەڵکی پۆلێن و ڕێکخستنی زانیارییەکان دێن, ئامانج و مەبەستەکانی پەرەیسەند, سەرژمێری هەموو ئەو زانیارییە سەرەکیانە وەدەستدێنێ, بۆ هەموو حکومەتێک بەسوودن وەک خزمەتگوزارییەکانی فێرکردن و تەندرووستی, بێ ئەمە هیچ پرۆژەیەکی ئابووری بەپێی زانینی ژمارە و چۆنێتی دابەشبوون و ڕواڵەتە دیمۆگرافییەکانی دانیشتوان ئەنجام نادرێ, دەوڵەتی تازە دروستبووی عێراق, لەساڵی(١٩٢٦)دا بۆ یەکەمین جار بەڕێوەبەرایەتی گشتی سەرژمێری دامەزراند, لەوساتەوە چەند جارێک سەرژمێری گشتی کراوە, دوای ساڵێک (١٩٢٧) سەرژمێری ئەنجامدرا, بەڵام سەری نەگرت, پاشان

له ساڵی (١٩٣٤) سەرژمێرییەکی دیکە ئەنجامدرا, ئەویش بەمەبەستی جێبەجێکردنی یاسای سەربازگرتنی ئیلزامی کرا, هەرچەندە هەموو هاوڵاتیانی گرتەوە هی ئەوە نییە بەسەرژمێری لە قەڵەم بدرێت, دواتریش لە تشرینی( ١٩٤٧)دا ئەنجامدرا, زانیارییەکانی لە (٣) بەرگدا و بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی کۆکرانەوە و کرانە حەوت بەش, زانیارییەکانی بریتیبوون لە چۆنێتی دابەشبوونی دانیشتوان و پێکهاتەی تەمەن و ڕەگەز و نەتەوەو باری کۆمەڵایەتی و ئاستی ڕۆشنبیری و ئاستی تەندرووستی و پیشە و ئایین لەسەر ئاستی پارێزگا و قەزا و ناحیە و گوند, ئەمیش زۆر پوخت نەبوو چونکە بەشێکی زۆری دانیشتوان لەبەر ترس لەسەربازی و باجدان, زانیاری درووستیان نەدا, ناوچە شاخاوییەکان و سنوورییەکان و ئەهوارنشینەکان کەس نەگەیشتە لایان و سەرژمێری نەکران, دواتریش بە پێی خاڵی پێنجەمی یاسای ژمارە( ٥٩)ی ساڵی( ١٩٥٥)ی سەرژمێر تیاییدا دەبێت هەر دەساڵ جارێک سەرژمێری بکرێت, هەربۆیە دوابەدوای ئەم بڕیارەو لەساڵی( ١٩٥٧) دا پرۆسەکە جێبەجێکرا, بەڕەچاوکردنی ڕەوشی ئەوکاتە بە پرۆسەیەکی سەرکەوتوو دەژمێرێت و زانیارییەکان ورد و گشتگیربوون, پاشان دەبوایە لەساڵی( ١٩٦٧ )دا پرۆسەکە بکرایە, بەڵام لەبەر هۆکاری ڕامیاری و کودەتای خوێناوی, بەتایبەت شۆڕشی کوردستان و هێزی پێشمەرگە کە نەدەتوانرا ژمارەیان دیاری بکرێت, هەربۆیە دوو ساڵ پێشخرا و لە ساڵی( ١٩٦٥)دا پراکتیزەکرا, لێرەوە دەردەکەوێت گشت سەرژمێرییەکان جگە لە ساڵی( ١٩٥٧) لە دۆخێکی پڕ لەئاڵۆزی سیاسیدا کراون, کە بووەتەهۆی تۆمارنەکردنی نەک هەزاران خەڵک, بەڵکو دەیان ئاوەدانیش, هەر بۆیە هەمیشە بەچاوی گومانەوە سەیری سەرژمێرییەکان دەکرا, ئەمیش هۆکارێک بوو بۆ ئەوەی خۆیان بدزنەوە, دانیشتوان لایان وابوو ئەم پرۆسە تەنها بۆ سەندنی باج گرتنی سەربازییە, ئەم تێڕوانینە تاکۆتایی شەستەکان ئامادەیی هەبوو, گەر شیکاری بۆ ئامارەکان بکەین تادێ ڕێژەی کۆی نەتەوەکان جگە لەنەتەوەی عەرەب و سەرجەم ئاینەکان جگە لەئاینی ئیسلام بەپێی سەرژمێرییەکان ڕوو لە دابەزینە, ئەمەش هۆکارەکەی ڕوونە, گەر نەتەوەی کورد وەربگرین کەنەتەوەی دووەمە لە عێراقدا کەمی کردووە تەنانەت لە باشووری کوردستانیشدا, بەپێی سەرژمێری ساڵی(١٩٤٧) نەتەوەی کورد لە(٢٨٪) کۆی دانیشتوانی عێراق پێکدێنێت, وەئەم ڕێژەیە لەساڵی(١٩٨٧) دادادەبەزێ بۆ(٢٥,١٪)ئەمەش جیا لەکۆمەڵێک هۆکار سەرکیترینیان بەحوکمی ڕەگەزپەرستی هەمیشە ڕاستییەکان شێوێنراوە, بەنموونە قەزای کەلار بهێنینەوە بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٧٧) پێکهاتەی نەتەوەیی ژمارەی کورد بریتییە لە(١٨٦١٣) بەڕێژەی( ٧٤,٩٨٪)کۆی دانیشتوانی قەزاکە پێکدێنێت و عەرەبیش(٦٠٠٨) بەڕێژەی (٢٤,٢٪) لەکۆی دانیشتوانی قەزاکە, لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت ئەم ئامارە چەند نادرووستە, ئەگەر نا هیچ کاتێک عەرەب لەم شارەدا بەو شێوەیە نیشتەجێنەبوون, کەلاریش وەکو قەزا بۆ یەکەمین

جار لە ساڵی( ١٩٧٧) دا لە سەرژمێری گشتیدا تۆمارکرا, کە تیایدا هاتووە ژمارەی دانیشتوانی قەزا دەکاتە( ٤٤٠٥٧) کەس و چڕی گشتی دانیشتوانەکەی ( ٢١) کەس/ کچگ, ژمارەی دانیشتوانی سەنتەر ( ٢٤٨٢٤ ) کەس و ناحیەی پێباز گەیشتە( ١١٧٤٣) کەس و ناحیەی تیلەکۆ ( ٧٤٩٠) کەس بووە, هەروەها بەپێی سەرژمێری ساڵی( ١٩٨٧)دا دانیشتوانی قەزاکە ژمارەیان( ٨٩١١٣)کەس بووە, ژمارەی دانیشتوانی ناوەند(٨٢٠٠٤) کەس بووەو شارنشین(٦٣١٠٢)کەس و گوندنشین دەکاتە(١٨٩٠٢)کەس و پێبازیش(٧١٠٩)کەس بووە, بەپێی ئامارەکان لەنێوان ئەو دەساڵەدا گەشەکردنێکی بەرچاوی بەخۆییەوە بینیووە, بەرزترین ڕێژەی زیادبوونی دانیشتوانی زیادبوونی لەئاستی کۆی شارەکانی باشووری کوردستاندا تۆمارکردووە, ڕێژەی زیادبوونی کە گەیشتووەتە(٢١,١٣٪) لە نێوان هەردوو سەرژمێری(١٩٧٧-١٩٨٧)دا, هەروەها لە ڕووی ژمارەی دانیشتوانەوە لەڕیزبەندی شەشەم بووە دوای شارەکانی(هەولێر, کەرکوک, سلێمانی, دهۆک, تەلعەفەر)دێت, لەسەر ئاستی پارێزگای سلێمانی لە ڕیزبەندی یەکەم دێ دوای ناوەندی پارێزگا, چڕی دانیشتوان لەناوەندی یەکە ئیداریەکاندا بەرزە, بەتایبەتی ناوەندی قەزاکان ناوەندی قەزای کەلار بە نموونە وەربگرین دەکاتە (٢٤٧) کەس/ کچگ, دوای ڕووخاندنی کۆی گوندەکانی باشووری کوردستان و تەنانەت هەندێ شارۆچکە و نزیکەی( ٤٣)شارەدێ لە باشووری کوردستاندا لە ڕووی کارگێڕییەوە هەڵوەشێنرانەوە کە زۆربەی هەرە زۆریان تەنها بە دوو مەرسوومی کۆماری ژمارە( ٣٢١ و ٩١١) لە ڕێکەوتی ١١ \٦\١٩٨٧ و ١٦\١١\١٩٨٧ کە هەردوو ناحیەی پێباز و تیلەکۆش لە چوارچێوەی ئەو مێژووە دابوون, ناحیەی پێباز بەپێی مەرسومی کۆماری ژمارە( ٣٢١) لە( ١١\٦\١٩٨٧)دا و ناحیەی تیلەکۆش بەپێی مەرسومی کۆماری ژمارە( ٩١١)لە ڕێکەوتی( ١٦\١١\١٩٨٧)دا ئەمەش وەک گوندەکانیتر تەختی زەوی کرا, لەڕووی کارگێڕییەوە هەڵوەشێنرانەوە لەبەرئەوەی هیچ گوندێک لەسنووری کارگێڕیاندا نەماو هەمووی ڕووخێنران, دواتر پێباز دوای هەڵوەشاندنەوەی کارگێڕی ناحیەکە لکێنرایە سەنتەری قەزای کەلارەوە, هەربۆیە دوابەدوای هەڵوەشانەوەی هەردوو ناحیەکەی ڕووبەری ناوەندی قەزا زیادی کرد لە (٢١١١) کم٢ گۆڕا (٣٣٣٢)کم٢, ئەمە دوایین سەرژمێری بوو لە باشووری کوردستاندا, نزیکەی(٣٤)ساڵە سەرژمێری گشتی ئەنجام نەدراوە, لەدوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە کە ئەمیش حەڤدە ساڵی خایاند دیسانەوە چەندین ساڵە لێرە و لەوێ دەووترێ و جەخت لە ئەنجامدانی دەکرێتەوە, کەچی پاساو و بیانوو دێننەوە, کە پەیوەندی بە ڕەوشی سیاسی و نائارامی وڵاتەوە هەیە, ئەمەش ئەگەرچی بەشێکی ڕاستە تێکڕا ئاگاداری ڕەوشی ناسەقامگیری عێراقین, لەکاتێکا لەسەر ئەوە کۆکین بەبێ سەرژمێری ناتوانرێت هیچ پلانێک بۆ ئایندەی دەوڵەت دابنرێت, ئەمیش بۆ حیزب و ڕێکخراو و تەنانەت خێزانیش درووستە, بەدڵنیاییەوە بەبێ داتا و زانیاری و ئامار هەر نەخشەیەک دابنرێت ئامانج ناپێکێ و پڕ دەبێت

له کەموکوڕی, چونکە زانیاری و داتاکان لە سەرژمێریدا دەخرێتە خزمەت نەخشەدانانەوە, لەهەموو ڕوویەکەوە( ئابووری, سەربازی, کۆمەڵایەتی, پێکهاتەی نەتەوە و تەمەن و ڕەگەز و ئایین و ئاستی خوێندن ...هتد) هەموو ئەوانە دیاری دەکات, لەئێستادا بودجە و پرۆژەکانی خزمەتگوزاری و پشکی دەرمان و پشکی سووتەمەنی و دامەزراندن و دیاریکردنی نوێنەری هەڵبژاردنەکان بەپێی سەرژمێری ئەو شارە دەکرێت وێڕای ئەوانەی باسکران ئێستا کۆی ئامارەکان لەسەر کۆبونی خۆراکە, کە چەندین خێزان لێرە دەژین فۆرمی خۆراکیان گواستۆتەوە, دواین زانیاریم لەسەر دانیشتوانی قەزای کەلار لە بەڕێوەبەرایەتی ئاماری گەرمیان وەرگرت, وێڕای سەرنجی زۆرم لەسەر ژمارەکان بەم شێوەیە: کە ئاماری پێشبینی کراوە بۆ کۆتایی (٢٠١٩) دەکاتە( ٢٢٩٦٤٤) کەس, تەنها ئەوانە دەگرێتەوە کەفۆرمی خۆراکیان لەسەر قەزای کەلارە, وا بڕیارە ئەمساڵ سەرژمێری گشتی ئەنجام بدرێت, ئەو دەمە دەتوانرێ تەندرووست شرۆڤە و شیکاری بۆ ئامارەکان بکرێت.

سەرچاوەکان:-


١-گۆڤاری سیاسەتی دەولی, د .خەلیل ئیسماعیل , ژ٣, تشرینی یەکەم ,١٩٩٣

٢-د.عەبدوڵڵا غەفور, ئەتنۆدیمۆگرافیای باشووری کوردستان , چاپی یەکەم , ٢٠٠٦

٣- وزاره الحکم المحلی دلیل الاداری للجمهوریه العراقیه ,الجزو الاول (١٩٨٩-١٩٩٠

٤- الجمهوریه العراقیه ، وزاره التخگیگ الجهاز المرکزی للاحصاو ، نتائج التعداد العام للسکان ، لسنه ١٩٧٧ ، محافقه السلیمانیه

٥- الجمهوریه العراقیه ، وزاره التخگیگ ،الجهاز المرکزی للاحصاو ، نتائج التعداد العام للسکان لسنه ١٩٨٧، محافقه السلیمانیه ١٩٨٨



# ڕێکخراوی ژینگەپارێزیی گەرمیان

**برایم زەریف**

ژینگەپارێزی لە ئەمڕۆدا بووەتە بابەتێکی جیهانی و مرۆڤ کارێکی کردووە کەوا باری  ژینگە تێک بچێت و ببێتە کێشەیەکی جیهانی و وڵاتان لەسەر ئاستی باڵا ئەم کێشە بە هەند وەربگرن و تەنانەت نەتەوە یەکگرتووەکانیش ساڵانە لەم بارەیەوە چەندین کۆنفرانسی گەورە و فراوان دەبەستێت و لەم بارەیەوە هۆشیاری دەدات، بۆیە ئێمەش وەک ناوچەی کەلار و دەوروبەری بەدەر نین لەم کێشەیە بە تایبەتی دوای فراوانبوونی شار و هاتنی ئەو هەموو ئۆتۆمبللە زۆرە و تەکنەلۆجیای نوێ بۆ شارەکەمان کە هەرهەمووی لە ئایندەدا زەنگی مەترسیدارن بۆ شارەکەمان بۆیە بە پێویستمان زانی لە گەرمیاندا ڕێکخراوێ:ی ژینگە پارێز دابمەزرێنین و مۆڵەتی فەرمی ژمارە (٤٩١)ی مانگی ٦ی ٢٠١٣ ستافی کارگێریی بە هەڵب١اردن بووە و تا ئێستا ژمارەی ئەندامانی گەیشتوونەتە ٩٩ کەس، کە پێکهاتوون لە کەسانی خاون بڕوانامەی دکتۆرا و مارستەر. سنووری چالاکییەکانمان تەنیا سنووری ئیدارەی گەرمیانە و سەر بە هیچ حیزبوو و لایەنێک نین و خۆبەخشانە کاردەکین بۆ پاراستنی ژینگە . تا ئێستا سەدان کار و چالاکی ژینگەییمان کردووە لە سنووری گرمیاندا، وەک هاوکاری

و پشتیوانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە کاتی کارەساتە سروشتییەکاندا، کۆکردنەوەی کۆمەک بۆ کوردانی ڕۆژئاوای کوردستان لەسەر داوا و پشتیوانیی بەڕێز سەرپەرشتیاری ئیدارەی گەرمیان خاوەنی گەورەترین کەمپینە بۆ چشتگیریی لە هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە شەڕەکانی دژ بە تیرۆرستانی داعش. بە هاوکاری سەرپەرشتیاری ئیدارەی گەرمیان و دەوڵەمەندە دڵسۆزەکان و خەڵکی خۆبەخش لە ماوەی ساڵانی وشکەساڵی خاوەنی پرۆسەی گەورەی پاککردنەوەی هەموو کارێز و کانیاوەکانی گەرمیان و لە شاری کەلار، وە خاوەنی خێراترین تیمی فریاکەوتنی خۆبەخشە لە شاری کەلار، بۆ کاتی لافاو یان هەر حاڵەتێکی نەخوازراو، زیاد لە ٢١ هەزار دار و درەختی هەمەجۆری لە شار و شارۆچەکانی هەرێمی کوردستاندا بە سەدان سوپاس و پێزانینی ناوەندەکانی خوێ،دن و گروپ و تاقمی کۆمەڵایەتی پێدراوە.



